د. ئەلبێرت عیسا

# خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی

## لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی لەسەر بەعسی عێراقی

2004

د. ئەلبێرت عیسا

# خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی

## لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی لەسەر بەعسی عێراقی

٢٠٠٤

## پێشکەشە
## بەمیللەتی کوردو هەموو مرۆڤێکی دیموکرات

ناوی کتێب: خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی

نووسەر: د. ئەلبێرت عیسا

نەخشەسازیو بەرگ: هونەر وەهبی

تایپ: ئەمیرە، سازان، نەهرۆ، نیاز، شاناز

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپخانە: چاپخانەی روون

ژمارەی سپاردنی (٧٠٧)ی ساڵی ٢٠٠٤ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پەیڤێک

کاتێك کە لە کۆتایی ساڵی حەفتا لەکۆلێژی زانستە رامیاریەکانی زانکۆی تۆرینـۆ لەئیتالیا خوێندکار بووم، چـەند رانەیـەك لەسـەر نەسیۆنالیزم و فاشـیزمی ئیتـالی دەوترایـەوە. لـەو سـاتانەدا بنچینـە فەلسـەفیەکانو رەفتـاری سیاسـی بەعسـم بـیر دەکەوتەوە، بە تایبەتی لە بواری گەڕانەوە بۆ رابردو وشانازی بێ هاوتـا بـە نەتـەوەو پەرستنی سەرۆك و بە دەزگایی کردنی تونتو تیژی. ساڵانی پاش دەرچونم لە زانکۆ، ئەم کێشـەیەم پشـت گـوێ نەخسـتو دوایـیـش لـەکۆلێژی زانسـتی سیاسـی لـە ستراسبورگ(فەرەنسا) بابەتی لەیەکچونم لەنێوان بەعسو فاشیزمی مێژویی بۆ تـێزی دکتۆراکەم هەڵبژارد.

ئەم لێکۆڵینەوەیە، کە بریتیە لەفراوان کردنو نوێ کرنـەوەی بابـەتی دکتۆراکـەم، هەوڵێکـە بـۆ تێگەیشـتنی دیـاردەی بەعسـی لەرێگـەی شـیکردنەوەی ئـەدەبیاتی فەلسەفیو سیاسی فاشیزمی مێژوییەوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە تەقەللایەکی نوێ یـە بـۆ دۆزینەوەی تەریبیو لەیەکچون. هیچ ترسێکی ئـەکادیمیو پیشـەییو ئـەخلاقیم نییـە ئەگەر پێ لەسەرئەوە داگرم کەفەزڵی ئەم لێکۆڵینـەوە بەراوردکاریـە دەگەڕێتـەوە بـۆ نوسەر کە بۆ یەکەم جارو بەشێوەیەکی سیستێماتیك توانیویەتی ئەم تەریبیە لـەنێوان بەعسو فاشـیزمی مێژویـی نەسیۆنالیسـت بدۆزێتـەوە. بـەم بۆنەیـەوە دەتـوانم بڵێـم کەئەوەندەی بزانم هەتا ئەمڕۆ هەوڵێکی سیستێماتیك لەم بوارەدا نەدراوە چ لەجیهانی کوردو خۆرهەلاتیدا، چ لەجیهانی خۆرئاواییدا. ئومێدەوارم لێکۆڵەرو توێژەران کێشەی ترسناکترین دیاردە پشت گوێ نەخەن و هێشتا زۆر درەگ نییـە بـۆ ئـەم تێگەیشـتنە.

وابزانم ئەركێكی سیاسیو ئەكادیمیو ئەخلاقییە كە بەتایبەتی سیاسەتمەدارو رۆشنبیرو توێژەری كورد خۆیان سەر قاڵ بكەن بۆ خوێندنەوەی دیاردەی بەعسی كەسامناكترین دیاردەیە لەسەرجەم مێژوی مرۆڤایەتیدا. كاتێك فاشیزمی ئیتاڵیو ناسیۆنالسیزم هاتنە سەر حوكم، هەر لەسالآنی یەكەمەوە رۆشنبیرو توێژەری ئەوروپیو ئەمریكی زانستیانە كەوتنە دراسەت كردنیانو پەردەیان هەڵماڵی لەسەر مەرامیان لەسەر بنچینەی شیكردنەوەی ئەو ماكە فەلسەفیو سیاسیانەی كەسیستێمەكەیان راگرتووە. لەبەر رۆشنایی ئەم شیكردنەوە زانستیانە، میللەتەكانیان هەڵسان بەهێرش بردنەسەر رژێمەكانیانو بەرگری كردن دژی خۆ سەپاندنی تۆتالیتاری.

**د. ئەلبێرت عیسا**

# پێشەکی

لەوە دەچێت کەئەو توێژینەوەو لێکۆڵینەوانەی کەتائێستا بە جێهێنراون لەسەر ئایدیۆلۆژیای بەعس، نەیانتوانیبێ وەڵامی پرسیارێکی ئاسان بەڵام بنچینەیی بدەنەوە: سروشتی ئایدۆلۆژیای بەعس لەچی پێکهاتوە؟ مێژونوسو سیاسەتمەدارو کۆمەڵناسو رۆژنامەنوسو پسپۆڕانی فەلسەفەی سیاسی، زۆریان لەسەر ئایدیۆلۆژیای بەعس نوسیوە، بەڵام بەداخەوە بەشێوەیەکی زۆر دروستکراوو روکەش ئەم دیاردەیەیان شیکردۆتەوە، چونکە بەزۆری هەوڵیان داوە بیخەنە ناو چوارچێوەی گوزارشتێکی ساکار لەعەقیدەی ناسیۆنالیزمی دژ بە "ئیمپریالیزم". لەجیاتی ئەوەی لێکۆڵینەوەکانیان ملکەچ پێ بکەن بۆ مێتۆدێکی شیکاریانە کەتوانای دۆزینەوەی پەیوەندیەکانی لەنێوان ماکە ئایدیۆلۆژیەکان هەبێت، هەڵساون بەپێشکەشکردنی ئەم ئایدیۆلۆژیایە وەك بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی ئاسایی کە لەبارودۆخێکی دژوارسەرچاوە دەگرێ و بەشوێن ناسنامەیەکی (هوية) ناسیۆنال دەگەڕێو لەبەر ئەوە بەیاغی سەربەستیو ئازادی دژ بە ئیمپێریالیزمی بەرزکردۆتەوە. لەبەر ئەم هۆیە، بەعس وەك ئایدیۆلۆژیاو وەك فۆرمی حوکم، بەشێوەیەکی چەوتو نازانستیانە شیکراوەتەوە. دەتوانرێ، زۆرجار، پرسیارێکی رەوا بکرێ سەبارەت بەوەی کەچۆن تائێستا رۆشنبیران و سیاسەتمەداران (بەتایبەتی کورد ئەمجا عەرەب) نەیانتوانیوە پەردە لەڕوی دیاردەیەکی وائاشکراو لەهەمان کاتدا ترسناك هەڵماڵن. چۆن سەرسوڕهێنەر نەبێ کەزیاتر لەچارەکە سەدەیەکە ئەنجامدانی سێ جەنگو هەڵمەتی لەناوبردنی میللەتی کوردو کوشتنو بڕینی هاووڵاتیانی عیراقی، سەرنجی ئەوانی رانەکێشا بکەونە هەڵسەنگاندنی سروشتی ئەو ئیلێمێنتە فەلسەفیانەی کەجوڵێنەری رەفتاری سیاسی رژێمی عیراقی بوون.

چونکە، بۆ ئەوەی بتوانرێ پەردە لەڕوی هەڵسوکەوتی سیاسی رژێمێك هەڵماڵرێ، پێویستە بەشێوەیەکی ئیمپێرەتیڤو پێش هەموو شتێك تێگەیشتن هەبێ سەبارەت بەجەوهەرو سروشتی ئەو ماکە پێکهێنەرانەی کەسیستەمی بیرو باوەڕ رادەگرن. مۆنتسکیۆ (١٦٨٩-١٧٥٥) یەکەم نوسەر بوو کەپاش ئیفلاتونو ئەرسیتۆتالیس، توانی حکومەت لەسەر بناغەی سروشتو پرنسیپ جیابکاتەوە.

مۆنتسکیۆ دەڵێ کەیاسا لەسەر سروشتو پرینسیپی حکومەت دەوەستێتەوە. بەڵام بۆ ئەوەی لەسروشتو پرینسیپی حکومەت تێبگەین، پێویستە بزانین مەبەست لەیاسا چی یە؟ بەلای مۆنتسکیۆوە، یاسا ئەو پەیوەندیانە دەگرێتەوە کەدەوەستنەوە سەر سروشتی شتەکان. بەم واتایە، هەموو بونێك یاسای خۆی هەیە: جیهانی مادی، مرۆڤ، ئاژەڵو زیرەکی مەزن یاسای خۆیان هەیە [١].

بەبەردەوامی، مرۆڤ روو لەیاسا هەڵدەماڵێو ئەو یاسایانەی کەخۆی داینـاون لەپێناوی رێکخستنی خۆی دەیانگۆڕێ. مۆنتسکیۆ دوو جۆر لەیاسا جیادەکاتەوە: یاسای سروشتیو یاسای پۆزەتیڤ. یاسای سروشتی لەئەنجامی زنجیرەیەك لەهۆکار دێتەکایەوە کەپەیوەندی بە پێویستی بەئاشتیو ئارامیو خۆراكو بەکۆمەڵایەتی بون هەیە. یاسای پۆزەتیڤ بریتییە لەوەی کاتێك مرۆڤ لەگەڵ هاوجۆری خۆی بۆ پێکهێنانی کۆمەڵ یەك دەگرێ، پێویستی بەبونی دەسەڵات، واتا حکومەت دەبێ. لەم دۆخەدا، ئەندامانی کۆمەڵ پێویستیان بەیاسای پۆزەتیڤ هەیە بۆ ئەوەی پەیوەندی حوکمکارو حوکمکراو رێکبخات. ئەم پەیوەندیە پێی دەوترێ مافی سیاسی. لەخوێندنەوەی مۆنتسکیۆ بۆ ئیفلاتونو ئەریستۆتالیس، دەردەکەوێ کە بەڕای فەیلەسوفی فەرەنسی حوکم نابێ بخرێتە ژێر دەسەڵاتی تاکێك. بەبۆچونی مۆنتسکۆ، بیرکردنەوە لەدانی حوکم بەتاکێك وەك باوك بۆکۆمەڵ شتێکی هەڵەیە. بەم بۆنەیەوە دەڵێ هەندێك وادەزانن کە لەکاتی دروستبونی حکومەتدا، سروشت وای کردوە کە دەبێ دەسەڵات بخرێتە ژێر دەستی تاکێك، چونکە دەسەڵاتی باوك گونجاوترە لەدەسەڵاتی زۆرینە. بەڵام نمونەی دەسەڵاتی باوکایەتی هیچ شتێك ناهێنێتە دی چونکە ئەگەر باوك

بمرێ، براکانی دەسەڵات دەگرنە دەستو ئەگەر ئەوانیش نەمان کوڕی مامەکان ئەوکارەدەکەن. بەم شێوەیە، دەسەڵاتی سیاسی دەچێتە ژێر دەستی خێزانێکەوەو ئەمەش لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا گونجاو نییە. بەڵام ئەو حکومەتەی کەگونجاوترە لەگەڵ سروشت، بریتییە لەحکومەتی میللەت کە یاساکانی لەمیللەتەوە سەرچاوە دەگرن. لێرەوە، مۆنتسکیۆ دەست دەکات بەشیکردنەوەی سروشتو پرنسیپی حکومەت چونکە کاتێك باس لەیاساکان دەکرێ دەبێ بزانرێ کە ئەم یاسایانە پەیوەندیان بەسروشتو پرنسیپی حکومەتەوە هەیە [٢].

بەم بۆنەیەوە، مۆنتسکیۆ سێ جۆر لەحکومەت جیادەکاتەوە:١- حکومەتی دیموکراتی٢- حکومەتی پادشایەتی ٣- حکومەتی ستەمکار. حکومەتی دیموکراتی ئەو حکومەتەیە کەمیللەت یان بەشێك لێی خاوەنی سەروەری مەزنە. حکومەتی پادشایەتی ئەو حکومەتەیە کەتاکە کەسێك دەیبا بەڕێوە بەڵام بەگوێرەی یاسای جێگیرو نوسراو. لەحکومەتی ستەمکاردا، تاکە کەسێك حوکم دەکات بەبێ ئەوەی خۆی بەیاساو پەیڕەوەوە ببەستێتەوە. ئەم تاکە کەسە بەگوێرەی خواستو ویستو ئارەزوی خۆی رەفتار دەکات.

لەحکومەتی دیموکراتیدا، میللەت وەك پادشای لێدێت چونکە هاوکات حوکم دەکاتو حوکم دەکرێ. بەڵام مۆنستکیۆ ئەوەش تێبینی دەکات کەمیللەت نابێ بەپادشا ئەگەر توانای دەنگدانی نەبێو ویستی خۆی بەدەنگدان دەرنەبڕێ [٣].

میللەت کەسەروەری مەزنی هەیە، دەبێ کارێك نەکات کە بەباشی بۆی ناگەڕێتەوەو دەبێ ئەوانە هەڵبژێرێ کەمتمانەیان پێدەکاتو بەبێ ترس دەسەڵاتی خۆی بەوان ببەخشێ.

لەحکومەتی پادشایەتی. دەسەڵاتە ناوەندیەکان سروشتی ئەم جۆرە لەحوکم پێکدێنن. تاك سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتێکی سیاسیو مەدەنیەو جەوهەری دەسەڵاتە ناوەندیەکان بریتیە لەخانەدانی (النبالة). خەسڵەتی تایبەتی پادشایەتی لەم چوارچێوەیەی خوارەوە بەدی دەکرێ: پادشا بونی نییە بەبێ خانەدانیو ئەمیش ناتوانێ

بونی هەبێ بەبێ پادشا. ئەگەر پادشایەك پشت نەبەستێ بەخانەدانیو ئـەمیش نـەبێ بەپاڵپشتی پادشا، ئەوا دەسەلاتی تاکێك دێتە پێشەوەو سـەردەکەوێ [٤] . لـەم جـۆرە حکومـەتەدا، یاسا رۆڵی خۆی دەبینێو جەستەیەکی سیاسی هەڵدەستێ بەدانانی یاساو راپەڕاندنی.

دەبێ بوترێ کەمۆنتسکیۆ هوشیارە، بەرامبەر ئەوەی کەئەنجومەنی مـیر نابـێ ببـێ بەسەرچاوەی دانانی یاسا چونکە لەسروشتیدا بەو شێوەیە دروست بوە کەویستی کاتی میر رادەپەڕێنێ. پێویستە جەستەیەکی سیاسی هەبێت کـە لەمەسـەلەی یاسـادانانـدا رێزو پسپۆڕی هەبێت. هەر چۆنێك بێت، حکومـەتی میر بەبێ چوارچێوەیـەکی یاسـایی نابرێ بەرێوە [٥] .

لەحکومـەتی ستەمکاردا، یاسا بونی نییەو سروشتەکەی وادەکات کـە ئـەو تاکـەی دەسەلاتی بەدەستەوەیە، هەست بکات خۆی هەموو شتێکەو ئەوانی دیکە هیچ نین.

ئەو جیاوازیانەی کە لەنێوان ئەم سـێ فۆرمـەدا بـەدی دەکرێـن، دەوەسـتنەوە سـەر سروشتو پرینسیپ. مۆنتسکیۆ دەڵێ کەحکومـەت "سروشـتەکەی ئەوەیـە وای لـێ دەکات کە وابێت"و پرنسیپەکەشی "ئەوەیـە کـە وای لـێ دەکـات رەفتـار بکـات". سروشتی حکومـەتێك، بریتیە لە "پێکهاتە تایبەتیەکـەی"و "پرینسیپەکەشـی" ئـەو حاڵەتە عاتفیانەن "کەدەیخەنە جوڵانەوە" [٦] .

پرینسیپی ئەم سێ فۆرمە چـی یـە؟ پرینسـیپی حکومـەتی دیموکراتـی پێکـهاتوە لەهێزی یاساو فەزیلەو [٧] پرنسیپی پادشایەتیش پێکهاتوە لە "شەرەف" کەسـەرجەم لایەنەکانی ژیانی سیاسی دەگرێتەوەو پرنسیپی ستەمکاریش پێکهاتوە لـە "تـرس" .

لەحکومەتی سـتەمکاردا هاوولاتیـان لـەچوارچێوەی کۆیلایـەتیدا یەکسـانو تـاکی ستەمکاریش خۆی بەسەرکەوتو دادەنێ لەچاوشـۆڕکردنی (تحقیر) ژیـانی هاوولاتیـانو هێزەکەی پێکهاتوە لەسەرکوت کردنی خەڵکی. ئەو کەسانەی کەرێزی خۆیـان دەگـرن مـەترسی دەخوڵقێنن بۆ میری ستەمکار. لەبەر ئەوە پێویسـتە کـە "تـرس" غیرەتیـان نەهێڵێو هەستی ئارەزویان (طموح) دامرکێنـێ. لەحکومـەتی سـتەمکاردا، کـاتێك

میری ستەمکار ئاگاداری خۆی نابێ "پەت شل دەکاتەوە"، دەتوانرێ لەناو ببرێ چونکە بەنەمانی ترس میللەت لـێی هەڵدەگەڕێتەوەو لەناوی دەبات.

مۆنتسکیۆ هێما بۆ ئەوە دەکات کـە "نـاتوانین لـەرز نـەمانگرێ کـاتێ بـاس لـەم حکومەتـە ترسـناکە دەکـرێ" . حکومـەتی سـتەمکار، سروشـتەکەی واداوا دەکـات کەملکەچی ڕەها هەبێت بۆ ویستی مـیرو هیـچ هەڵوێسـتی مامنـاوەندیو مناقشـە کردنو ئیحتتاج (احتجاج) بەرامبەر ئەو کەسەی کە تەنها "دەیەوێ" پەسەند نـاکرێ. لەحکومەتی ستەمکاردا، میللەت ملکەچی دەکاتو میر دەیەوێو ئەندامانی کۆمـەڵ وەك ئاژەڵ لەقەوارەی "غەریزەی ملکەچیو سزا وەرگرتن" هەڵسـوکەوت دەکـەن. لـەم جۆرە حکومەتەدا بێ کەڵکە ئەندامی کۆمەڵ بەگوێرەی هەستی سروشتی خۆی ڕەفتار بکات. هیچ ڕێزێك بۆ باوك، ژن ، منـداڵ یـان بـۆ یاسـای شـەرەف یـان بـۆ حاڵـەتی تەندروستی بونی نییە. گرنگ ئەوەیە کە ئەندامانی کۆمەڵ فەرمانیان پێکراوەو هـەر ئەوەندەو هیچیکە نا [٨] . ملکەچی ڕەها داوا دەکات کە ئەوەی ملکەچ دەبـێو ئـەوەی خەڵکی ملکەچ پێ دەکات دەبێ نـەزان بـن. هیـچ بوارێـك نییـە بـۆ مناقشـە کـردن لەپێناوی گەیشتنە بڕیارێك. هیچ بوارێك نییە بۆ گومانکردن، بۆ بیرکردنـەوە. ئـەوەی کە دەبێ ڕەچاو بکرێ بریتییە لە "ویست" (واتا ویستی میر).

لەحکومەتی ستەمکاردا، کاری یاساو دەزگاکانی پەروەردە بریتیە لەوەی ترس بخاتـە دڵـی هاووڵاتیـان چونکـە زانسـتو پێشـبڕکێ خەتـەرناکن بـۆ مانـەوەی حکومـەتی ستەمکار. لەم جۆرە حکومەتەدا ، کاتێك، شتێك دەدرێ بەهاووڵاتی، هەموو شـتەکانی دیکەی لـێ دەسێنرێتەوەو دەسـت دەکـرێ بـەخولقاندنی دەستو پێوەندێکـی خـراپ لەپێناوی دروستکردنی کۆیلەیەکی باش [٩] .

پرینسیپی حکومەتی ستەمکارو زەبرو زەنگ کە بریتییە لە "ترس"، بۆ میللـەتانی شەرمنو نەزانو سـەرکوتکراو دەلـوێ کـە پێویسـتیان بـە یاسـای زۆر نییـە. هـێزی حکومەتی ستەمکار لەدەوڵەتەوە سەرچاوە ناگرێ بەڵکو لەلەشکر سەرچاوە دەگرێ کە

دامەزرێنەریەتیو ئەم حکومەتە ئەگەر بیەوێ بەرگری لەدەوڵەت بکات پێویستی بەهێشتنەوەی لەشکر هەیە کەئامرازێکی گرنگە بۆ هێشتنەوەی میر [١٠].

جگە لەم تێبینیە مەزنانەش، مۆنتسکیۆ جەخت دەخاتە سەر ئەوەی کەپرنسیپی حکومەتی ستەمکار بەبەردەوامی توشی گەندەڵی دەبێت چونکە سروشتەکەی لەبناغەدا بۆگەنەوکاتێك پرنسیپەکەی بۆگەن دەکات، باشترین یاسا سیمای یاسای خراپ وەردەگرێو دژی دەوڵەت هەڵدەگەرێتەوە [١١].

ئەم گەندەڵیە سەرجەم پێکهاتە سایکۆلۆژیو سیاسیەکان دەگرێتەوەو وا دەکات یاسا لەگۆڕانی کۆمەڵایەتیدا هیچ رۆڵێکی نەمێنێ. پەیوەندیەکان دەبن بەپەیوەندی نێوان تاکە کەسەکانو، سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵ یەکسان دەبن نەك بەرامبەر یاسا بەڵکو بەرامبەر میر کەبەگوێرەی خواستو ئارەزوی خۆی رەفتار دەکات.

ئاماژە بەوەی کە تائێستا هێڵمان بەژێردا هێناوە، دەتوانین بڵێین کە لەرێگەی مێتۆدۆلۆژی مۆنتسکیۆوە سەبارەت بەسروشتو پرنسیپی حکومەت، دەتوانین لەئایدۆلۆژیای بەعسو وەفتاری سەدام حوسەین تێبگەین. لەسەر ئەم بناغەیە، دەتوانین ئایدۆلۆژیای بەعس شیبکەینەوەو وردی بکەینەوەو ماکە پێکهێنەرەکانی دیراسەت بکەینو لۆژیك و"ستروکتورە تایبەتیەکەی" تێبگەینو روهەڵماڵین لەو بنچینە مۆرفۆلۆژیو فەلسەفیانەی کە بەعسیان راگرتوە.

لەراستیدا، ئایدۆلۆژیای بەعس ناتوانرێ بخرێتە ریزی ئایدۆلۆژیا سیاسیەکانی دیکە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستو رژێمی بەعس کەبەرهەمی راستەوخۆی ئەم جیهانبینیەیە ناکرێ وەك سیستەمێکی سیاسی ئاسایی تەماشا بکرێ، سەدام حوسەینیش ناکرێ بخرێتە ناو چوارچێوەی ناونانی (تسمیە ) نەریتی (تەقلیدی) وەك دکتاتۆرەوە.

"سروشتی" ئایدیۆلۆژیای حکومەتی بەعس چییە؟ ئایا سەدام حوسەین دەچێتە ناو چوارچێوەی کام جۆر لەدکتاتۆرەوە؟ لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، دکتاتۆرو دەسەڵاتخوازو ئۆتۆکراتو حاکمی رەها هەمیشە بونیان هەبوەو بۆهەزارەهاساڵیش چەند جۆرێ لەحکومەت هەبوە لەژێر ناوی جیاواز جیاوازدا: دیکتاتۆریەت، ئۆتۆکراسیەت، رژێمی

ڕەها، ڕژێمی ستەمکار، پادشایەتی ڕەها..هتد. ئەمانە هەموویان بونیان هەبوەو دەستوپێوەندیان ملکەچ کردوە. پادشاو میری ڕژێمە ئۆتۆکراسیەکانی رابردوو ڕژێمە ستەمکارەکانی ڕۆژهەلات و مێزۆپۆتامیاو میسرو یۆنانی کۆن و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی...هتد. بەناوی یەزدان حوکمیان کردوەو دژی کۆمەڵ ڕەفتاریان کردوە. حوکمی ڕەهای پادشایەتی لەئەورووپای نوێ، دەسەڵاتی کاتی و مادی خۆیان سەپاندوە. ڕژێمە سەربازیەکانی ئەمریکای لاتینی و ڕۆژهەلات و ئەفریقیا بەردەوام بون لەمومارەسەکردنی دەسەڵاتی نێگەتیڤ. ئایا بەعس دەچێتە ناو چوارچێوەی هەمان ئەمانەی باسی لێ دەکەین؟ نەخێر. چونکە بەعس بەرهەمی ئایدۆلۆژیایەکە کەلە "سروشتیدا" دەچێتەوە ناو قەوارەی ئەو فۆرمە تازانەی تۆتالیتاریزم کەپیشەیان فابریکە کردنی مرۆڤ و کاری ڕۆژانەیان بریتییە لەگرمۆڵەکردنی مرۆڤ لەناو تەواوی ئایدۆلۆژیای ڕەسمی [١٢]. بەعس کەسەرکردایەتی دەکرا لەلایەن سەدام حوسەینەوە، هەر لەخۆیەوە نەبوو بەحکومەتێکی تۆتالیتار. هەروەك رایمۆن ئارۆن Raymond Aron هێمای بۆ دەکات، حکومەتێك لەخۆیەوە نابێ بەتۆتالیتار لەژێر تەوژمی هەندێ بارودۆخی تایبەتی. حکومەتێك دەبێ بەتۆتالیتار لەسەر بناغەی "مەبەستێکی ئەسلی و ویستێکی ئایدۆلۆژی بۆ بەدیهێنانی گۆڕانێکی بنەڕەتی بارودۆخی حازر" [١٣]. حکومەتی بەعس لە "سروشت و پرنسیپدا" تۆتالیتارە. حکومەتی بەعس ڕەنگدانەوەی ناخی سیستەمێکە لەبیروباوەڕ کە لەزۆر لایەنەوە لەوەی فاشیزمی مێژوویی دەکات. ئەم لێکچونە وامان لێدەکات بڵێین کەئایدۆلۆژییای بەعس هەوڵدانێکە بۆ نوێکردنەوەی فاشیزمی مێژوویی لەسەر بنچینەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و پەرستنی سەرۆك.

ئەم لێکۆڵینەوەیە بەباسکردنی ژیانی میشێل عەفلەق و مێژووی دامەزراندنی حیزبی بەعس دەست پێدەکات. خوێنەر تێبینی دەکات کەمیشێل عەفلەق لەنێوان ١٩٢٨-١٩٣٢ دیسیپلینی مێژووی لەئەورووپا خوێندەوەو لەساڵی١٩٣٣ گەڕاوەتەوە سوریاو لەگەڵ (صلاح الدين البيطارو زكي الارسوزي) حیزبی بەعسی دامەزراندوەو

رۆڵێکی گەورەی بینیوەو لەبلاوکردنەوەی بیری ناسیۆنالیزمی عەرەبی توندوتیژ. پاشان هەوڵدەدرێ باسی مێژووی حیزبی بەعس و دامەزراندنی لەعیراقدا بکرێ. خوێنەر تێبینی دەکات کە لەژینگەیەکی توندوتیژ ئایدۆلۆژیایەکی توندوتیژ رادەپەرێنرێ. حیزبی بەعس کەدووجار دێتە سەرحوکم دەبێ بەحیزبی جەماوەر بەواتا تۆتالیتارەکەی و بەتایبەتی پاش ساڵی ١٩٧٩ دەبێ بەداردەستێك لەژێر دەستی سەدام حوسەین و ئەمیش لەرێگەی پەیوەندی خزم وکەس وکارو دام و دەزگای نهێنی و توندوتیژ مۆنۆپۆلی دەسەلاتی دەبێ. پاش شیکردنەوەیەکی سیاسی و مێژوویی، هەوڵدەدرێ قەوارەی ئایدیۆلۆژیای بەعس پێناسە بکرێ. لەشیکردنەوەی "سێ کۆچکەی پیرۆز" (الثالوث المقدس)(١٤) هەروەك چۆن لەسالانی حەفتادا رۆشنبیرانی عیراق ئاماژەیان بۆ دەکرد بەمەبەستی پیرۆزاندنی دروشمی بەعسی، وحدة، حرية، اشتراكية، دەردەکەوێ کەگرنگترین ماکی ئەم سێ کۆچکەیە بریتیە لەیەکێتی(الوحدة) چونکە رەنگدانەوەی ناسیۆنالیزمی عەرەبیە. کاتێك کەخواستی خۆی بۆ یەگرتنەوەی نیشتمانی عەرەب تەنها لەژێر دەسەلاتی خۆیدا دەردەبرێ ، ئایدۆلۆژیای بەعسی، ناسیۆنالیزم دەکاتە سومبولی کۆکردنەوەی نەتەوەی عەرەب. پرۆسەی یەکگرتنی ناسیۆنال دەیەوێ سەرجەم ئەندامانی عەرەب و گروپە ئیتنیکی و ئاینیەکان بتوێنێتەوە لەناو هەستی ناسیۆنالیزم کەدادەنرێ بە جولێنەری هێزی خەبات بۆ یەکیەتی. پاش بنیادنانی یەکێتی، بەعس دەیەوێ ئازادی(الحرية) بەدی بێنێ. بەلام ئازادی ناسیۆنال مەرجێکی پێویستە بۆ ئازادی تاك. ئازادی گشت پێش ئازادی بەشەکان دێت، چونکە ئەرکی نەتەوەی عەرەب پێش هەموو شتێك بریتیە لەخەبات دژی کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم کەنەهی دەکەن لەیەکێتی عەرەب و بەرپرسی مێژویین بەرامبەر دابەشبونی نیشتمانی عەرەب. لەبەر ئەوە نەتەوەی عەرەب بۆ ئازادی سەرجەم میللەت و ئاین و توێژە کۆمەلایەتیەکان کە لەناو نیشتمانی عەرەبدا دەژین خەبات دەکات. لەبەرئەمە، بەشەکان ناتوانن و نابێ خۆیان بکەنەوە لەخەبات بۆ ئازادی. بەشەکان بریتین لەچەند "سیتەمێکی لاوەکی"

کەهەموو پێکەوە کۆیەکی سیستەمیی دروست دەکەن بۆ خەبات لەپێناوی رزگار بوون لەداپڵۆسینی(القمع) ئیمپیریالی.

تەواوکەری یەکێتیو ئازادی بریتییە لەپرینسیپی سۆسیالیزم کە پێش هەموو شتێك پێکهاتوە لەهێزێکی رۆحی، واتە کاتێك لەگەڵ ناسیۆنالیزمدا یەك دەگرێ، هێزێکی گەورە دەخولقێنێ بۆ یەکگرتنی کۆمەڵایەتی. سۆسیالیزم بریتییە لەئامرازێك کەهەستی ناسیۆنالیزم پتەودەکاتو دەبێ بەهۆکارێکی بنەڕەتی بۆ ژیانەوەی (بعث) ناسیۆنالیزمی عەرەبی. سۆسیالیزمی بەعسی نەمارکسیەو نەقەوارەیەکی چاکسازی (ریفۆریست) تێدا هەیە، بەڵکو هاوکات ناسیۆنالو شۆڕشگێڕە. سۆسیالیزمی بەعسی سەرمایەداری رەتدەکاتەوە چونکە نوێنەرایەتی ئیمپیریالیزم دەکاتو سۆسیالیزمی خۆرئاوایی پەسەند ناکات چونکە خزمەتی لیبرالیزمو تاکەگەری(individualism)دەکاتو کۆمۆنیزمیش پەسەند ناکات چونکە خزمەتی ئینتەرناسیۆنالیزم دەکات کەنەهی لەبونی کۆمەڵگەی ناسیۆنالو بەش بەشی دەکات.

خوێنەر تێبینی دەکات کەداواکاریەکانی بەعس بۆ بەدیهێنانی یەکێتی ناسیۆنال لەسەر بنچینەی گەڕانەوە بۆ رابوردوو تێکەڵکردنی ناسیۆنالیزم لەگەڵ سۆسیالیزمدا، چوارچێوەی ناسیۆنال سۆسیالیزممان بیر دەخاتەوە. ئەوەش واناسراوە کەدامەزرێنەرانی بەعس، میشێل عەفلەقو زەکی الارسوزیو صلاح الدین البیطار کاریگەری ناسیۆنالیزمی ئەڵمانیو بیری فیختەیان زۆر بەسەرەوەیە. ئەوەش ئاشکرایە کەعەفلەقو البیطار کاتێك لەسەردەمی فاشیزمدا بەپەرۆشەوە نیتچەیان خویندۆتەوە دان بەوەدا دەنێن کە لەسالانی١٩٢٩-١٩٣٤ نیتچە نوێنەرایەتی "یەکێتی رۆحی لەنێوان ئەڵمانیو عەرەبدا دەکرد "[١٥]. بەلام تەنها لەبەرئەوە نیە کەدەمانەوێ ئەو تەریبە بدۆزینەوە لەنێوان بەعسو ناسیۆنال سۆسیالیزمدا. شێوازی ئایدۆلۆژیای بەعس سەبارەت بەکێشەی دەوڵەتو رۆڵی سەرۆك وەك زامنێك بۆیەکێتی ناسیۆنال بەتەواوی لەوەی ناسیۆنال سۆسیالیزم دەکات، هەروەها کاریگەری فاشیزمی ئیتالیش لەسەریان لەوەدا رەنگ دەداتەوە کەئایدیۆلۆژیای بەعس باوەڕبەوە دەکات کەیەکێتی ناوخۆ ( واتا

ێوان ئەندامان ) لەرێگەی دەوڵەتێکی تۆتالیتارەوە بەدی دەهێنرێ. هەروەك ناسیۆنال سۆسیالیزمو فاشیزمی ئیتالیی، بەعس باوەڕبەوە دەکات کەئەم دەوڵەتە دەبێ لەلایەن تەنها حیزبێکەوە بەڕێوەببرێو سەرۆکەکەش دەبێ بەرجەستەی ویستی ناسیۆنال بکات. هەروەها بەعس، فەلسەفەی هەڵسوکەوتی سیاسی لەسەر بناغەی خەباتو ووزەو هێرشو پاڵەوانیەتی بنیاد دەنێ لەناو قەوارەیەکدا کەرێگە بۆ توندوتیژیو زەبروزەنگ خۆش دەکات.

ئالەم فەلسەفەیەوە، لەم جیهانبینەوە حکومەتی بەعس دروست دەبێ کەبەبێ هیچ گومانێك نەك تەنها مۆدێلێکە لەمۆدێلەکانی تۆتالیتاریزم [١٦]، بەڵکو حکومەتی بەربەریە یاخود دەوڵەتە دژ بەکۆمەڵ.[١٧] لەرووی تیۆری سیاسیو فەلسەفیەوە، ئایدۆلۆژیای بەعس زۆر تەریبی هەیە لەگەڵ ناسیۆنال سۆسیالیزمو فاشیزمی ئیتالی، بەڵام لەسەر ئاستی کردەوەو رەفتاری سیاسیشەوە کەمتر دڕندەو توندڕەو نییە. بەبێ ئەوەی بمانەوێ لەبەربەریەتی ناسیۆنال سۆسیالیزم کەم بکەینەوە، ناتوانین بەشێوەیەکی جیاواز تەماشای زەبروزەنگو وەحشیەتی بەعس بکەین. راستە نازییەت زیاتر لەشەش ملیۆن جولەکەی لەناوبرد هەر لەبەرئەوەی جولەکە بوون. بەڵام هەتا پێش جەنگی دوەمی جیهانی بەرنامەی پاکتاوی رەگەزی بە شێوەیەکی واخەست رانەپەڕێنرا. پێویستە خوێنەر بەهەڵە تێنەگات چونکە نامانەوێ نەڵێن کەوەحشیەتی نازیو هەڵسوکەوتی رەگەز پەرستانەی دژی جولەکە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بێ هاوتانیە. بەڵام وەحشیەتی بەعسی عیراقیش، لەهەڵسوکەوتی رەگەزپەرستانەی دژی میللەتی کورد، ئەمیش بێهاوتا بوو لەمێژووی نوێو هاوچەرخی مروڤایەتیدا. بەعسی عیراقیش ١٨٢ هەزار کوردی لەناوبردو هەزارەها کەسی بێ شوێنو رێکردو چەکی کیمیاوی بەکارهێنا بۆئەوەی بەچەند چرکەیەك هەزارەها کورد بکوژێو هاوردەی عەرەبی هێناو جێگیری کردن لەناوچە جیاوازەکانی کوردستانو هەزارەها خێزانی کوردی بۆ ناوچەکانی خواروی عیراقی عەرەبی راگواست و سەدەها ئۆردوگای زۆرە ملێی کردەوە لەپێناوی سڕینەوەو کوشتنی پێکهاتەی سایکۆلۆژی کوردیو هەزارەها شارۆچکەو

لادێی کوردستانی لەسەر نەخشەی جوگرافی سڕیەوەو هەزارەها کوردی لەم لاو لـەولا کوشتو. . . هتد. هەر وەك ناسیۆنال سۆسیالیزم کەبەگوێرەی نەخشەی ئایدۆلۆژی جولەکەی لەناو دەبرد هەر لەبەر ئەوەی جولەکە بوون، هەروەها بەعسیش بەگوێرەی نەخشەی ئایدۆلۆژی کوردی لەناو دەبرد هەر لەبەر ئەوەی کورد بوون. ئامێری زەبروزەنگو وەحشیەت دەبێ بەشتێکی ترسناك کاتێك دەوەستێتەوە سەر بنچینەیەکی ئایدۆلۆژیو فەلسەفەیی، کاتێك ئەم بنچینە ئایدۆلۆژیو فەلسەفیە لەپێشدا دەبێ بەپاڵ پشتێك بۆ ئەم ئامێرە، کاتێك تیۆریو پراکتیك، فەلسەفەو کردەوە، ئایدۆلۆژیاو رەفتار یەك دەگرنەوە. لەبەرئەم هۆیەیە کەدەڵێن :

ناسیۆنال سۆسیالیزم و بەعس دوو دیاردەی بێ هاوتان لەمێژوی مرۆڤایەتیدا. سەرسورهێنەرە کەدوودیاردە لەدوو ناوچەی جوگرافیو دووکولتورو ژینگەی سیاسیو دووسەردەمی جیاواز لەدایك دەبن، بەلاّم لەبەر ئەوەی لەزۆر لایەنەوە ئێلێمێنتە فەلسەفیو ئایدۆلۆژیەکانیان لەیەك دەکەن، هەمان شێوازی سیاسی بەکار دێنن و بەهەمان شێوە رەفتار دەکەن. ئەڵمانیای نازی لەساڵی١٩٣٣ بنیادنرا لەسەر پاشماوەی ئەڵمانیای ڤایمەری دیموکراسی، ئەو ئەڵمانیایەی کەهەرچۆنێك بێت لەساڵی١٩١٩ کۆماری سۆسیال دیموکراتی تێدا جێگیر بوبو، ئەو ئەڵمانیایەی کەئەزمونی دیموکراسی لانامۆ نەبوو سەرمایەداری لەمێژەوە تیایدا سەری هەڵدابو، ئەو ئەڵمانیایەی کەهیتلەر لەناویدا بەمیکانیزمی هەڵبژاردن دەسەلاّتی گرتەدەست. چی بڵێین سەبارەت بەعیراقی بەعسی؟ عیراقی بەعسی لەسەر دەزگاکانی دەوڵەتی توندوتیژ، لەسەر مێژوی سیاسی توندوتیژ، لەسەر بیری سامی شەوکەتو ساطع الحصریء پادشایەکی عەرەب،کەعیراقی نەبوو و لەسەر ناسیۆنالیزمی پان عەرەب تێکەڵ بە عەقلیەتی تیرەگەریو لادێ، ئەمجا لەسەر رەفتاری سەدام حوسەین بنیادنرا. لەگەڵ جیاوازی سەردەمو ناوچەی جوگرافیو کولتورو ژینگەی سیاسی، دەتوانین بڵێن کەئەڵمانیای هیتلەری لەناو عیراقی سەدامدا بەرجەستە دەبێت. بەرجەستە دەبێت لەناو کۆمەڵێك کە لەسەر ئاستی پێکهاتەی سایکۆلۆژیو سایکۆسۆسیۆلۆژی زۆر جیاوازە. بەرجەستە

دەبێت لەناو ئەوکۆمەڵەی کەچەمکی میللەت تیایدا دەبێ بەکیانێك کە لەلایەن تاکێك دژی هەموو بەرگری لێ دەکرێ.

سەدام حوسەین کێیە؟ ئەو کەسەیە کەهەرەشەی تیۆری میشێل عەفلەقی لەپراکتیکدا جێبەجێ کرد. ئەو کەسەیە کەوەك بەرهەمی پوختی فەلسەفەی بەعس، وڵاتی عیراقی گۆڕی بۆ بارودۆخێکی "پێش سیاسەت" (prepolitical). لەچ کولتوورو کۆمەڵگەیەکدا پەیدا بوەوکاری دەکرد؟ لەوەی کەئیبن خەلدون پێی دەڵێ" البادیة" بەرامبەر" الحضارة " بەو واتایەی کەشار دانراوە وەك ناوەندی شارستانیەت، بەڵام شارستانیەت وەك بەرهەمی هاوکاری ئورگانێك (ئیمیل دورکایم Emile Durkheim) ناگونجێ لەگەڵ هاوکاری "البادیة" لەگەڵ "عەسەبیە"ی بەدەوی [١٨] کەتەنها خۆی مافی دانی دەسەڵاتی هەیەو دەتوانێ یەککگرتنی کۆمەڵایەتی مسۆگەر بکات. بەم شێوەیە، شار ملکەچە بۆ دەسەڵاتی"عەسەبیە". بەعس بەهیچ شێوەیەك لەناو شار رەگی دانەکوتیبو و کادرو سەرکردە سیاسیەکانی نامۆ بوون بەکولتوری شار. بەعس بەشێوەی "باند" چوە ناو کۆمەڵگەی مەدەنیەوەو بەوشێوەیەش مایەوە[١٩]. کادێرە سیاسیەکانی بەعس ئەوانە بوون کە لەساڵی١٩٦٣ وە خەڵکیان ئەشکەنجەدەداو خەڵکیان دەکوشت یان مومارەسەی توندوتیژیان دەکردو ئەندام بوون لەجیهازی نهێنیی و موخابەراتی بەعسی. لەو کولتورە هاتبون کەشانازی دەکات بەکوشتن و بڕین، کەبە دز دەڵێ "دواس اللیل"و بەپیاو کوژیش دەڵێ "رجل "[٢٠]، کەبەهاکانی توندوتیژی بەرز دەنرخێنێ و نەزانی و نیفاق و حەسودی و کوشتن و بڕین و دزی بەچاوێکی پۆزەتیف تەماشا دەکات [٢١]. ئەگەر وانەبێت چۆن ئەم رەفتارەی خوارەوە لەنێوان زۆر رەفتاری دیکە پاساو دەکرێ: پیاوێك لەبەندیخانە دەردەکرێ و بەپەت دەست و قاچ و لەشی دەبەستنەوەو دەخرێتە ناو تابوتێکەوەو دواییش بەمشار تابوتەکە دەکرێ بەدوو بەشەوە یاخود بەدەستی رووت سەگێکی زیندو تا ئاستی مردن دەخنکێنرێ [٢٢].

سەرۆك كۆماری عێراقیش خۆی لەچ ژینگەیەكەوە هاتبو؟ لەناو چوارچێوەی عەسەبیەی خەلدونی گەورە نەبوو؟ سەرجەم عەسەبیاتی ناوچەیی لەخۆی كۆنەدەكردەوە؟

سەدام، بەرهەمی پوختی ئایدۆلۆژیای بەعسی، ئەو كەسەبوو كەبەعسی كرد بەداردەستێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەكانی خۆیو ئەندامانی خێزانە گەورەكەی. یاساو فۆرمی سیستەمی عەسەبیەی لەگەڵ دەزگای سیاسی دەوڵەت گونجان و نزم بووەوە بۆسەر ئاستی دۆزینەوەو دروستكردنی "سۆزی" بۆخۆی بەم شێوەیەی خوارەوەش رەفتار لەگەڵ هاولاتیان بكات:

سەرۆك: "میخائیل، دایكت خەڵكی كوێیە"؟

هاولاتی: " خەڵكی كاظمیة". یە

سەرۆك:"لەوانەیە باوكم سەردانی (كاظمیة)ی كردبێو چاوی بەدایكت كەوتبێ. ئەمە شەرحی لێكچونمان دەكات" (٢٣).

هەروەك مۆنتسكیۆ دەڵێ لەشیكردنەوەی سروشتو پرنیسیپی حكومەتی ستەم كار، پیاو مەخلوقێكە كەملكەچی دەكات بۆ مەخلوقێك كەدەیەوێ. بەم شێوەیە هاوولاتی لەناو حكومەتی بەعسیدا، ئەو كەسەبووكەملكەچی دەكرد بۆسەرۆك كەدەیویست، بۆ سەدام حوسەین كە دەیویست. هیچ سنورێكی ئەخلاقیو مادی نەبوو بۆ ویستی سەرۆك چونكە بەرجەستەی "بیری" نەتەوەی عەرەبی دەكرد. خەوی میشێل عەفلەق لەخولقاندنی سەرۆكێك كەبەرجەستەی "بیری" نەتەوەی عەرەبی كرد بۆ ماوەی پتر لەچارەكە سەدەیەك هاتەدی. سەدام حوسەین، هەڵگری "بیری" نەتەوەی عەرەب بوو، میللەتی عیراقی كرد بە "كۆیلەیەكی باش"( ئەگەر بمانەوێ هەمان زاراوەی مۆنتسكیۆ بە كار بێنین) و ویستیشی میللەتی كورد بكات بەخزمەتكاری ئەم كۆیلە باشە لەسەر بنچینەی دارشتنی تیۆری پەیامبەرانی ناسیۆنالیزمی عەرەب.

# پەراوێزەکان

1- Montesquieu, de l'esprit des Lois, GF-Flammarion, Paris, 1979, p. 123.
2- Ibid. ,p.125-129
.3- Ibid. ,p.132
.4- Ibid. ,p.139
.5- Ibid. ,pp. 140-141
Ibid. ,p 143 6-

٧- مۆنتسکیۆ مەبەستی لە"فەزیلە"، فەزیلەی مۆراڵی یان فەزیلەی ئاینی نیە، بەڵکو مەبەست لەفەزیلەی سیاسییە. فەزیلەی سیاسیش، لەروانگەی مۆنتسکیۆوە، ئەو فەزیلەیە نییە کەمەکیەڤێللی باسی لێ دەکات. فەزیلەی سیاسی واتای یەکسانی دەگەیەنێ بۆ وڵات، مرۆڤی سیاسی چاکیش، ئەو مروڤەیە کەخاوەن فەزیلەی سیاسییە، واتا کەیاسای وڵاتەکەی خۆش دەوێ‌و هەڵسوکەوت‌و رەفتاری خۆی لەگەڵ یاسای وڵاتەکەی دەگونجێنێ. بروانە هەمان سەرچاوە، ل١١١ .

.8- Ibid. ,pp. 150-153
.9- Ibid. ,p. 159
.10- Ibid. ,p. 186
.11- Ibid. ,pp. 250-251

١٢- بڕوانە:
.Hannah Arendt, La nature du totalitarisme, Payot, Paris, 1990
13- Raymond Aron, Democratie et totalitarisme, Editions Gallimard, 1965, p. 287.

١٤- بڕوانە:
Albert Issa, I Kurdi et regimi che governano il Kurdistan, in, Politica . ed economia, xx11, n. 12, 1991, p. 25
15- Olivier Carre, Le nationalisme arabe, Fayard, 1989, 240.

١٦- بڕوانە:
.Hannah Arendt, Le systeme totalitaire, Paris, Le Seuil, 1972

# بەشی یەکەم
# میشێل عەفلەق و بەعسی عەفلەقی لە عیراق

لەپێناوی ئەوەی بە باشی لەدینامیکیەتی ئایدیۆلۆژیای بەعسی تێبگەین، پێویستە چاوێك بخشێنین بەسەر ژیانی دامەزرێنەری حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست لە ڕوانگەی سیاسیو ڕۆشنبیریەوەو قۆناغەکانی دامەزراندنی ئەم حیزبە شیبکەینەوە.

## عەفلەق و حیزبی بەعس

ئەو سەرچاوانەی باس لەژیانی میشێل عەفلەق دەکەن یەك دەنگ نین لەسەر بەرواری لەدایك بونی. هەندێك دەڵێن لەساڵی ١٩١٠ لەدایك بوەو هەندێکی تریش ڕۆژی لەدایك بونی دەگەڕێننەوە بۆ ساڵی١٩١٢ [١]. بەم بۆنەیەوە نوسەرێك دەڵێ، لەراستیدا میشێل عەفلەق لەساڵی ١٩١٢ لە دایك بوە، بەلام بۆ ئەوەی هاوبەشی بکات لەتاقیکردنەوەکانی بەکەلۆریا، تەمەنی خۆی دوو ساڵ بچوك کردۆتەوە[٢]. هەرچۆنێك بێت، دەزانرێ کەمیشێل عەفلەق لەخێزانێکی دیانیی لەئاینزای ئۆرتۆدۆکسی یۆنانی لەدیمەشق هاتۆتە دنیاوەو باوکی بازرگان بوەو موچەکەی ژیانێکی ئاسودەو زۆر بەختەوەری بۆ خێزانەکەی مسۆگەر نەکردوە. لەڕووی سیاسیەوە باوکی نیشتیمانپەروەرێکی بەجۆش بوەو هەر لەدامەزراندنی کوتلەی نیشتیمانی لەساڵی ١٩٢٨ ئەندام بوە تیایداو[٣] لەقۆناغی جیاواز جیاوازدا چەند جارێك گیراوەو لەلایەن تورکو فەرەنسیەکانەوە ئەشکەنجە دراوە. دەتوانرێ بوترێ کەدایکیشی ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوەو زۆر بایەخی داوە بەسیاسەت و بەشێوەیەکی گشتی باوەڕێکی زۆری هەبوە بەناسیۆنالیزمی عەرەبی[٤].

لەوانەیە هەر لەمنداڵییەوە میشێل عەفلەق کاریگەری بیروڕای باوكو دایکی زۆر لەسەر بوبێ و راهاتبێ لەسەر بـیری ناسـیۆنالیزمی عـەرەبی پێـش ئـەوەی ببـێ بـە کەسایەتییەکی سیاسی گرنگ[٥]. کاتێك کەخوێندکار بووە لەخوێندنگـەی ئامـادەیی ئاینی لەگەڕەکی باب توما لەدیمەشق، کەسێکی زۆر کۆنفۆرمیست نەبووەو هەرچـەندە لەناو ژینگەیەکی ئاینی ژیاوە ،بەڵام بـیروڕای ئورتۆدۆکسـی بـرادەرە خویندکارەکـانیو ماموٚستاکانی قبوڵ نەدەکردوەو چەند جارێکیش بەشەڕ هاتوە لەگەڵیاندا. لەبـەر ئـەم هۆیانە برادەری زۆری نەبوەو خوێندکـارێکی زۆر گـوێ ڕایـەڵو زیرەکیـش نـەبوە. لـە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ نووسەری عیراقی حەننا بەتاتو لـە ١٣/٧/١٩٥٨، میشـێل عەفلەق دەیگوت: " لەنێوان دیانەکاندا جیاوازبووم و بەشـێوەیەکی بـەردەوام لەگـەڵ بیروڕای برادەرە خوێندکارەکـان و مامۆسـتاکانم نـەبووم . لەوسـاڵانەی دواییـدا، پـاش پێکداچوونم لەگەڵ ئیدارەی خوێندنگە(. . .)، گوێزرامەوە بـۆ خوێندنگـەی ئامـادەیی دەوڵەت "[٦]. لەچاوپێکەوتنێکی دیکەدا لەگەڵ ڕۆژنامەنووس پاتریك سـیل(Patrick Seal) لـە ٣/١/١٩٦١، میشـێل عەفلـەق دەیگـوت کـەپێش ئـەوەی بـڕوات بـۆ فەرەنسا،" ناسیۆنالیستێکی ساکار" بوەو، وسۆسیالیزمی لەفەرەنسا ئیکتیشاف کردوە [٧]. شایيستەی ئامـاژەیـە کـە لـەزۆر چاوپێکـەوتندا لەگـەڵ ڕۆژنامـەنوسو پیـاوی سیاسی، میشیڵ عەفلەق ویستویەتی ئەوە بخاتە ڕوو کەسەرەڕای چونەوەی (ئینتمائی) بۆ ژینگەیەکی ئاینیی، ئەوەندە لەگەڵ بیروباوەڕو میولـی کۆنفۆرمیسـتی سـەردەمی خۆی نەگونجاوەو هەسـتی ناسیۆنالیسـتی زۆر بـەهێزبوەو زانیویـەتی کـەڕۆژێك ئـەم هەستەی لەگەڵ سۆسیالیزمدا یەك دەگـرێ. هـەرچۆنێك بێـت، کـاتێك کـەخوێندنی ئامادەیی کۆتایی پێ هێنا، میشیل عەفلەق توانی زەمالەیەکی خوێنـدن لەئـەوروپا پەیدابکات وبڕوات لەزانکۆی سۆربۆن لە فەرەنسا زانستی مێـژوو بخوێـنێ. هەرچـەندە نووسەران یەك دەنگ نین سەبارەت بە ساڵی سـەفەرکردنی بـۆ فەرەنسـا، بـەڵام لـەوە دەچێت کەزۆربەیان ساڵانی خوێندنی بگەڕێننەوە بۆ نێوان ساڵانی ١٩٢٨ و ١٩٣٢ [٨] . بۆ ماوەی چوار ساڵ میشێل عەفلەق لەپاریس مایەوەو زۆر خوێندکاری عەرەبی ناسی

وپەیوەندی بەهێزی لەگەڵ دروست کردن. هەر لەم ساڵانەدا بوو کە سەلاحەدین بەیتاری ناسی کەموسڵمانێکی سوننی بوو، ئەویش خوێندکار بوو لەزانستی فیزیاو مەتماتیك، پاش چەند ساڵێك پێکەوە پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستیان دامەزراند. لەو ماوەیەی کە لەپاریس بوون هەردوکیان پێکەوە (مارکس ونیتچەو ئەندرێ جید و دۆستۆیڤسکی وتۆلستۆی و رۆلاند رۆمان و بیرگسن وئەنەتنول فرانس)یان خوێندۆتەوەو یەکێتی خوێندکارانی عەرەبیان دامەزراندو لەرێگەی ئەم رێکخراوەوە توانیویانە پەیوەندی ببەستن بە خوێندکاری ولاتە عەرەبیەکان و (٩) سەبارەت بەخەبات کردن بۆ یەکێتی نەتەوەی عەرەبیش کاربکەن بۆ هوشیار کردنەوەی ئەو خوێندکارانە. پاش گەڕانەوەیان بۆ سوریا لە ساڵی ١٩٣٣ ، عەفلەق و بەیتار بوون بەمامۆستا لەخوێندنگەی ئامادەیی حکومی لەدیمەشق: عەفلەق بوو بەمامۆستای مێژوو و بەیتاریش بەمامۆستای زانستی فیزیا.

لەم ساڵانەدا، سوریا دووچاری بارووودۆخێکی سیاسیو کۆمەلایەتی زۆر سەخت بوو بووەوە. هەرلە ساڵی ١٩٢٥ ەوە سوریا لەژێردەستی هێزی مەندەتاری فەرەنسی ناڕەزایی خۆی دەردەبڕی. هەرلەو ساڵانەدا چەند ڕاپەرینێك بارودۆخی سوریایان سەخت کردبوو وبۆماوی دووساڵ سوریەکان نەیان توانی فەرەنسیەکان لەخاکی سوریا دەربکەن. هەرچەندە لەساڵی ١٩٢٨ دەست کرابوو بەهەڵبژاردنی کۆمەڵەی(جمعیە) دامەزرێنەرولەئەنجامدا" کوتلەی نیشتمانی" لغاوی دەسەڵاتی گرتبوە دەست و دەستوری سوریا دانرابوو، بەلاّم ناکۆکی لەنێوان فەرەنسیەکان ونیشتمانپەروەرە سوریەکان نەیدەهێشت ئارامیو دۆخێکی چەسپیو (مستقر) دروست بێ و بۆ ماوەی دوو ساڵ خستنەڕووی (تەتبیق کردنی) ئەو دەستورە دواکەوت. دەبێ بوترێ کەلەنێوان ساڵی ١٩٣٣و ١٩٣٦ سوریا بەڕاستی تووشی ئاڵۆزترین و دراماتیکترین دۆخ ببو. لەم ساڵانەدا فەرەنسیەکان و سوریەکان هەوڵیان دەدا کەچارەسەرێکی گونجاوو هەلومەرجی ئاشتی بدۆزنەوە لەنێوانیاندا، بەلاّم هەموو هەوڵ دانێك بۆئەم مەبەستە سوودی نەبوو. لەساڵی ١٩٣٦ مانگرتن وخۆپیشاندان سەراپای سوریای گرتەوەو نزیکەی پێنج ڕۆژ

بەبێ هوودە دەوامیان کرد. جگە لەسەرنەکەوتن بۆ دۆزینـەوەی چارەسـەرێك، قـەیرانی ئابووری‌و سیاسی سووریای خستبوە ناو قۆناغێکی تازەو هەستی ناسیۆنالیزمی زیـاتر بەهێزکردبوو. پالەپەستۆی سیاسی‌و مانگرتنی پـەنجا ڕۆژ، پـالی بەفەرەنسـیەکانەوەنا ڕازی بن لەپاریس گفتوگۆو ڕێکەوتن لەگەلّ وەفدێکی نشـتیمانی ئـەنجام بـدەن. بـەلاّم ئەنجامی ئەم گفتوگۆیە سەربەخۆیی بۆ سوریا مسۆگەر نـەکردو دیسـانەوە ناخۆشی‌و ناکۆکی کەوتــەوە نیوانیــان. هەرلـەم سالّەشـدابوو کـەتورکیا داوای ئەسـکەندەرۆنەی دەکردو لەئەنجامدا لەسالّی ١٩٣٨ ئەسکەندەرۆنە کەجگـە لەعـەرەب زۆر تورکۆفـۆن (زۆرخەلکی تیا دەژیا کەبەتورکی قسەیان دەکرد) ی تیا دەژیا، لکێنرا بەتورکیاوە.

لەم بارو دۆخە ئالۆزەدا، ئەوپارت ورێکخراوە سیاسیانەی کە لەسەر گۆڕەپانی سوریا کاریان دەکرد کامانە بوون.؟

یەکەمیان کوتلـەی نیشـتیمانی بـوو. کوتلـەی نیشـتمانی حزبێـك نـەبوو بـەواتای ووشە بەلکو کۆمەلّەیەك (تجمع) بوو کەزۆربەی ئەندامانی پێك هاتبون لەدەرەبـەگ و بۆرژوازی بچوك وسەرۆك عەشیرە تەکان، هەروەها عەقیدەیەکی سیاسـی دیـاریکراوی نەبوو. هەرلەدامەزراندنیەوە لەسالّی ١٩٢٨،کوتلەی نیشتمانی بۆ ماوەیەك توانیبـوی زۆرلەجەماوری سووری بخاتە جۆش وسەرکردایەتی مانگرتن و خۆپیشاندانەکان بگرێتە دەست خۆی. لەسالّی١٩٣٣ ژمارەیـەك لەئەندامـەکانی ئـەم کۆمەلّەیـە جیابوونـەوەو بەهاوکاری هەندێ لەولاّتە عەرەبیەکان" کۆمەلّـەی کـاری نەتـەوەیی" (عصبةالعمل القومی) یان لەسالّی١٩٣٣ دامەزراند کەدژایەتیەکی زۆری کۆمونسیتەکانی دەکـردو داوای یەکێتی وولاّتە عەرەبیەکانی دەکرد .ئەم کۆمەلّەیە زۆری نـەخایاندو لـەکۆتایی سـالّی ١٩٤٠ هەلّوەشـایەوە. بـێ گۆمـان کوتلـەی نیشـتمانی نـەیتوانی بەرامبــەر گیروگرفتی سیاسی لەسوریا یەکێتی خۆی بهێلّتەوەو جگە لەجیابوونەوەی ئەوکەسانەی کەکۆمەلّەی کاری نەتەوەییان (عصبة العمال القومـی) دامــەزراند، زۆرلەئەنـدامانی پرش وبلاّو بونەوەو پارت و ڕێکخراوی تریان دامەزراند وەك پـارتی نیشـتمانی (الحزب الوطنی) کەئەویش " پارتی هەرەوەزی سۆسیالیسـتی" (الحزب التعـاونی الاشتراکی)

لـیَ دروست بـوو و"پـارتی گـەل" (حزب الشعب) کەلەسـاڵی ١٩٤٨ دامـەزرا. دووهەمیان"پارتی میللی عەرەبی" بوو. ئەم پارتـە لەساڵی١٩٣٣ لەلایـەن ئـەنتوان سعادەوە کەدیانێکی لوبنانی بوو دروشمەکـەی پێـك هاتبوولـە:"سـوریا بۆسـوریەکان وسوریەکانیش نەتەوەیەکی تەواون". پـارتی میللـی عـەرەبی داوای سوریای گـەورەی دەکرد (واتابەشی ڕۆژئاوای هلال الخصیب). پارتی میللی عەرەبی بەشێوەیەکی نـهێنی کاری دەکردو زۆربەی زۆری ئەندامانی پێـك هـاتبون لەگـەنج و ڕۆشـنبیری عـەرەب و هەندیکیشـیان ڕۆڵیکـی گـەورەیان هـەبوو لەڕاپەڕینەکـەی رەشـید عـالی گـەیلانی لەعیراقدا. دەشیَ بوتریَ کەئەم پارتە تەوژمو کاریگەری فاشـیزمی لەسـەر بـوو و زۆر گرنگـی دەدابـە پـەیرەو و هـێزو مەشـقی سـەربازیی[10]. هـەندیَ لەئەندامـەکانی ڕێکخراوی" ناسیۆنالیستە عەرەبەکانیان" (القومی العرب) دامـەزراندو ئامانجیـان پێك هاتبوو لەم سیَ کۆچکەیە: "یەکیەتی، ئازادی، تۆڵە" وهەروەها کاریگەری بـیری (ساطع الحصری)یان زۆرلەسەربوو[11]. سێهەمیان"پـارتی گـەنجان" (حزب الشباب) بوو. ئەم پارتە تاساڵی ١٩٥٠ نەی توانی لەسەرجەم سوریا بناغەی خـۆی دابکوتـیَ و وەك پارتێکی لۆکال( محلي) مایەوەو لەدوایدا ناوی خـۆی گـۆڕی و بـوو بـە "عـەرەبی سۆسیالیسـتی" (العرب الاشتراكي) کـەتوانی تاڕادیـەك چینـی جووتیـار لــەخۆی کۆبکاتــەوەو جوتیـاران دژی دەرەبەگایـەتی هـان بـدا. جگەلـەم پـارت و ڕێکخـــراوە ناسیۆنالیست یان نیشتمانپەروەرانە، هـەندیَ پـارتی دیکـەش هـەبوون وەکـو پـارتی کۆمونیستی مارکسی لینینی کەلەساڵیَ ١٩٢٤ دامـەزرابوو و لەسـەرەتاکانی١٩٣٠ چالاکی خۆی دەنواندو هەروەها برا موسڵمانەکان کەلەساڵانی ١٩٣٠ دەستیان کردبـوو بەچالاکی ڕێکخراوەکەیان بەهێزبوو بوو. شایسـتەی ئاماژەیـە، لـەم سـاڵانەدا پـارتی بەعسی بوونی نەبوو و میشێل عەفلەق و بـەیتاریش تاسـاڵی ١٩٣٩ لەسـەر شـانۆی سیاسی سوری زۆر نەناسرابوون. ئەوەش دەبیَ بخرێتەڕوو کـە لەسـاڵی ١٩٣٩ میشـێل عەفلـەق و بـەیتار هـەردوکیان ڕێکخراوێکیـان دامـەزراندبو بـەناوی" بزووتنـــەوەی ژیانـــەوەی عـــەرەبی" (حرکـة االاحیـاء العربـی) [12]. ئـەم ڕێکخـراوەی عەفلـــەق و

بەیتارکەپێکهاتبو لەچەند کەسێك لەسالیٚ ١٩٤١ چەند بەیانێکیان بلاّوکـردەوە دژی کۆلۆنیالیزمی فەرنسی و زۆر هێرشـی کردبـوە سـەر سـەرۆکی کوتلـەی نیشـتمانی، شوکری قواتلی.لەڕێگەی ئەم بەیانەش دەیویست هەڵویستی خۆی بەرامبـەر لکـاندنی ئەسکەندەررۆنە بەتورکیاوەو دەربخات رەخنە لەکوتلەی نیشتمانی لەبەر بـیٚ تواناییـان بەرامبەر کێشەی میللەتی عـەرەب بگرێـت. بـیٚ گومـان کودەتاکـەی رەشـید عـالی گەیلانی لەسالیٚ ١٩٤١ بۆنەیەکی بـەپیتو پۆزیتیڤـی دروسـت کـرد بـۆ عەفلـەق و رێکخراوەکەی کەخویان بەجەماوەر بناسـێنن و دەرببخـەن کەبەهـەموو هێزێکیانـەوە چالاکانە پشتگیری لەکێشەی نەتـەوەی عـەرەب دەکـەن [١٣]. سـەبارەت بەکودەتاکـەی گەیلانی بەیانێکی زۆریان بلاّوکردەوەو خەلّکی خۆبەخشیان (متطوع) بۆ بەغدا نـارد تا شان بەشانی موفتی گەورەی بەیت لەحم (بیـت لحـم)شـەرِبکەن .هەربـەم بۆنەیـەوە عەفلەق و رێکخراوەکەی کۆمیتەیەکیان دامەزراند بـەناوی " بزووتنـەوەی پشـتگیری لەعیراق" (حرکة نصرة العراق) و دەستیان کرد بەناردنی چەك و تەقـەمنی بۆبـەغدا. بەدڵنیایی ئەم هەڵسـوکەوتە ئـەوەی دەردەخسـت کەپەیوەندیـەکی بـەهێزیان لەگـەلّ عەرەبە عیراقیەکان هەبوو ورۆڵـی عەفلـەقیش بـەڕێژە (نسـبیا) گـەوەبوو.بەتایبـەتی تێبینیٚ ئەوە کـرا کـە لـەژێر چـاوی عەفلـەقدا زۆر لەجولەکـەکانی بـەغدا کـوژران وسەرنگون کران [١٤].

ئەو سـەردەمە دەسـەلاّتی فەرەنسـی لەسـوریا لەگـەلّ حکومـەتی ڤیشـی سەربەنازیەکان دەستی کردبـوو بـەگفتوگۆ و رێکـەوتبون لەسـەر ئـەوەی کـە فرِۆکـە ئەلّمانیەکان بەسەر ئاسمانی سـوریادا بفـرِن بۆئـەوەی بگەنـە گۆرِەپـانی ئۆپێرەسـیۆنی سـەربازیی لەبـەغدا [١٥]. بـەلاّم پـاش هـەرەس هێنـانی کودەتاکـەی رەشـید عـالیو داگیرکردنی سوریاو لوبنان لەلایـەن ئینگلـیزو فەرەنسـیەکان و پێکـهێنانی کۆمـاری سوریا بەسەرۆکایەتی الشیخ تاج الدین الحسینی لـەحوزەیرانی ١٩٤١ ، چالاکیـەکانی عەفلەق و بزووتنەوەی ژیانـەوەی عـەرەبی بۆپشـگیری کـردن لـەعیراق کەمبوونـەوە. هەرلەم سالاّنەشدابوو کەعەفلـەق و بـەیتار کەوتنەخسـتنەڕووی بـیری یـەکێتی پـان

عەرەب بەشێوەیەکی سیستیماتیك و باسکردنی پێویستیی شۆڕش لەدەرەوەی وڵاتی سوریاو بەستنی کۆڕ بۆخوێندکارانی زانکۆ . هەروەها نابێ ئەوەش پشت گوێ بخرێ کەڕووداوە سیاسیەکانی عێراق ئۆپۆزیسیۆنی عەفلەق و دەستوپێوەندەکەی بەهێزو فراوانتر کرد لەسەر شانۆی پان ناسیۆنالیزمی عەرەبی. بێ گومان، کاتێك کەعەفلەق و بەیتار گەڕانەوە بۆ سوریا لەلایەن سووریەکان باشتر ناسران و عەفلەقیش وەك پاڵەوانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی دەرکەوت کەدەبوایە قوتابیەکانی و ئەوانەی دوایکەوتبون ڕێزێکی گەورەی لێ بگرن.

"سەرکەوتن لەعیراق" وەکوخۆی دەیگوت ، ڕێگەیەکی بەپیتی بۆپاك کردەوە بۆچاندنی تۆوی رقو کینە دژی دوژمنو هەستی ناسیۆنالیزمو بلاْوکردنەوەی بەهاکانی یەکێتی عەرەب. بەبۆنەی کودەتای سەربەنازیەکانی عێراق، عەفلەق دەیگوت کەئەو"سەرکەوتنە لەعیراق بۆنەیەك بوو بۆ ئەوەی بتوانین واتای عەقیدەی بنەڕەتی حیزبو یەکێتی عەرەب بگوێزینەوە بۆ قوتابیەکانمان" [١٦]. ئینکاری لەوە ناکریت کە گورجو گوڵیو کاری سیاسیو توانای ڕۆشبیری عەفلەق ئەرکی راکێشانی ئەو کەسانەی کەگوێیان لێدەگرت ئاسان دەکرد. هەروەها ئینکاری لەوەش ناکرێ کەعەفلەق کابرایەکی ڕەق بوو بەرامبەر بەخۆیو روحیەتێکی جدی هەبوو و خاوەن سایکۆلۆژیەتێکی ئالۆز بوو،" جگە لەوەش هەموو ژیانی تەرخان کردبوو بۆ کێشەی عەرەبیو ژیانی ڕۆژانەی بێ لافو گەزاف دەبردەسەرو باکی نەبوو بۆ خۆ دەڵەمەندکردن" [١٧] .ئەم شیوە ژیانەو هەڵویستی سیستێماتیکی بەرامبەر بەکێشەی عەرەب جۆشی دروست کردبوو لەناو خەڵکیداو کەسانی ڕادەکێشاو وای لەخەڵکی دەکرد کەژیانو کاتو ووزەی سایکۆلۆژیان تەرخان بکەن بۆ پاشەڕۆژی میللەتی عەرەب. جگە لەوەش، عەفلەق پاش چوارساڵ لەخوێندنی مادەی مێژوو لەسۆربۆن بەزانیارییەكو باگراوندێکی باوەڕپێکراوەوە گەڕابوەوە بۆ سوریا. لەبەرئەم هۆیەش توانی کارێکی زۆر بکاتە سەر ئەوانەی کەگوێیان لێ دەگرت. بۆماوەی دەساڵ کەمامۆستا بوو لەخوێندنگەی ئامادەیی لەدیمەشق، خۆی تەرخان کردبوو بۆ

بلاوکردنەوەی پرینسیپەکانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەسەر بناغەی زمانییو مێژوویی. هەر لەساڵی ١٩٣٥ تا ساڵی ١٩٤٢ توانی ژمارەیەکی زۆر لەخوێنکار لەخۆی کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی فێری پەیامی ناسیونالیزمی عەرەبیان بکات. لەوانەیە ئەم سەردەمە زۆر گرنگ بووبێ بۆ دروست کردنی شانەو پەیداکردنی لایەنگیران بۆ پارتی بەعس کە لەساڵێ ١٩٤٣ وە بەشیۆەیەکی ئاشکرا دەستی کرد بەکارکردن. لەساڵی ١٩٤٣ عەفلەقو پارتەکەی کە بۆ یەکەمین جار لەپرۆسەی هەڵبژاردن لەسوریا هاوبەشیان دەکرد، بەیانێکیان بلاوکردەوەو دەستیان ڕاکێشا بۆ چەند خاڵێك کە لەم دێڕانەی خوارەوە دەتوانرێن دابڕێژرێن.

١. گرنگی دان بەبیری ناسیۆنالیزمی ژیاو (حي) کەرۆحی عەرەبی نوێنەرایەتی دەکات"

٢. گرنگی دان بەکەسایەتی ڕابووردوی عەرەبو ڕۆحی نەتەوەیی عەرەبو هەروەها پێوستیی پاراستنی لەداگیرکردنی لەلایەن کولتورو فەلسەفەی ڕۆژئاوایی"

٣. کولتور نابێ ئەبستراکت بێ بەڵکو دەبێ ڕێگەیەك بێت بۆ بەهێزکردنی مۆرال(ئەخلاق) و پێگەیاندنی ڕۆحی خەبات"

٤. ڕەتدانەوەی تایەفەگەریو هەرێمایەتیو ئاڕاستەی تەسك"

٥. رەفزکردنی کۆمونیزم کە نوێنەرایەتی مەتێریالیزمو پێشکەوتنی دروستکراو دەکات"

٦. هەوڵ دان بۆ هاوجووت کردن لەنێوان بەرژەوەندی ناسیۆنالیستیو ئاین، واتا لە نێوان عەرەبایەتیو ئیسلام"

٧. گرنگی دان بەئازادی چونکە جەوهەری عەرەبایەتیو نەتەوەی سەربەستو ئازاد پێکهاتوە لە مرۆڤی سەربەستو ئازاد"

٨. بایەخ دان بەیەکێتی وڵاتە عەرەبییەکان لەسەر بناغەی ئەم بیرەی (فکرە) خوارەوە" "تاکە یەك نەتەوەی عەرەب ،خاوەنی پەیامێکی هەتاهەتایی"[١٨].

ئەنجامی هەڵبژاردنەکە هیچ شانسێکی نەدا بەعەفلەق و ڕێکخراوەکەی کە هاوبەشی بکەن لەدەسەڵات و ئەنجامی پۆزیتیڤ گەڕایەوە بۆ کوتلەی نیشتیمانی. دەشێ ئاماژە بەوەش بکرێ کە هەر لە سێ هەڵبژاردنەکەی ساڵانی ١٩٤٣ و ١٩٤٧ و ١٩٤٩ نە عەفلەق‌و نە بەیتار هەڵنەبژێردران بۆ پەرلەمانی سووری‌و بەم بۆنەیەوە دەتوانرێ بوترێ کە لەساڵی ١٩٤٥ پاش ئەوەی کە زۆر لەسەرکردەکانی بەعس نێردرانە بەندیخانە، میشێل عەفلەق‌و ئەندامانی بەعس کە کەمایەتیەك بوون، دەستیان کرد بە بەکارهێنانی خەباتی چەکدارو بۆ ئەو مەبەستەش " فرق الجهاد الوطني " یان دامەزراندو لەئەنجامدا کەوتنە کاری نهێنی.

ئەم ململانێیە بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٤٧ کە پارتی بەعس بەرەسمی داوای مۆڵەتی لەوەزارەتی ناوخۆ کرد تا بەئاشکرا لەسەر گۆڕەپانی سیاسی سووریا کاربکەن.

شایستەی باسە کە تا دووی حوزەیرانی ١٩٤٧ بەعس تەنها لەعەفلەق‌و بەیتار پێکنەهاتبو، هەرچەندە بناغەی تیۆری‌و ئایدیۆلۆژی لەمێژەوە بنیاد نرابوو. بێگومان چەند کەسایەتیەکی تریش لەدامەزراندن‌و دانانی بناغەی تیۆری هاوبەشیان کردبوو.

کێ بوون ئەوانەی لەگەڵ عەفلەق‌و بەیتار بەعسیان دامەزراندو کەی بە تەواوی بەعس ناوی بوو بەوەی کە ئێستا پێی دەوترێ پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست؟

ئەو سەرچاوانەی کە لەناوی بەعس‌و ساڵی تەواوی دامەزراندنی دەدوێن لەسەر زۆر شت کۆك نین. هەندێك دەڵێن کە دامەزرێنەری بەعس کەسایەتیەکە بەناوی زکي الارسوزي. بەم بۆنەیەوە، سامی الجندي، کەیەکێکە لەدامەزرێنەرانی بەعس، دەڵێ : کە لە ٢٩ی تیشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٠ ژمارەی بەعسیەکان پێکهاتبوو لەشەش کەس‌و زەکی الارسوزیش پێشنیازی دەکرد پارتێك دابمەزرێ بەناوی "البعث العربي" و ڕێکخراوەکەش بکرێ بە دوو بەشەوە: بەشی سیاسی‌و بەشی کولتووری[١٩].

نووسەرێکی دی دەڵێ کە زەکی الارسوزی‌و جەماعەتەکەی بەعسی عەرەبیان لەساڵی ١٩٣٩ لەناوچەی ئەسکەندەرۆنە دامەزراند. هەرچۆنێك بێت، دەتوانرێ بوترێ کە بەلایەنی کەمەوە الارسوزی بە "دەستپێشکەری ڕۆحی بەعس"[٢٠] دادەنرێت.

زكی الارسوزی كیٚ بوو ؟ الارسوزی ( ١٨٩٥-١٩٦٨) موسـڵمانیٚكی عەلـەوی بـوو لەخیٚزانیٚكی دەوڵەمـەند لەلادیٚی الارسوز لەدایك بووبوو. عەلەویەكان (نوسـەیریەكان) [٢١] لقیٚكی ئاینزای شیعەن كە زیاتر لەخۆرئاواو ژووررووی سوریاو خۆرهەلاٚتی خـوارووی توركیا دەژین. لە سوریا بەشیٚوەیەكی سەرەكی لەو ناوچەیە دەژین كە بەناوی خۆیانـەوە "جبل العلويين" ناسراوە، بەلاٚم لەو شارانەی كە دەكەونـە دەوروپشـتی جبـل العلويـين زۆربەی دانیشتوان پیٚك ناهیٚنن وەكو لازقیە، جبلە، بنیاس‌و ترتـوس...هتـد. هـەندیٚ كەمایەتی عەلەویش لە حەلەب‌و دیمەشق دەژین‌و لە ساڵی ١٩٦٤ ژمارەیان دەگەیشتە شەش سەد هەزارو ئـەمڕۆ لـە ١١٪ ی دانیشـتوانی سـوریا پیـٚك دیٚنـن. لـە ژووررووی لوبنـانیش نزیكـی خـوارووی سـنووری سـووریا كەمایەتیـەكی عەلـــەویش هـــەن‌و لەتوركیاش لە ساڵی ١٩٢١ ژمارەیان دەگەیشتە هەشت سەد هەزارو ئەمڕۆ پـانزە تـا بیست ملیۆنن كە بەشیٚوەیەكی سەرەكی لە ئەنتاكیاو ئەسكەندەرۆنە دەژین.

ئـاینزای عەلـەوی لـەنیٚوان سـەدەی سـیٚیەم‌و نۆیـەم لـەعیراق بناغـەی داكوتـــاو عەلەویەكان ناوی خۆیان دەگەڕیٚننەوە بۆ (محمد ابن نصير النميري). ابن نصـير النمـيری خۆی وەكو كەسایەتیەك دەزانیٚ كەخاوەنی سروشـتی ئیمـام بـیٚ‌و خـۆی بـە پەیامبـەر دادەنا. بە گویٚرەی ترادیسیۆنی عەلەوی، ابن نصير قوتابیەكی چالاكی یانزەهەمین ئیمام الحسن العسكري بوەو لەوەوە ئیلهام‌و وەحی تازەی وەرگرتوە.

بەشیٚوەیەكی گشتی، عەقیدەی عەلەوی تەقدیسی عەلی كوڕی ئەبی تـالب دەكـات‌و دای دەنیٚ بە: " الاله الاعزم القديم الازل ". ناوەڕۆكی عـــقیدەی عەلـەوی پیٚكـهاتوە لەكۆزمۆگۆنیەكی جۆری گنۆستیك* . ئەم عەقیدەیە باوەڕی بەوەیە كە هــەر لەدەسـت پیٚكردنی كات و گەردونەوە، چـەند ڕوناكیـەك ڕۆحـی عەلەویـەكانیان پیـٚك هیٚنـاوە. ئەمانە لەو ڕوناكیانەن كەخودای مەزنیان دەورە داوەو ئەركی عەلەویەكانە سوجدەی بۆ

---

* كۆزمۆگۆنی تیۆرییەكە كە بەشیٚوەیەكی گشتی باسی دروست بوونی گەردوون دەكات‌و گنۆستیكیش لەگنۆزەوە هاتووە: پیٚكهاتووە لەفەلسەفەیەك كە دەلیٚ مرۆڤ دەتوانیٚ بگاتە ئەوەی شتی خودایی‌و دیاردەكانی تیٚبگات.

بەرن و بەشانوباڵیدا هەڵدەن. پاش ماوەیەك، ئەم ڕوناکیانە باوەڕێکی تەواویان نەهێنا بە پیرۆزیی (موقەدەسیی) خوداو دژی وەستانەوە. لە ئەنجامدا، لە ئاسمانەوە کەوتنە خوارەوەو پەنایان بردە سەر زەویو کەچوونە ناو لەشی ئادەمیزادەوە دووچاری مێتامپسیکۆز( تناسخ )بوون( ئەم عەقیدەیە باوەڕی بەوە هەیە کە ڕۆح دەتوانێ چەند جارێك بچێتە لەشی ئادەمیزاد یان ئاژەڵەوە). ئەمجا، لەکاتی کەوتنە خوارەوەیان، خوای گەورە حەوت جار دەردەکەوێ بۆ ئەوەی پێیان رابگەیەنێ کە دەبێ ملکەچی بۆ بکەن. هەر جارێك کەخودای گەورە(کەناوی "معنـی" یە) دەردەکەوێت، بە شێوەی دوو ناوەڕۆك دێتە ڕوو، واتا پێك هاتوە لەدوو شت کە بەراستی ناویان هەیە" یەکەمیان "الاسم" ە کە پێشی دەوترێ "الحجاب" و دووەمیان "الباب"ە. ئەم سێ کوچکەیە چەند جارێك لە سەر زەوی خۆی پیشان داوە، واتا " المعنی "، پاشان، چۆتە ناو لەشی ئەو پەیامبەرانەوە کەدوایەمینیان عەلی کوڕی بن ئەبی تالبە" پاشان چوەتە ناو لەشی ئیمامەکانیش تا گەیشتۆتە ئەوەی یانزەهەمیان کەناوی ئیمام الحسن ئەلعسکرییە. ئەم ئیمامانە هەمویان "واتا"ی خودایی چۆتە ناو لەشیانەوە.

بێگومان، بەلای عەلەویەکانەوە، سێ کۆچکەی مەرکەزی یان سەرەکی سەردەمی ئیسلامی پێك هاتوە لە عەلی کوڕی ئەبی تالب وەك "المعنی"، لە پەیامبەر وەك "الاسم، الحجاب" و سەلمان الفارسی وەك "الباب". "دەرگاکانی"(ابواب) هەر یانزە ئیمامەکە پەیوەندیەك دروست دەکەن لەنێوان خودای شاراوەو باوەڕهێنەران" بۆ نمونە، محەمەد بن نصیر، "دەرگای" الحسن العسکری، یانزەهەمین ئیمام بووە کە متمانەی تەنها بە عەلەویەکان کردوە وەك باوەڕهێنەر. هەر بەلای ئەم عەقیدەیەوە، ئەوەی کەپێناسەی ئەم "واتا"یە بزانێ و باوەڕی پێبهێنێ، ڕزگاری دەبێت لەمێتامپسیکۆزو ڕووی لە لەش دەبێتەوەو دەبێ بەئەستێرەیەك و لەحەوت تەبەقەی ئاسمانەوە ڕێی ئامانجی کۆتایی دەگرێت و دەست دەکات بەچاودێری کردنی( المعاینە، contemplation)ی ڕوناکی خودایی[٢٢].

لەم تێڕوانینە فەلسەفی‌و تیۆلۆژیەوە، ئاینزای عەلەوی بیر دەکاتەوە کەئیسلام واتایەکی شاراوەی هەیەو تەنها باوەڕهێنەران توانای ئەوەیان هەیە لێی تێ بگەن. بەکورتی، عەلەویەکان تەقدیسی عەلی کوڕی ئەبی تالب دەکەن‌و دای دەنێن بەوێنایەکی پێش پەیامبەرو بیر دەکەنەوە کە وەحی بۆ ئەوان هاتۆتە خوارەوە، ئەوان وەك کەمایەتیەکی موسڵمان. لە بەر ئەم هۆیە، عەلەویەکان عەلی کوڕی ئەبی تالب بە "واتایەکی خودایی"[٢٣] دادەنێن.

ئەمجا، بەلای حەنا بەتاتوەوە، زکی الارسوزی کاریگەری ئەم تێڕوانینەی لەسەر بووەو لەبەر ئەوە لەباری سیاسیەوە نەتەوەی عەرەب وەك "واتای بەڕێوەبەرو دروستکەر"[٢٤] دەبینێ ئەم تێڕوانینە کە نەتەوەی عەرەبی بە نەتەوەی پیرۆز دادەنا، باس‌و بابەتێکی سەرەکی ئەو پاڵەپەستۆیەی پێکدەهێنا کە لەسەر تورکیا لە نێوان ساڵانی ١٩٣٦ و ١٩٣٩ سەبارەت بە ناوچەی ئەسکەندەرۆنە[٢٥] دروست بوو بوو.

زکی الارسوزی کەداوای ژیانەوەی پیرۆزیی نەتەوەی عەرەبی دەکرد، ئەوەی دەخستە ڕوو کەپێویست بوو عەرەب خەبەربکرێنەوە. بەم بۆنەیەوە حەنا بەتاتو جەخت دەخاتە سەر ئەوەی کەدیدو بۆ چونەکانی زکی الارسوزی لەسەر ئاستی سیاسیەوە لەڕەگەز پەرستیەوە سەرچاوە دەگرن[٢٦]. ئەمجا لەو ساڵانەدا، زکی الارسوزی بەمەیلێکی ڕەگەزپەرستانە هێرشی دەبردە سەر تورکەکان‌و ئەرمەنی‌و سوریەکانیشی بە "عەرەبی بەتورك کراو" لەقەڵەم دەدا. کاتێك کە فەرەنسای لەبەر مامەڵە کردنێکی جیاوازو فەرق کردنی لەنێوان عەرەب‌و کەمایەتیەکان تاوانبار دەکرد، زکی الارسوزی دەیگوت "بێگانە لەعەرەب دەترسا کە بەرژەوەندی بخاتە مەترسیەوە، لەبەرئەوە جولەکەی بەکار هێنا بۆئەوەی ئەم مەترسیە لابەرێت" ودەیگوت کە" ئەمجا زۆر سروشتیە کە(فەرەنسیەکان) بۆگەنی سەر زەویان زیاتر ویست لەئێمە، ئێمەی کەجاران خاوەنی جیهان بووین"[٢٧]. زەکی الارسوزی هەر لەگەنجیەوە زۆر بایەخی دابوو بەڕۆحیەتی عەلەوی و مەسەلەی عەرەبایەتی. خوێندنی دکتۆرای لەفەلسەفە لە پاریس لەنێوان ١٩٢٦-١٩٣٠ بەجێ هێنابوو. هەتا مردنی لەساڵی ١٩٦٨ لەدانیشگا جیاجیاکانی

سوریا مامۆستای میژوو فەلسەفە بوە [٢٨]. کاتێك کەگەڕایەوە بۆسوریا پەرتوکێکی نووسی بەناوی" العبقرية العربية في لسانها". سەنتەری بیری سیاسی زکی الارسوزی لەدەوری ناسیۆنالیزمی زمانیی دەخولێتەوە کەبنەڕەتەکەی لەجۆری ناسیۆنالیزمی ڕەگەز پەرستی فیختەیە. بەلای (الارسوزي)یەوە، نەتەوەی عەرەبو دەربڕە ساسیەکەی کەناسیۆنالیزمی عەرەبیە لەلایەن زمانەکەیەوە پێناسە دەکرێ. زمانی عەرەبی گوزارشت لەعەبقەریەتی نەتەوەی عەرەب دەکات. لەمۆرفۆلۆژیو سینتاکسیو سیحری وشەکانی، زمانی عەرەبی زۆر بەرزترە لەزمانەکانی تر. هەر لەسەرەتای مرۆڤایەتیەوە زمانی عەرەبی زمانێکی خۆشەویست بووەو خودا لەرێگەی قورئانەوە بەعەرەبی دواوەو ئەم خۆشەویستیە بۆ زمانی عەرەبی هەر لەزەمانی ئادەمەوە دەست پێ دەکات. بەلای (زکی الارسوزی)یەوە، میزۆپۆتامیا وسوریا یەکەم شارستانیەتی جیهان بوونو گۆڕەپانی زمانێکی تەواو بوون. تەوراتو ئینجیل بەزمانی جولەکە هاتونەتە خوارەوە کە زمانێکی سامیەو زمانە ئارامیەکان کە ئەوانیش ڕەگەزەکەیان سامیە هیچ قسەیان پێ ناکرێ تەنها لەلایەن کەمایەتیەکی دیانی عیراقو سوریا و تورکیا نەبێ.لەبەر ئەوە تەنها زمانی عەرەبیە کەتائێستا زمانێکی ژیاوو هاوجووتە لەگەلّ وەحی ئاینی و لەبەر ئەوە زمانێکی ڕەسەنەو زمانێکی ئادەمیە (زمانی ئادەمە). عەرەب لەسەرئاستی غەریزە هەست دەکەن کە زمانی زگماکیان زمانی ئەسلّی ئادەمیزادە. لەرێگەی هێنانی چەند نمونەیەکی زمانیی لەمۆرفۆلۆژیای زمانی عەرەبیو مۆرفۆلۆژیای کردارە عەرەبیەکانو نمونەکانیان، زەکی الارسوزی دەیویست بیسەلمێنێ کە زمانی عەرەبی هاوجوتە لەگەلّ سروشتی ئادەمیزادو زمانی سروشتە. وشە عەرەبیەکان لەستروکتورو دروست بونیاندا هاوجوت گوزارشت دەکەن لەواتای پڕی مەبەستیان. هەروەها ناوەرۆکی وشە عەرەبیەکان بۆنمونە وەك " دادپەروەری، پەیڕەو، شیعر، جوانی"، گوزارشت لەرۆحی عەرەب دەکەن. تەنانەت وشەی "الام" (دایك)و ووشەی "الامة" (نەتەوە)، لەسەرئاستی ئێتیمۆلۆژی هەمان ڕەگەزیان هەیەو لەبەر ئەوە نەتەوە بۆ ڕۆحی عەرەب وەك هێلّێکی بەردەوامی خێزان واتا وەك دایك وایە.

جالەبەر ئەوەیە کە نەتەوەی عەرەب سەرچاوەی سـەرجەم میللەتـە سـامیەکانەو خـۆی لەخۆیدا جیهانێکەو هەر لەپەیدابوونی ئادەمیزادەوە لەسەر زەویدا هەرگیز نەفـەوتاوە. لەڕوانگەی هەستی شانازی بەڕەگەزەوە، زکی الارسوزی تێبینی دەکرد کە ڕۆحی سـامی عەرەبی ئاراستەی ڕۆحێکی نمونەییە (مثالی) و پەیامەکەی پێکهاتوە لەقەوارەیەك کە دەیەوێ لەڕێگەی ڕووناکی ڕۆحەوە مرۆڤایەتی بەرزبکاتـەوە. زکـی الارسـوزی، وەك زۆر لەبەعسیەکانی تر، بەتایبەتی میشێل عەفلەق‌و سەدام حسـین کـە لەشـوێنی خۆیـدا باسیان دەکـەین، دەیویسـت هێـڵ بخاتـە ژێـر ئـەوەی کەنەتـەوەی عـەرەب هـەزارەها پەیامبەری خستۆتە سەر شانۆی مرۆڤایەتی‌و هەموویان بەزمانی سامی یـان عـەرەبی قسەیان کردوە. گشت مرۆڤایەتی لەبەر ڕۆشنایی عەرەبەوە ئەم ڕاستیەی وەرگرتوەو بەم شێوەیە وەکو بەعسیەکانی تر دەیویست لەسەر ئاستی مێژوویی "پەیامی مرۆڤایەتی یان عەرەب هەتاهەتایی" بکات، واتـا بیکـات بـە دیاردەیـەکی مێژوویـی بـەردەوام‌و هەمیشـەیی . جگـە لـەوەش، زکـی الارسـوزی تـەورات‌و ئینجیـل دەبەسـتێتەوە بەعەرەبایەتی و شارستانیەتی فەرعونی میسر یان شارستانیەکانی سۆمەری‌و بابلـی‌و فینیقی‌و ئەفسانەی ئادەم‌و حەوا دەکات بە بناغەیەك بۆ عەربایـەتی. زکـی الارسـوزی لەڕێگەی بەجیارکی کردنی (بە هەرەمی کردنی) زمان‌و وکولتور، دەیویسـت بـەرزیی ڕەوایی (شەرعیەتی) زمانیی‌و کولتوری عەرەبی دەربخات‌و پەیوەندی سـتونی (افقـی) لەنێوان میلەتاندا رەتدەکردەوە. بەلای (الارسـوزی)یـەوە، شارسـتانی‌و ئاینـەکان زۆرن بەڵام هەموویان دەگەڕێنەوە سـەر یـەك ڕەگـەز کەرەگـەزی عەرەبـە. هـەروەها زمـانی ئەوروپیەکان،بەتایبەتی زمانی یۆنانی و لاتینی، زمـانی تێبینـی‌و زمـانی دۆزینـەوەو زانستی‌و تەکنیکین‌و ئەگەر ڕۆحیەت پەیدا بکەن ئەوا لەڕۆژهەلاتـەوە وەریـان گرتـوەو لەپەیامبـەرەکان‌و ئاینـەکان کەئیسـلام سـینتەزەی (جمـع) دواهەمینیانـە، بۆیـان هاتوەتەوە. هەموی سینتەزەی قورئانە کە بەعەرەبی نوسراوەو قورئان گەورەیی عـەرەب پیشان دەدات. قورئان بۆعەرەب وەك ئیفلاتون بۆ یۆنانی یان سیسێرۆ بۆلاتینـی وایـە، یان شەکسپیر بۆ ئینگلیزو گۆتە بۆ ئەلمانی وایە. هەر لەبەر ئەوەشە کـە (الارسـوزی)

دەیگوت کە عەرەبایەتی بەخەبەر بوونەوەی ڕاستەقینەی عەرەبە کە لەناو ڕۆحی عەرەب خۆی شاردۆتەوە. لەبەرئەمە بەلای (الارسوزی)یەوە بەرامبەر ئەو دۆخە دژوارەی کەعەرەب تیادا دەژی پێویستە ناسیۆنالیزمی عەرەبی دەوری بنەڕەتی خۆی ببینێ بۆ ژیاننەوەی ڕۆحی پوختی عەرەبی، ناسیۆنالیزمێك کەبنچینەکەی پێکهاتیێ لەپەیوەندی خێزانیو باوو باپیران. ناسیۆنالیزم یەکێتی سەرەتایی (primitive) دەپارێزێو لەلایەکی تریشەوە یەکێتی ناوخۆ مسۆگەر دەکاتو ئەمەش لەڕێگەی دەوری سەرۆك (زعیم)وە دەبێت.

سەرۆك (زعیم) بۆ میللەتێك وەك دایکێك وایە بۆ منداڵەکانی. بەم شێوەیە، دەرخستنو بایەغ دان بە سەنگو چەمکی سەرۆك، وای لە زەکی الارسوزی دەکرد کە"خۆبەخت کردن"،" کار"،" پەرستنی سەرۆك"و"بەوەفایی" بۆ سەرۆك وەك یەکەمین فەزیلەی ئادەمیزادی عەرەب ببینێ. زیاتر لەوەش الارسوزی خۆی وەك"پەیامبەر" یان وەك چارەنوسی (مصیر) پان عەرەبیەت لەقەڵەم دەدا. دەوترێ کە زۆر لەبیرو بۆ چونە سیاسیەکانی الارسوزی لەلایەن میشیل عەفلەقەوە وەرگیراون یان دزراونو لەبەر ئەم هۆیە زۆر جار یەکێکیان ئەوی تری سەبارەت بەم کارە تاوانبار کردوە [٢٩].

هەندێکی تریش گەڕاندنەوەی دامەزراندنی بەعس بۆ زەکی الارسوزی پەسەند ناکەنو دەڵێن هەرچەندە الارسوزی وشەی" بەعس" ی بەکار هێناوەو هەر لەوکاتەی مامۆستا بوە لە(دیر الزور) وهەرچەندە زۆری کردوە بۆ دامەزراندنی حزبێك بەناوی"البعث" بەڵام ئەو دامەزرێنەری ڕاسەقینە نییە. (جلال السید) کە یەکێکە لەدامەزرینەرانی بەعس دەڵێ لەسەر ئاستی تیۆری الارسوزی ڕۆڵی خۆی بینیوە بەڵام هیچ هەنگاوێکی عەمەلی بۆ دامەزراندی حزبێکی سیاسی لەسەر ئەو مۆدێلەی کە ئێستا حزبی بەعس خاوەنیەتی نەناوە، نابێ پشت گوێ بخرێ کە لەناو بەعسدا باڵێکی الارسوزی هەبوو [٣٠]. بەلای (جلال السید)ەوە بیرۆکەی دامەزراندنی بەعسی لەڕاستیدا لەنێوان عەفلەقو بەیتارەوە بوە و لەساڵی ١٩٤٢ پاش چەند کۆبونەوەیەکی زۆر

هـەمويان پێکـەوە رێکـەوتون کـەناوی رێکخراوەکـەیان بنێـن"البعث العربـي"(٣١).
شایستەی ئاماژەیە کە هەرچۆنێك بێتو ڕای هەرکامێك ڕاست بێ یـان ڕاسـت نـەبێ،
نکوڵی لەوە ناکرێت کە لەو کاتانەدا دوو حیزب هەبوە بەهەمان ناو: ئەوەی عەفلـەقو
ئـەوەی الارسـوزی. لەچلـەکاندا گروبـێ الارسـوزی چـوە نـاو ئـەو حزبـەی کـــەپێی
دەوترا"البعث العربي" .

لەساڵی ١٩٤٤ الارسوزی وازی لەکاری سیاسی هێناو زۆر لە ئەندامانی گروپەکەی
ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لەناو ئەوگروپـەی کـە عەفلـەق سـەرۆکایەتی دەکـرد. تەنـها
لەساڵێ ١٩٥٣ بەعس ئەو ناوەی ئێسـتای وەرگرتـو بـوو بـە (حزب البعث العربي
الاشتراکي) و لەئەنجامی بوون بەیـەك لەگـەڵ پـارتی سوسیالسـیتی عـەرەبی (حزب
الاشترکي العربي) کە سەرۆکەکەی (أکرم الحوراني) بوو. أکرم الحوراني خەڵکی شـاری
حماە بوو. لەساڵێ ١٩٣٦ ئەندامی پارتی نەتەوەیی سوری بوو و لەسـاڵی ١٩٣٨ لێـی
هاتـەدەرەوەو لەسـاڵی ١٩٥٠ پـارتی سۆسیالیسـتی سـوریای دامـەزراند. الحورانـی
کەسایەتیەکی سەیرو زیرەك بوو و لەناو ژیانی سیاسی سوریا چەند ڕۆڵێکـی گـەورەی
بینیبو: لەساڵێ ١٩٥٤ سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانی سوری بوو و جێگـری کۆمـاری
عەرەبی یەگرتوبو لەسەردەمی یەکێتی لەگەڵ میسردا. جگە لەوەش چـەند پۆسـتێکی
وزاری جۆراوجۆری داگیر کردبوو. بەشێوەیەکی گشتی الحورانی دادەنـرێ بەلێـهاتوترین
پیاوی سیاسی عەرەبو گرنگترین کەسایەتی سوریای پاش جەنگی جیـهانی دووەم(٣٢).
پارتەکەی،پارتی سۆسیالیستی عەرەبی هەروەکو ناوەکەی ئاماژەی پێ دەکات هەڵگری
دروشمی سۆسیالیزم بوو و خەباتی دەکرد بۆ ڕزگارکردنی جیهانی جووتیار(٣٣). پاش ئەم
یەکبونە، پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست بوو بەهەڵگری دوروشمی: نەسـیۆنالیزمو
سۆسیالیزمو خەباتی دەکرد بۆ یەکێتی ولاَتە عەرەبیەکان لەژێر دروشمـی"أمـة عربيـة
واحدة ذات رسالة خالدة" و بۆ ئەم مەبەستە لەساڵێ ١٩٥٤ سـەرکردایەتی نەتـەوەیی
(القیادة القومیة)ی دامەزراند. هەتاساڵی ١٩٥٨ سەرکردایەتی نەتـەوەیی پێکـهاتبو
لە: (میشیل عفلق ،صلاح الدین البیطار، أکرم الحوراني ) لەسوریا، (عبدالله نعـواس

وعبدالله الريماوي) لەئەردەن، (فؤاد الركابي) لەعيراق، (علي جبر) لەلوبنان. هەروەها هەوڵی دا کە لەزۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان لق بکاتەوە. بەڵام لەعیراق و ئەردەن و لبنان توانی زووتر لقی خۆی بکاتەوە. بۆنمونە ئەو خویندکارانەی کە لەزانستگای دیمەشق بوون توانیان گەرای رێکخراوی بەعسی لەئەردەن دابنێن و هەندێ لەگەنجی ئەردەنی رابکێشن. لەلوبنان پاش پاشەکشەی فەرەنسیەکان و وەرگرتنی سەربەخۆیی، بەعس دەستی کرد بەچالاکی لەنێوان خوێندکاران. هەندێ لەوسوریە عەرەبانەی کە لەزانستگای ئەمریکی لەساڵی ١٩٤٧ دەیان خوێندو هەندێ لەوانەی کە لەزانستگای دیمەشق خوێندنیان تەواوکردبوو، توانیان چەندشانەیەك دابنێن لەبەیروت و تەرابلس و صەیداو بەعلبەك و نبتیە..هتد.

ئەو سەردەمە پارتی بەعس ئەندامی زۆر نەبوو زۆربەی ئەندامانی پێك هاتبون لەخوێندکارو رۆشنبیرو رێژەی کرێکارو جوتیار زۆر لاواز بوو تیایدا تەنها لەشاری حماە نەبێ کە بەهۆی پارتەکەی الحوراني خەڵکێکی زۆری جوتیارو زەحمەتکێشی راکێشابو. یەکگرتن لەگەڵ پارتی سۆسیالیستی عەرەبی لەدوو لاوە سودی بەخشییە پارتی بەعس: یەکەمیان بریتی بوو لەراکێشانی جوتیارو زەحمەتکێشان و، دوومیان یارمەتی بەعسی دا کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی گرنگی بەسیلکی سەربازیی بدات.

لەوانەیە سەرنەکەوتن لەجەنگی هەڵبژاردن وای لەپارتی بەعس کردبێ کە ئیتر بایەخێکی زۆر بەسیلکی عەسکەری بدات و هەوڵ بدات جێگەی ئەندامانی خۆی تیادا بکاتەوە تا لغاوی دەسەلات وەربگرێ. ئەوەی راستی بێت پارتی بەعس هەر لەدامەزراندنیەوە نەیتوانیوە خەڵکێکی زۆر لەخۆی کۆبکاتەوەو بەشێوەیەك یان بەشێوەیەکی تر لەتەنگژەیەکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی قوڵدا ژیاوە. جگە لەسەرنەکەوتنی سکرتێرە گشتیەکەی، میشیل عەفلەق، لەپرۆسەی هەڵبژاردن، زۆر لەئەندامە سەرەکیەکانی وازیان لەپارتەکە هێنا: بۆنمونە أکرم الحوراني لەساڵێ ١٩٦٢ وازی هێناو (جلال السيد و صلاح الدين البيطار) لەساڵی ١٩٥٥ خۆیان کێشایەوە. هەروەها هەموو هەوڵەکانیان بۆ یەکێتی لەگەڵ میسر لەساڵی ١٩٥٦و١٩٥٨ [٣٤].

بەفیرۆ چووو لەکۆتایدا بەعس لەلایەن جمال عەبدولناسرەوە بەفاشیەت لەقەڵەم دراو هەروەها سەرکەوتنی لەمەسەلەی یەکێتی نێوان سوریاو عیراقو میسر بەدەست نەهێنا.

ئەوە دەمێنێتەوە بوترێ کەبەعس لەعیراقدا هەر لەدامەزراندنیەوە ویستویەتی بە رکەبەرایەتیو دروشمی توندڕەو دەسەڵات بگرێتە دەستو ئامرازی دیموکراسی ڕەت بکاتەوەو دامەزرێنەرەکەی، میشیل عەفلەق، پاش ئەو هەموو شکست هێنانە هەوڵی داوە بەراستەوخۆیی توندو تیژی بکات بەئامرازێکی شەرعی بۆگۆڕانی کۆمەڵایەتیو سیاسی. میشیل عەفلەق کەکاریگەریەکی بنەڕەتیی هەبوو لەسەر ئاڕاستەی بەعس، زۆریش تەوژمی خۆی هەبوو بۆ سەر بەعسی عیراقی بەتایبەتی بۆ سەر سەدام حسێنو پاش هەڵبژاردنی بەسکرتێری گشتی بەعس لەساڵی١٩٤٧ دانراوە بەپاڵەوانی ناسیۆنالیزمی عەرەبیو جۆشی سەدام حسینی خرۆش کردبوو لەمەسەلەی پەیامی تایبەتی نەتەوەی عەرەب وەکو لەبەشەکانی داهاتودا بۆمان دەردەکەوێ.

کودەتاکەی تەمموزی ١٩٦٨ بۆنەیەکی چاکی دروست کرد بۆ ئەوەی عەفلەق زۆر بەڕیزەوە وەك "مارکسی" عیراقییەکان تەماشا بکرێ لەلایەن بەعسی عیراقەوە. بەتایبەتی لەساڵانی حەفتاو سەرەتای هەشتاکان لەلایەن ڕۆشنبیرو پیاوی سیاسی عیراق لەهەموو شوێنیکدا باس دەکرا. لەڕۆژنامەکاندا، لەڕادیۆو تەلەفزیۆندا دەخرایە ڕوو. لەناو کتێبو گۆڤارو بلاّوکارەکانی پارتی بەعسی عیراق، خیتابو نووسینەکانی بوبوون بەیاسایەکی هاوبەشی فەیلەسوفو کۆمەڵناسو سیاسەتمەدارانو پسپۆری مێژووی بیروباوڕ. تاساڵی مردنی لەساڵی ١٩٨٩ لەنهۆمی دووەمی بیناکەی سەرکردایەتی نەتەوەیی پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست، شوقەیەك دابین کرابوو بۆ "باوکی دامەزرێنەر" میشیل عەفلەق.

فوئاد مەتەر، ڕۆژنامەنوسی بەعسیو نووسەری ژیانی سەدام حسین بەم شێوەیەی خوارەوە وەسفی سەردانی بەعسیەکان دەکات بۆ شوێنی دانیشتنی عەفلەق: "هەموو بەعسیەك کە دێت بۆ پایتەختی عیراق سەردانی دامەزرێنەری حیزب دەکات بۆ

سلاوکردن لێی(. . .). سەرکردە عیراقیەکان سەردانی دەکەن بۆ ئەوەی دەورپشتی سەرکردە مێژووییەکەیان بدەن‌و ئەویش هەست بکات بەگرنگی ئەو ئامۆژگاریانەی کە پێشکەشیانی دەکات"[٣٥]. سەدام حوسەینیش دانی دەنا بەگرنگی میشێل عەفلق کاتێك کە باسی خۆی‌و ڕۆحی" شۆڕش"ی دەکرد لەعیراق [٣٦].

## پارتی بەعسی عەرەبی لەعیراقدا

لقی عیراقی حیزبی بەعس لەساڵی ١٩٥٢ لەسەر ئامۆژگاریەکانی میشێل عەفلەق دامەزراو (فؤاد الركابي) بوو بەیەکەم سکرتێری گشتی. (فؤاد الركابي) ئەندازیارێکی شیعی خەڵکی ناسریە بوو. لەحکومەتی (عبدالكريم قاسم)دا بوو بوو بەوەزیری بیناسازی‌و دوایش بەوەزیری دەوڵەت (١٩٥٩-١٩٥٩). پاش ئەوەی کە لەساڵی ١٩٥٩ ڕێکخراوی بەعسی بەجێهێشت، چەند جارێك خرایە بەندیخانەو دوایش لەنۆقەمبەری ساڵی ١٩٧١ لەلایەن ئەمنی بەعسیەوە کوژرا[٣٧].

لە دەورو بەری ساڵانی ١٩٥٢ حیزبی بەعس ئەوەندە نەناسرابوو لە سەر گۆڕەپانی سیاسی و ئەندامانی لەپەنجا ئەندام تێنەدەپەڕین‌و ئەم ئەندامانەش بەهۆی پەیوەندی خێزانی‌و برادەرایەتی لەگەڵ یەکدا کاریان دەکرد بۆ هۆیەکی ئایدیۆلۆژی. ئەوەی ڕاستی بێت، بەرپرسی حیزب سەرپەرشتی ڕێکخراوێکی دەکرد کەپێکهاتبو لەخزم‌و کەس‌و کارو برادەری خوێندنگە. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین کە یەکەم ڕێکخراوی بەعسی بەتەواوی پێکهاتبو لەخەڵکی شیعەو کاتێك (فؤاد الركابي) حیزبی بەجێهێشت، زۆر لەئەندامان وازیان هێنا لەچالاکی حیزبی.

پاش چەند ساڵێك، سەرۆکایەتی بەعس کەوتە ژێردەستی سوننیەکان. لەساڵی ١٩٦٨ تا ساڵی ١٩٧٧ ئەندامانی سەرۆکایەتی حیزب‌و ئەوانەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش تقریبەن پێکهاتبون لەسونییەکان. تەنانەت لەساڵی ١٩٧٧ەوە چوار خەڵکی شیعە توانیان بن بەئەندامی ئەم ئەنجومەنە[٣٨]. لەناو ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی کە عەقڵیەتی خێڵەکی یان سیستمی عەسەبیە بەسەریا زاڵە، ئەوەی کە

گرنگه پەیوەندی خزمو کەس‌وکارە[٣٩]. لەساڵی ١٩٦٨ەوە عیراق لەڕاستیدا حوکم کراوە لەلایەن پەیوەندیە عەسەبیەکانی تکریت کە بەشێوەیەکی فراوان دانرابوون لەناو ڕێکخراوی حیزبو شوێنی بەرپرسێتی دەزگاکانی دەوڵەتو ئۆرگانە نهێنییەکانو پۆلیسی سیاسی[٤٠].

هەر چۆنێك بێت، لەساڵی ١٩٥٥ بەپێی تۆمارگەی پۆلیسی عیراقی، ئەندامانی حیزبی بەعسی بریتی بوون لە٢٨٩ ئەندامو ئەو سەردەمەی کە دوابەدوای کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسمەوە هات لە١٤ تەموزی ١٩٥٨ دژی دەسەڵاتی پادشایەتی، ڕێگەی پاك کردەوە بۆ حیزبی بەعس کە ٣٠٠ ئەندامی ئەکتیف وەربگرێ لەناو ڕیزەکانی خۆی[٤١] و ٢٠٠ لایەنگیرو ١٢٠٠ ئەندامی (منظم)و ١٠٠٠٠ خەڵکی نامونەزەم لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە[٤٢].

دەتوانرێ بوترێ کە لەسەر ئاستی ژمارەیی، حیزبی بەعس ئەو گرنگیەی نەبوو لەچاو ئەو گروپە سیاسیانەی کە لەمەڕ شانۆی سیاسی کاریان دەکرد. بۆ نمونە پارتی کۆمونیست کە لەساڵی ١٩٣٤ بەشێوەیەکی نهێنی دامەزرابوو، لەنێوان ١٩٤١و ١٩٥٨ ڕەگی خۆی باش داکوتیبوو بەڕاستی کاریگەریەکی بەرچاوی هەبوو بۆ سەر ڕێژەیەکی فراوان لەهاووڵاتیانی عیراقیو بەتایبەتی لەنێوان کوردو جوتیارو کرێکارو خوێندکارانەوە. ساڵێك پاش کەوتنی پادشایەتی، حیزبی کۆمۆنیست گەیشتبوە لوتکەی چالاکیەکانیو زیاتر لە٢٥,٠٠٠ ئەندامی چالاکی هەبوو، هەروەها پتر لەنیو ملیۆن لایەنگیرانی هەبوو، جگە لەوهێزەی کە هەیبو لەناو ڕێکخراوەکانی وەك یەکیەتی ئافرەتانو سەندیکاو یەکیەتی جوتیارانو ڕێکخراوەکانی لاوان[٤٣]. هەروەها هێزی سیاسی دیکەش ڕۆڵی خۆیان هەبوو، وەك حیزبی سەربەخۆیی (حزب الاستقلال)و حیزبی نیشتمانی دیموکراتی (حزب الوطني الديموقراطي).

شایستەی ئاماژەیە، کەوتنی پادشایەتی ڕێگەی پاك کردەوە بۆ ئەوەی کەسەرجەم حیزبە سیاسیەکان کۆبنەوە بەدەوری عەبدولکەریم قاسمداو ڕژێمی کۆماریی‌و کەسایەتی عەبدولکەریم قاسم ببینن وەك هێزێکی ژیاوو ئامرازێکی پێویست بۆ

خەبات دژی کۆلۆنیالیزم‌و ئیمپریالیزم. بۆ نمونـــە ، حـیزبی کۆمۆنیسـتی عـیراقی کـە حکومـەتی قاسمی پێناسە دەکرد وەك حکومـەتێکی دیموکراتـی بۆرجـوازی، ئومێـدەوار بوو کە پەیوەندیەکی پتەو دروست ببێ لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت‌و هاوکـاری دروسـت بکـات دژی سـەرمایە داری‌و ئیمپریـالیزمی ئـەمریکی. هـەروەها ، پـارتی بـەعس‌و ناسیۆنالیسـتەکانیش بـەلای خۆیانـەوە ، خسـتنی دەسـەلاتی پادشایەتی سـەر بـە کۆلۆنیالیزمیان دادەنا بەرێگەیەك بـەرەو یەکیـەتی عـەرەب. دەزانـرێ کـە ئامـانجی سەرجەم حیزبە سیاسیە عیراقیەکان کەپشتگیریان دەکرد لەحکومەتی قاسم‌و لـەدەوری بەرەی یەکیەتی نیشتمانی کۆبوبونەوە ، بنیادنانی سیستمێکی دیموکراسـی نـەبوو کـە بتوانێ ئازادی تاکەکـەس‌و دیموکراسـی سیاسـی پیـادە دەکـات. بـۆ سـەرجەم حیزبـە سیاسیەکان ئامانجی پێشینەیی بریتی بوو لەئاراسـتەکردنی وزەی سیاسـی حکومـەت بەرەو خەبات دژی ئیمپریالیزم. بۆ هەندێکیان، بـۆ نمونـە ، بـۆ (حـیزبی کۆمۆنیسـتی عیراقی) ، بریتی بوو لەهێشـتنەوەی یەکیـەتی عـیراق‌و هاوکـاری لەگـەڵ یەکیـەتی سۆڤیەت. بۆ حیزبی بـەعس‌و نەسیۆنالیسـتەکانیش بریتـی بـوو لەخـەبات بـۆ سـەر بەخۆیی‌و یەکیەتی عەرەب. خەبات دژی ئیمپریالیزم ئامانجی سەرجەم حیزبەکان بـوو. ئەوەی (حیزبی کۆمۆنیست‌و حیزبی دیموکراتی نیشتمانی) بریتی بـو لـە خـەبات بـۆ عیراقیەت‌و بۆ (حـیزبی بـەعس‌و اسـتقلال، هەسـتی یەکیـەتی عـەرەب تێکـەڵ بـە بەنەسـیۆنالیزمێکی بـەجۆش پێـش ئـەو خەباتـە دەهـات کـە ڕێـز لـەئازادی تـاك‌و دیموکراسی بگرێت. هیچ سەرسوڕمانی تێدا نییـە کـە عـیراقی کۆمـاریی لەراسـتیدا فیزیۆنۆمی دیکۆتۆمی عیراقی سالآنی ١٩٣٠ دووبارە دەکردەوە: حـیزبی کۆمۆنیسـت‌و حیزبی دیموکراسی نیشتمانی کە ڕەنگدانـەوەی نوێـی گروپـی ئـەهالییان پێکدەهێنـا لەلایەکەوەو حیزبی بەعس‌و استقلال کەئەوەی رەشید عالی گەیلانیان دروسـت دەکـرد لەلایەکی دیکەوە. بەم بۆنەیەوە دەتوانرێ پرسیارێك بکرێ: چۆن هەڵوێستی وا جیاوازو دژاو دژ دەیانتوانی پێکەوە بەردەوام بـن‌و بنچینـەی تـەبایی (وفـاق) دروسـت بکـەن

بەدەوری رژێمی کۆماریی‌و سەرۆك قاسم بەبێ ئەوەی لەپڕ توندوتیژی ئەنجام نەدەن؟ بــا هەوەڵ بدەین ئەم خاڵە روون بکەینەوە.

ساڵێك پاش هاتنەکایەی رژێمی کۆماریی‌و ئەو هیوایەی کەعیراقیەکان هــەیان بــوو پێیەوە، شانۆی سیاسی عیراق بــوو بــەدوو کــەرتی دژ بەیــەك: عەبدولکــەریم قاسم‌و کۆمۆنیستەکان‌و لایەنگیرەکانیان لەلایەکەوە، بەعسی‌و نەسۆنالیست‌و لایەنگیرەکانیان لەلایەکی دیکەوە. لەنێوان بەعس‌و نەسیۆنالیستەکان کە داوای ئیمزاکردنی پەیمانێکی سەربازیان دەکرد لەگــەڵ میســری ناســری لــەپێناوی بەدیــهێنانی یەکیــەتی عــەرەب بــەزوترین کــات‌و کۆمۆنیســتەکان کەکێشــەی یەکیــەتی عــەرەبیان دەخســـتە لاوەو پێشنیازی چارەسەرکردنی کێشەی ئابوری‌و یەکیەتی عیراقیان دەکــرد، عەبدولکــەریم قاسم وردە وردە دەبوە ئەکتەرێك کە بەرنگاری هەموو هەوڵدانێکی دەکرد کە دەیویست رێگە لەبەردەوامی ئەو شۆڕشە بگرێ کەخۆی خاوەنی سەرەکی بوو. عەبدولکەریم قاسم مرۆڤێکی سەربازیی بوو ئینتمای هیچ حزبێکی سیاسی نــەبوو. لــەباوکێکی عــەرەبی سونني‌و دایکێکی کوردی شیعی هاتبوە دنیاوە لەگــەڕەکی قەنبــەر عــەلی لەبــەغداو دانیشتوانی ئەم گەڕەکەش بریتــی بــوون لەتێکەڵیــەك لەمیللــەت‌و ئــایینی جیاجیــا (شیعە، ســونني، جولەکــە، دیــاني، عــەرەب، کــورد و تــورك). عەبدولکــەریم قاسم کاریگەری ئەم ژینگە کۆمەڵایەتیەی زۆر لەسەر بو و گشت ژیانی منداڵی لە ناو ئــەم ژینگەیــە بردەســەر. کەشــی خــێزاني‌و کۆمەڵایــەتی، ســەرۆك قــاسمی دوور خســـتەوە لەرۆحێکی داخراو بەرامبەر ئەوانەی کە جیاواز بوون لێی‌و ئەوانــەی کــە بــیروبۆچونی جیاوازیان هەبوو. هەرچۆنێك بێت، قاسم خوێندنی سەرەتایی‌و دواناوەندی تەواو کــردو بوو بەمامۆســتا لەخوێندگەیــەکی ســەرەتایی لەدیوانییــە لــەنێوان ١٩٣١و ١٩٣٢ و راهاتبو لەگەڵ ژینگەی قوتابخانەکەو جیاوازی ئاییني‌و مەزهەبی کێشەی بــۆ دروســت نەدەکرد. ئەوە راستە کەکاتێك خوێندنی ئــەکادیمی ســەربازی تــەواو کــرد لەبــەغداو دوایش شوێنی گرنگی داگیرکرد لەهەرەمی سەربازی، عەبدولکــەریم قاســم هاوبەشــی کرد لەبزووتنەوەی رەشید عالی گەیلانی سەر بەنازیەکان، بەڵام بەهیچ شێوەیەك خــۆی

نەخستە ناوگێژاوی ئایدیۆلۆژی یان عەرەبیەت. دەتوانین بڵێین کەزیاتر کاریگەری تەیاری سیاسی ئیسلامی بەسەرەوە بوو وئاستی رۆشنبیری زیاتر ئاڕاستەی دەکرد بەرەو نەسیۆنالیزمێکی عیراقی نەك بەرەو نەسیۆنالیزمی پان عەرەبی (٤٤)، بەلام لەهەمان کاتیشدا پێویستی هاوکاری لەگەڵ ولاتە عەرەبیەکان پشت گوێ نەدەخست.

شایستەی وەبیرهێنانەوەیە کە لەو ماوەیەی کەحوکمی عیراقی کرد (١٩٥٨-١٩٦٣)، عەبدولکەریم قاسم نەیتوانی بەلانسێك بدۆزێتەوە لەنێوان رەهەندە زێدرەوەکانی (ئەوپەڕەکانی) حیزبە سیاسیە عیراقیەکان. بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لەتەنیاییو ئینعزالی (انعزال) سیاسیدا دەژیا. میولی بۆ چەپی عیراقیو پەیوەندی شەخسی بە ئەفسەرە کۆمۆنیستەکان وایان لێ دەکرد کە خۆشەویستیان رابکێشێ بەلام بەبێ ئەوەی تەنازولیان بۆبکات. دەبێ بوترێ کە سەرەڕای راونانو بەگژا چونیان، کۆمۆنیستەکان هەمیشە ئومێدیان هەبوو بۆ هاوکاریەکی فراوانترو پتەوتر لەگەڵیدا. دەشبێ تیشك بخرێتە سەر ئەوەش کە بەرامبەر نەسیۆنالیزمی هێرشبەری بەعسیەکانو نەتەوەییەکان، عەبدولکەریم قاسم نەیدەتوانی پشت نەبەستێ بەهەندێ ئێلێمێنتی چەپی عیراقی. هەر بە راستی، سێ مانگ پاش گرتنە دەستی دەسەلات، دژایەتیو ناحەزی کەوتە نێوان بەعسیەکانو نەسیۆنالیستەکانو ئەمەش دەستی کرد بەخراپ کردنی کەشی سیاسیو ئەم قەیرانەش کۆتایی پێ نەهات تاکەوتنی سەرۆك لەسالی ١٩٦٣. باهەوڵ بدەین ئەمە تێبگەین.

کاتێك کەیەکەم حەقیبەی وەزاری کۆماری عیراقی دروست کرد، عەبدولکەریم قاسم، عەبدولسەلام عارفی دانا بە جێگری سەرۆك وەزیرانو وەزیری ناوخۆو جێگری سەرۆك هێزی سوپا. یەکەم ئەنجومەنی وەزیران پێکهات لەکۆمەلێك لەئەندامانی حیزبە سیاسیەکان: پارتی نیشتمانی دیموکراسی دوو وەزارەتی وەرگرت: وەزارەتی دارایىو وەزارەتی کشتوکاڵ، پارتی سەربەخۆیی وەزارەتی تەوجیهی نیشتمانی وەرگرتو حیزبی بەعس وەزارەتی ئیعماری وەرگرت. حیزبی کۆمۆنیست نوێنەرایەتی وەزاری نەبوو. باقی

وەزارەتـەکانی دیکـە بەسـەر بـرادەرو نزیکـەکانی قاسـم لەئەفسـەری لەشـکر دابەشکران(٤٥).

عەبدولسەلام عارف کێ بوو ؟ عبدالسلام هـەڤاڵو بـرادەری قاسـم بـوو لەخـەباتی سیاسیو رۆڵێکی زۆر گرنگی هـەبوو لـەڕووخاندنی دەسـەڵاتی پادشـایەتی. لـەباوكو دایکێکی عەرەبی سوننی هاتبوە دنیاوە لەگەڕەکی کەرخ کە زۆرینەی تـەواوی بریتـی بوو لەعەرەبە سوننیەکان.

عەبدولسەلام عارف نەسیۆنالیستێکی فەناتیك بوو. پـاش تـەواو کردنـی خوێندنـی سەربازیی، بوو بەئەفسەر لەسوپای عیراقی. بەبیست ساڵی دەسـتی کـرد بەخۆخـەریك کردن لەگەڵ ژیانی سیاسیداو هەروەها هاوبەشی کرد لەبزووتنەوەکـەی رەشـید عـالی گەیلانیو دوایش چوە نـاو رێکخـراوی ئەفسـەرە ئازادەکـان کـە عەبدولکـەریم قاسـم سەرۆکی کۆمیتەی سەرکردایەتی بوو. رێکخراوی ئەفسەرە ئازادەکـان لەسـاڵی ١٩٥٠ دامەزرابوو ئامانجەکەی بریتی بوو لـەڕوخاندنی دەسـەڵاتی پادشـایەتیو خـەبات دژی کۆلۆنیـالیزم. ئەندامـەکانی پێکـهاتبون لەچـەند نەسیۆنالیسـتێکی پـان عـەرەبو نەسیۆنالیسـتی ئاسـایی(٤٦). هەرچـەندە هەلۆێسـتێکی باشـی نـەبوو بەرامبـەر بەعسیەکان، لەگەڵ ئەوەشدا عەبدولسەلام عارف هەمان بیرو بۆچونی ئەوانی هـەبوو. زیاتر لەوەش، عەبدولسەلام عـارف ناسـرابوو بـۆ بیروبۆچونـە رەگـەز پەرسـتیەکانی. رۆژێك، پێـش کودەتاکـە بەئەفسـەرێکی وتبـوو: سـبەینێ شۆڕشـە، سـێ ئامانجمـان لەبەرچاوە: لەناوبردنی دیانیەکانو موسڵمانە شیعەکانو کوردەکان(٤٧).

عەبدولسەلام عارف نەسیۆنالیستێکی ناسری بـوو وچـەند رۆژێـك پـاش کودەتاکـە دەستی کرد بە بەرزکردنەوەی بەیاغی یەکیەتی لەگەڵ کۆماری عـەرەبی یـەکگروتوی میسر. بەم بۆنەیەوە دەستی کرد بەگەڕان لەناوچە جیاجیاکـانی عـیراقو دانـی وتـاری بەجۆش لەپێناوی پەیداکردنی شەعبیەت لەنێوان جەماوەردا(٤٨). ئەم کارانە بونە هۆی ناکۆکیەکی زۆر لەگـەڵ عەبدولکـەریم قـاسمداو پێنـج لـەوەزیرە نەسیۆنالیسـتیەکان استقالەیان کردو پاش ئەوانیش (فؤاد الرکابی) وازی هێنا لەبەرپرسـێتی وەزاری. بـەم

شێوەیە کۆمەڵگای سیاسی عیراقی بوو بەدوو بەشەوە: لەلایەکەوە ئەوانەی کە بانگەشەیان دەکرد بۆ یەکیەتی عەرەب لەنەسیۆنالیستو بەعسیەکانو لەلایەکی دیکەوە ئەوانەی دژ بەم یەکیەتیە بوون کە بریتی بوون لە عەبدولکەریم قاسمو کۆمۆنیستەکان و لایەنگیرانیان(٤٩). دوومانگی پێ نەچو، واتا لەسێپتەمبەری هەمان ساڵ عەبدولسەلام عارف لابرا لەوەزیفەی سەربازییو وەزاری کاتێك لەدێسەمبەر عەبدولسەلام تۆمەتی پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ (جمال عبدالناصر)و محاوەلەی کودەتای خرایە سەر، بەعسیەکان لەسەر زمانی رۆژنامەکەیان "الجمهورية" دەنگیان بەرزکردەوەو عارفیان مەدح کرد وەك داکۆکیکەری مەسەلەی نەتەوەیی عەرەب. لەراستیدا رۆژنامەی بەعسی "الجمهورية" خاوەنەکەی عەبدولسەلام عارف خۆی بوو و سەرکردایەتی ئەم رۆژنامەیەش کە ئەو کاتانە دروشمی ((یەکێتی، ئازادی، سۆسیالیزمی) (وحدة، حرية، اشتراكية) هەڵگرتبو، درابوە دەستی یەکێك لەبەعسیەکان بەناوی (سعدون حمادي)(٥٠). دەبێ بوترێ کە "الجمهورية" وتارەکانی عارفو وێنەی سکرتێری گشتی حیزبی بەعس، (فؤاد الركابي) لەیەکەم لاپەڕە بڵاودەکردەوەو دابەشی کرد لەناو بنکە سەربازییو شارەکانی عیراقدا(٥١).

شایستەی وەبیرهێنانەوەشە کە عەبدولکەریم قاسم لەلایەکەوە نەیهێشت بریاری دادگا لەسەر هەڵواسینی عارف راپەڕێنرێ، بەڵام لەلایەکی ترەوە کەوتە راونانی نەسیۆنالستە عەرەبەکان. سزادانی بەعسیو ناسیۆنالیستەکان بەباشی گەڕایەوە بۆ حیزبی کۆمۆنیست کە ڕاستەوخۆ پشتگیری کرد لەسەرۆکی کۆمارو سیاسەتەکەی. ئەنجامی ئەم بارودۆخە رێگەی پاککردەوە، بۆ ئەوەی کە بەعسیەکان بەنهێنی کاری سیاسی خۆیان بکەنو دەست بکەن بەهێرش بردنە سەر کۆمونیستەکان. تەشەسەندنی ئەم توندو تیژیە بو بەهۆی ئەوەی کەشەقامەکانی بەغدا ببن بەگۆڕەپانی دوژمنایەتیو شەڕ لەنێوان بەعسیەکانو کۆمۆنیستەکان. لەساڵی ١٩٦١ کۆمۆنیستەکان ئاشکرایان کرد کە٢٨٦ ئەندامو لایەنگریان لێ کوژران لەلایەن بەعسیەکانو نەسیۆنالیستەکانو کەهەزارەها خێزان ناچار کران ماڵەکانیان بەجێ بهێڵن(٥٢).

بێگومان، ئەم کوشتن‌و بڕینە تەنها سەرەتایەکی توندو تیژی بوو‌و دەبێ وەبیر بخرێتەوە کە لەمانگی ئاداری ساڵی ١٩٥٩، ناسریەکان‌و بەعسیەکان‌و نەسیۆنالیستەکان لەشاری موسڵ راپەڕینێکیان سازدا دژی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم. ئەو راپەڕینە کە بەناوی "ثورة الشواف" (٥٣) ناونرا لەلایەن قاسمەوە داشکێنرا، بەڵام ئەم سەرکەوتنەی قاسم کۆتایی نەهێنا بەپێکداچون‌و توندو تیژی لەنێوان کۆمونیست‌و بەعسی‌و نەسیۆنالیستیەکان. بەپێچەوانەوە فراوانتر بوون‌و تەشەنەیان سەند بۆ ناو کوردەکانیش کە زۆر دەترسان لەهەڵوێستی زیدڕەوی ناسیۆنالیستە عەرەبەکان و لەبەر ئەم هۆیە خۆیان خستە پاڵ لەشکر بۆ دامرکاندنی بزوتنەوەی نەسیۆنالیزمی زیدڕەو(٥٤). هەرچەندە کۆمونیستەکان کە بە ناچاری لەلایەن قاسمەوە پشت گیریان لێکراو گەیشتنە ئەوپەڕی هێزیان لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٥٩، بەڵام کاریگەریان وردە وردە دەستی کرد بەلاواز بوون لەقازانجی بەعس‌و نەسیۆنالیستەکان. شایستەی ئاماژەیە کەروداوە خوێناویەکانی شاری کەرکوك پەنجەی مۆریان خستە سەر سەرەتای کۆتایی تەوژمی کۆمۆنیست(٥٥).

شاری کەرکوك کە بەشێوەیەکی فراوان دەست کرا بەعەرەباندنی لەلایەن حکومەتی بەعسیەوە، دانیشتوانی پێکهاتبون لە زۆرینەیەکی کوردی‌و کەمایەتیەکی تورکمان‌و عەرەب‌و کلدانی‌و ئاشوری. دەبێ جەخت بخرێتە سەر ئەوەی کە تەنانەت پێش قاسمیش، سیاسەتی حکوماتی پێشوی پادشایەتی هیچ هەوڵیان نەدا بۆ کەم کردنەوەی دژایەتی لەنێوان پێکهاتەکانی کەرکوك. بەپێچەوانەوە، هەزری تواندنەوەی دانیشتوانە ناعەرەبەکان لەپێناوی خزمەتی ناسیۆنالیزمی عەرەبی، کە لەلایەن ناسیۆنالیستەکانی ناو حکومەتی پادشایەتی لایەنگیری دەکرا، پتر دوژمنایەتی پەرە پێ سەند لەنێوان ئەم پێکهاتانەو کەرکوکی کرد بەگۆڕەپانی توندو تیژی. روداوەکانی کەرکوك کە لەکاتی یەکەم یادی "شۆڕشی" ١٤ تموز سەریان هەڵدا، رەنگدانەوەی ئەو رق‌و کینە شاراوەیە بوون کە لەرابردوودا کڕو بێ دەنگ بوون لە نێوان کوردو تورکمانەکان کە لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە تاوانبار کرابون وەك "ناسیۆنالیستی

عوسمانی‌و ناپاك له‌خزمه‌تی توركیادا"(٥٦). له‌م بارو دۆخه‌دا، توركمانه‌كانیش بێ ده‌نگ نه‌مان و زوو به‌زوویی ده‌ستی تاوانیان راكێشا بۆیان‌و ئه‌وانیش تۆمه‌تی خیانه‌تیان خسته سه‌ریان. به‌م شێوه‌یه ئاهه‌نگی یه‌كه‌م یادی "شۆرش"و خۆپیشاندان له ناو شه‌قامه سه‌ره‌كیه‌كانی شاره‌كه بوو به‌رژاندنی خوێن‌و كوشتن‌و تالان كردنی ماڵه‌كان(٥٧).

ئه‌وه‌ی راستی بێت، به‌رامبه‌ر ئه‌م خوێن رشتنه، عه‌بدولكه‌ریم قاسم به‌ده‌ست به‌سراوی نه‌مایه‌وه‌و ده‌ستی كرد به‌پێشاندانی هه‌ڵوێستێكی ره‌ق دژ به‌كۆمۆنیستیه‌كان. زۆر له‌كۆمۆنیسته‌كان گیران‌و هه‌موو مانگی ته‌موزو ئاب هه‌ڵمه‌تی راونانی كۆمۆنیسته‌كان به‌رده‌وام بوو. چالاكیه‌كانی حیزبی شیوعی كۆنترۆڵ كران‌و رۆژنامه‌ی "اتحاد الشعب" له‌نزیكه‌وه چاودێری ده‌كراو ئه‌فسه‌ری سه‌ربازیی كه‌گومانی كۆمونیزم یان لایه‌نگیری كۆمونیزمیان لێ ده‌كرا گیران‌و خرانه به‌ندینخانه‌وه.

له‌م كه‌ش‌و هه‌وا خراپه‌دا، كۆمۆنیسته‌كان ناچار بوون بچنه ناو كاری نهێنیه‌وه‌و سه‌ره‌رای یاسای به‌ره‌واكردنی حیزبه سیاسیه‌كان له‌ساڵی ١٩٦٠، حیزبی كۆمۆنیست دانرا به‌حیزبێكی ده‌ره‌وه‌ی یاساو ئیجرائات دژیان به‌رده‌وام بوون هه‌تا كۆتایی رژێم. به‌ته‌نیاو ئینعزال بوون‌و لاواز، حیزبی كۆمۆنیست ئه‌مجاره‌یان ده‌بوو به‌رنگاری به‌عسیه‌كان بوایه كه له‌ساڵی ١٩٦٣ هاتنه سه‌ر حوكم. ده‌بێ ئه‌وه‌ش وه‌بیر بخرێته‌وه كه به‌عسیه‌كانیش وه‌ك كۆمۆنیسته‌كان رێگه‌ی نهێنیان هه‌ڵبژاردو له‌گه‌ڵ حیزبی سه‌ربه‌خۆیی‌و بزووتنه‌وه‌ی نه‌سیۆنالیستی عه‌ره‌ب (حركة القوميين العرب) یه‌كیان گرت له‌ناو به‌ره‌ی نه‌سیۆنالیستی عه‌ره‌ب و ئامانجی خۆیان جێگیركرد بۆ خستنی حكومه‌تی عه‌بدولكه‌ریم قاسم.

## یەکەم رژێمی بەعسی

لە٢٨ی شوباتی ١٩٦٣، حیزبی بەعس بەهاوکاری عەبدولسەلام عارفو هەندێ ئەفسەری ناسری، توانی کۆتایی بێنێ بەحکومەتی قاسم. یەکەم هەنگاوی عارف بریتی بوو لەتۆڵە سەندن لەکۆمۆنیستەکان. پاش ئەوەی لە٩ی شوبات بە هاوکاری بەعسیەکان عەبدولکەریم قاسمی ئیعدام کرد، ئەندامانی رێکخراوە میلیشیاکەی، "الحرس القومي"، رژانە ناو شەقامەکانی بەغدا بۆ ئەوەی دەست بکەن بە لەناوبردنی دوژمنە مێژوییکانیان. تەنانەت لەماوەی سێ رۆژدا هەزارەها خەڵك کوژران. بەگوێرەی لیستێکی تەواوو لەپێشدا ئامادەکراو[٥٨]، حەرەسی قەومی هەڵسا بەپشکنینی ماڵ بەماڵ بۆ دۆزینەوەو سزادانی کۆمۆنیستەکان. زۆر لەگۆڕەپانی وەرزشو هۆڵی سینەماو ماڵی خەڵکی کران بە بەندینخانەی کاتیو بارەگای حیزب[٥٩].

لەئێوارەی ٨ی شوبات بەیانێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش داوای لەبەعسیەکانو لایەنگیرانیان دەکرد "دوژمنەکانی گەل" لەناوبەرن: "لەبەر هۆی چەند هەوڵدانێکی بێ ئەنجامی کۆمۆنیستەکان- هاوبەش لەتاوانەکانی قاسم دوژمنی خودا- لەپێناوی ئاژاوەنانەوە لەریزەکانی میللەتو بێ رێزیان بۆ رێنماییو فەرمانە رەسمیەکان، دەسەڵات دەبەخشرێ بەسەرکردایەتی یەکە سەربازیەکانو حەرەسی قەومی، ئەو کەسانە لەناوبەرن کەئاشتی دەلەقێنن. بانگەشە دەکرێت بۆ رۆڵە سەروەرەکانی میللەت کەهاوکاری بکەن لەگەڵ بەرپرسیاران لەدانی زانیاری دژی ئەم موجریمانە بۆ ئەوەی لەناو ببرێن"[٦٠].

لەو دە رۆژەی کە دوا بەدوای کودەتاکەی بەعسدا هاتن، زۆر ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی لەسێدارەدرانو لەپێش هەموویانەوە سالم عادل، سکرتێری گشتی حیزب. لەیانزەی ئازاردا، ٢٥ ئەندام ئیعدام کران، لە٢٥ی مایس یانزەی دیکە ئیعدام کرانو ٢٨ی دیکە لە٢٣ی حوزەیران، چونکە هاوبەشیان کردبوو لەرووداوەکانی کەرکوكو لەسەرەتای مانگی تەموز، ١١ی دیکە چونکە هاوبەشیان کردبوو لەرووداوەکانی موسڵو ٢١یش لەکۆتایی مانگی تەمموز چونکە موئامەرەیان کردبوو

دژی حکومەت[٦١]. هەرچۆنێك بێت، لەو ماوە کورتەی حکومەتی بەعس، ٤٩ ئەندامی گرنگی کۆمۆنیست ئیعدام کران‌و حەوت هەزار فڕێ درانە بەندیخانەوە. هەندێ بەڵگەنامە جەخت دەخاتە سەرئەوەی کە قوربانیانی بەعس لەو نۆمانگەدا گەیشتنە دەهەزار[٦٢]. بێگومان، بەرگری کردن لە"شۆڕش" دژی "دوژمنەکانی گەل" درابوە دەستی حەرەسی قەومی کە لەساڵی ١٩٥٩ دامەزرابو و کە پێکهاتبوو لەلایەنگران‌و برادەرانی نزیکی حیزبی بەعس. بەچەند ووشەیەکی دوور لەسیاسەتەوە، دەتوانین بڵێین حەرەسی قەومی پێکهاتبوو لەخەڵکی خراپ‌و سەرجادەو دزو دەرەوەی یاسا([٦٣]. پێش کودەتاکە، سەرکردایەتی حەرەسی قەومی درابوو بە منذر المنداوي التكريتي، کە ئەفسەری هێزی ئاسمانی بوو، کە راستەوخۆ فەرمانی لەسکرتێری گشتی حیزبی بەعس، علی صالح السعدی[٦٤] وەردەگرت. حەننا بەتاتو بەم شێوەیەی خوارەوە توندوتیژی حەرەسی قەومی وەسف دەکات لەوماوەیەی کە بەعس حوکمی عیراقی کرد:

"نوسینگەی زانیاری تایبەتی حەرەسی قەومی بەتەنها١٠٤ کەسی ئیعدام کردبوو - لاشەی ٤٣ لەوئیعدام کراوانە ئاشکرا کران لەنێوان ١٩٦٣ -١٩٦٤ کە نێژرابوون لەگەرەکی (جزيرة والحصوة). لەژێر زەمینەکانی قصرالنهاية کەنوسینگەی گشتی بوو، هەمووجۆرە ئامێری ئەشکەنجەیەك دۆزراوەتەوە، وەك پەتی کارەبایی‌و پلایس‌و شیشی ئاسن کە بەندکراوەکانیان لەسەر دائەنیشان‌و مەکینەیەك کە هێشتا ئاسەواری ئەو پەنجانەی بەسەرەوە بوو کەبڕابوون. (هەروەها) ژمارەیەك لەپارچە پەڕۆی خوێناوی لەم لاولەولا لەسەر زەوی کەوتبون‌و پەڵەی خوێن بەسەر دیوارەکانەوە بوو"[٦٥].

ئەو قەسابخانەیەی کەحەرەسی قەومی نابویەوە لەنۆ مانگی حوکمی بەعسی، بەراستی سوك کردنێك بوو بۆ شەرەفی مرۆڤایەتی‌و ئەندامانی بەعس وایان لێهات کە"هەزارەها قوربانیان بەزیندویی بخەنە ژێر گلەوەو شوشەی بیرەو ویسکی فڕێ بدەنە سەر تەرمەکانیان‌و لەگەڵ نوسراوێك کە دەڵێ: دەخوێنەوە بەبۆنەی سەرکەوتنمان بەسەر ئەم کلکانە (الذيليين)"[٦٦]. ئەمە رەنگدانەوی جیهانبینی فەلسەفەی بەعسیە

که (لەبەشەکانی داهاتودا بۆنەمان دەبێ شی بکەینەوە) وا دەکات لەسکرتێری حیزبو سەرۆکی حکومەتی بەعس علی صالح السعدی بڵێ: "سەریان بڕن هەتا ئێسقان"[٦٧]. بەعسیەکی سوری دەگێڕێتەوە کە توندوتیژی دژی کۆمۆنیستەکان گەیشتە ئەو سنورەی کەکاتێك فەرمان درا بەئەفسەرێکی بەعس بۆ کوشتنی ١٢کۆمونیست، لەبەر چاوی کۆمەڵێك خەڵك وەڵامی دایەوە: "من ناچم بۆ ئیعدام کردنی ١٢، بەڵکو بۆ ئیعدام کردنی بەلایەنی کەمەوە پێنج سەد"[٦٨].

شایستەی باس کردنە، حەرەسی قەومی کە لەمانگی ئەپریلدا بووبە دەزگایەكو بەرەسمی خرایە ژێر سەرپەرشتی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش، بوو بەسیلاحێکی ترسناك لەناو دەستی حیزب. لەمانگی شوباتدا ژمارەی ئەندامەکانی پێکهاتبوو لەپێنج سەد، بەڵام پاش بەدەزگایی کردنی، ئەم ژمارەیە گەیشتە بیستویەك هەزارو لەمانگی ئابدا گەیشتە سیوچوارهەزار ئەندام[٦٩]. بەرامبەر ئارەزوی توندوتیژی منذرالمنداوي التكريتي لەلایەکەوەو، فراوان بوونی دەسەڵاتی سکرتێری گشتی حیزب لەناو سیستەمی پۆلیسو موخابەراتی نهێنی لەلایەکی دیکەوە، وەڵامی عەبدولسەلام عارفو ناسریەکان زۆر درەنگ نەهاتە کایەوە. دەبێ بوترێ کە ناسریەکان هەر چەندە کەمایەتیەك بوون لەناو حکومەتی بەعسیدا، بەڵام زۆر لایەنگریان هەبوو لەنێوان ئەفسەرەکانی لەشکردا. لەراستیشدا هەر لەرێگەی عەبدولسەلام عارفو ناسریەکانو ئەفسەرەکانی لەشکرەوە بوو کەبەعسیەکان توانیبویان رژێمی قاسم قلّپ بکەنەوە. بوونی بەعسیەکان لەناو لەشکردا لاوازبوو و نوێنەرایەتیان لەناو حکومەتو حەرەس قەومی بەس نەبوون بۆ ئەوەی بتوانن زامنی بەردەوامی دەسەڵات بکەن. زیاتر لەوەش، سکرتێری حیزبو بەعسیەکان ئەوەندە تینوی دەسەڵات بوون کە بەشێوەیەکی رەق بەرگریان دەکرد لەداخوازیەکانی عەبدولسەلام عارف سەبارەت بەدروست کردنی بەرەیەك کە بتوانێ هێزی ناسیۆنالیستەکان بگرێتەوەو سەبارەت بەسکاڵا دەربڕین دژی حەرەسی قەومی. بەکورتی ئەم دووبەرەکیەی نێوان عارفو ناسریەکان (کە لەلایەن لەشکرەوە نوێنەرایەتی دەکرا) و بەعسیەکان کۆتایی پێ نەهات هەتا کەوتنی ئەوانەی

يەکەم. لەنۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦٣ لەرێگەی کودەتایەکی دیکە، دەسەڵات گەڕایەوە دەستی ناسریەکانو بۆماوەی زیاتر لەچوارساڵ عەبدولسەلام عارفو براکەی، عەبدولرەحمان عارف، حوکمی عیراقیان کرد بەشێوەیەکی توندوتیژ هەتا دیسانەوە بەعسیەکان دەسەڵاتیان لەساڵی ١٩٦٨ گرتەوە دەست.

## دووەم رژێمی بەعسی

گەڕانەوەی حیزبی بەعس بۆسەر حوکم لەتەمووزی ١٩٦٨ ، بەردەوامیی بەخشی بەتوندوتیژیو بەکارهێنانی دەستی ئاسنین دژی هەموو تاکێك بیویستایە بەرەنگاری دەسەڵاتی بێتەوە. ئەو ژێر کەوتن و سەرنەکەوتنەی کە دوابەدوای نۆمانگ لەحوکم هات، بەعسی فێرکرد دەسەڵاتی رەهای خۆی بسەپێنێ:

١-پێویست بوو کە ئەو دەسەڵاتە بۆ خۆی گل بداتەوەو دابەشی نەکات لەگەڵ هیچ هێزێکی سیاسی دیکە: هاوپەیمانیەتی لەگەڵ ئێلێمێنتە ناسریەکانو ناسیۆنالیستەکان لەساڵی ١٩٦٣ زۆر کەوت لەسەری.

٢-لەبەر ئەوە، پێویست بوو کەپێچو پەنای سیاسی بەشێوەیەکی زانایانە بەکاربهێنایە بۆ خستنە لاوەی منافەسەکان.

٣-پێویست بوو لەشکری راکێشایە بۆلای خۆیو زیاتر لەپێشوو بەعسو لایەنگیرانی تێدا دابنایە.

٤-لەگەڵ لەناوبردنی هەرکەسێك کە بیویستایە دژی بوەستایەتەوە، پێویست بوو هەڵمەتێکی خەستی پروپاگەندەی دەست پێبکردایە دژی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنسێرڤەتیزم (کۆنەپەرستی) لەبەرژەوەندی "شۆرشی گەل".

٥-زۆر پێویست بوو کەرواڵەتێکی دیموکراسی پیشان بدایەو خۆی وەك هێزێك پیشانی میللەتی کورد بدایە کە دەیەوێ مەسەلەی کورد چارەسەر بکاتو بانگەشەی بۆ بنیادنانی بەرەیەکی نیشتمانی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز بکردایە، بەڵام لەژێر ویستو دەسەڵاتی خۆی.

٦-هەروەها پێویست بوو خۆی لەناو ڕێکخراوێکی پتەو ڕێکبخستایە کە توانای ئەوەی هەبوایە کاریگەری خۆی لەناو سەرجەم کۆمەڵی عیراقی فراوان بکات.

دەبێ هێڵ بەژێر ئەوەدا بهێنرێ کە کودەتاکەی ساڵی ١٩٦٨ تەنها کاری بەعسیەکان نەبوو. هەرچەندە ڕۆڵی بەعسیەکان سەرەکی بوو، بەڵام ئەفسەری لەشکرو کەسایەتی سەربەخۆش بەشێوەیەکی ئەکتیڤ هاوبەشیان تێدا کردبوو. لەهەمان ڕۆژی کودەتاکە، ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش، کە ئاراستەی سیاسی وڵاتەکەی گرتە دەست، پێکهاتبوو لەحەوت کەسایەتی کە چواریان بەعسی نەبوون. جگە لەئەحمەد حەسەن بەکر وەك سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش کە دووساڵ پێش ١٩٦٣هاتبوە ناو ڕێکخراوی بەعسیەوەو دوایی خۆی لێ کێشابوەو دیسانەوە هاتبوە ریزەوەو صالح مەهدی عەماش‌و حردان تکریتی) کە بەعسی بوون، عەبدولرەزاق نایف‌و ئیبراهیم عەبدولرەحمان داودو سەعدون غیدان‌و حەماد شەهاب) بەعسی نەبوون. هەروەها لەناو یەکەم پێکهاتەی وەزاری کە لەلایەن هەشت ئەفسەری نابەعسیەوەو پێنج ناسیۆنالیستی سەربەخۆو سێ کورد نوێنەرایەتی دەکرا ، تەنها دەکەسایەتی بەعسی بوون، واتا لەکۆی ٢٦ کەسایەتی سیاسیی، هەژدەی بەعسی نەبوون[٧٠]. یەکەم پێچ‌و پەنای سیاسی حیزبی بەعس بریتی بوو لەخستنەلاوەی دووکەسایەتی سەرەکی لەقلێپ کردنەوەی دەسەڵاتی عەبدولرەحمان عارف: عەبدولرەزاق نایف ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش‌و سەرۆك وەزیران و ئیبراهیم عەبدولرەحمان داود ئەندامی ئەنجومەن‌و وەزیری بەرگری. بێ گومان یەکەمیان لەلایەن کۆمەڵێك لەئەفسەر بە سەرۆکایەتی سەدام حوسەین گیرا وئیجبارکرا عیراق بەجێ بهێڵێ‌و لەساڵی ١٩٧٨ لە لەندەن کوژرا پاش ئەوەی لەساڵی ١٩٧٣ لەهەوڵێکی تری کوشتن ڕزگاری بوبوو. دووەمیان کاتێك کەسەردانێکی ئەردەنی کردبوو، داوای لێ کرا کەنەگەرێتەوە بۆ عیراق[٧١]. لەماوەی کەمتر لەدوو هەفتە سەرجەم وەزیرە نابەعسیەکان لابران‌و کەسایەتی بەعسی‌و لایەنگرانیان خرانە شوێنیان. لە ٣٠ تەمووز حیزبی بەعس کۆنترۆڵی تەواوی پەیدا کرد بەسەر پۆستە گرنگەکانی

دەزگاکانی دەوڵەتی عیراق: ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆکی کۆمار، لەهەمان کاتدا بوو بەسەرۆکی وەزیران و حردان التکریتی بوو بە وەزیری بەرگری و سەرۆکی هێزی هەوایی و صالح مەهدی عماش بووبە وەزیری ناوخۆو عەبدولکریم شێخلی وەزیری کاروباری دەرەوە.

دووەم هەنگاوی سیاسی بریتی بوو لەدانانی ئەفسەری بەعس و لایەنگیرانی حیزبی بەعسی لەناو پۆستە هەرە گرنگەکانی هەرەمی سەربازیی. پتر لە١١٧ ئەفسەری بەعسی کە لەپێشدا ئیستقالەیان دابو و یان کەژیانی سەربازیان بەجێ هێشتبوو، خرانەوە ناو ریزەکانی لەشکرو دووهەزار پیاوی سەربازی بەعسی گویزرانەوە بۆ شوێنە بایەخدارەکانی دەسەلاتی سەربازیی و مەدەنی و حەرەسی قەومی [٧٢]. بەتەنها چەند مانگێك، حیزبی بەعس توانی هێزی لەشکرو پۆلیس و موخابەرات بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی.

سێهەم هەنگاو بریتی بوو لەپرش و بڵاوکردنەوەی هەموو ئەگەرێکی هەرەشە بۆسەر دەسەلات، واتا لەناو بردنی هەموو ئەوانەی دژی "شۆرشی بەعسی" بوون. لەئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٦٨، ١٧ جولەکە دەستگیر کران بەتۆمەتی چونەوەیان بۆ ناوەندی جاسوسیەتی زایۆنی و بەدرێژی مانگی نۆڤەمبەر هەڵمەتی خەستی خستنە بەندیخانە بەردەوام بوو [٧٣]. لەمانگی دیسەمبەری هەمان ساڵ، مەحکەمەیەکی تایبەتی "شۆڕش" دروستکرا بۆ حوکمدانی "دوژمنانی گەل" پەنجاوسێ کەس ئیعدام کران [٧٤]. لەمانگی یەکی ساڵی ١٩٦٩چوارده کەس کەنیوەیان جولەکە بوون، بەتۆمەتی سیخوڕی بۆ ئیسرائیل ئیعدام کران. ئەمانە هێنرانە بەردەم کامێرەی تەلەفزیۆن و دوایش هەڵواسران لە "ساحة التحرير" لەبەغداو هاوولاتیانیش بانگ کران بۆئەوەی برۆن تەرمە هەڵواسراوەکانیان ببینن [٧٥].

دوابەدوای هەموو دەستگیر کردنێك یاخود خستنە بەندیخانەیەك یاخود ئیعدام کردنێك مەکینەی پڕوپاگەندەی بەعس دەکەوتە کار بۆ حوکم کردنی ئەو موئامەراتانەی کە لەلایەن "خائین" و "عەمیل" و "سیخوڕی" زایۆنزم و ئیمپریالیزم و

کۆنسێرڤەتیزم (کۆنە پەرست) دژی "شۆڕشی گەل" رادەپەڕێنران. هەروەك چۆن سالی ١٩٦٣ بانگەشە کرا بۆ میللەت کە "دوژمن بهارێ هەتا ئێسقان" یان "ناپاکەکان بکوژێ" یان "بیانسڕێتە لەبوون"[٧٦]، هەروەها لەدووەم ئەزموونی بەعسیشدا هەمان گوزارشتی توندوتیژیو هەمان کاری توندو تیژی راپەڕێنرا. لەهەلواسینە ترسناکەکانی مانگی یەك، صلاح عمر العلي التکریتي، وەزیری ئیعمارو ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش جاڕی دەدا.

"ئەی میللەتی گەورەی عیراق، ئەمڕۆ عیراق ئیتر ناپاكو سیخوڕ لەخۆناگرێت. ئەی ئێوەی زۆلی ئیسرائیل، ئەی ئێوەی ئیمپریالیزمی ئەمریکی، ئەی ئێوەی زایۆنی، باش گوێم لێ بگرن! ئێمە پیلانی ئێوە هەلدەمالین! ئێمە بەکرێ گیراوەکانتان سزا دەدەین! ئێمە سیخوڕەکانتان هەلدەواسین ئەگەر هەزارەهاش بن! (...) ئەی میللەتی گەورەی عیراق! ئەمە هێشتا دەست پێکردنێکە! سەرجەم گۆڕەپانە گەورەکانی عیراق پڕدەکرێن لەتەرمی ناپاکانو سیخوڕان! بەس چاوەڕوان بکەن"[٧٧]

لەهەمان کاتدا رادیۆی بەغدا کاتێك وەلامی رەخنەو نارەزایی جیهانی دەدایەوە، دەیگوت ئێمە سیخوڕمان هەلواسیوە، بەلام جولەکە عیسایان لەخاچ دا"[٧٨].

لەمانگی تەموزی سالی ١٩٦٩ سەرۆکی کۆمار (ئەحمەد حەسەن البکر) جاڕی دەداو دەیگوت: "گرنگە کەچینی شۆڕشگێڕ تۆڕی سیخوڕەکان بهارێ چونکە پەیوەندیەکی خەستیان لەگەل چەوسێنەرەکان (...) هەیە. ئەم لەناوبردنە هەروەها کەلکێکی ستراتیژی هەیە چونکە هاوبەشی دەکات لەو ئەرکانەی کەدەبێ بەجێ بهێنرێن لەپێناوی رزگارکردنی میللەتان (...) هەموو نەخشەیەك لەپێناوی سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، دەبێ هەر لەسەرەتاوە پێشبینی لەناوبردنی ئەم خراپەیە بکات کە بریتییە لەوانەی زانیاری بۆ دوژمن دەبەنو لەرێگەی پڕوپاگەندەیەکی بێ بناغە هاوبەشی دەکەن لەلاواز کردنی ورەی میللەت.."[٧٩].

لەوسالەدا ١٩٩ کۆمۆنیستی قیادەی مەرکەزی خرانە بەندیخانەوەو هەتا مردن ئەشکەنجە دران. عەزیر الحاج[٨٠]، سکرتێری گشتی حیزب کە نەیتوانی بەرامبەر

ئەشکەنجەبوەستێت، هێنرایە سەر تەلەفزیۆن بـۆ ئـەوەی "دانبنـێ بەتاوانـەکانیا دژی "شۆڕش" و لەبەردەم جەماوەر حزبەکەی خۆی تاوانبار بکاتو مەدحی حیزبی بـەعس بکات کە تەنها حزبی پێشکەوتنخوازی راستەقینەیە لە ولآتەکەدا [٨١]. مانگی پێنـج، کۆمەلێکی دیکـە حوکـم دران بەتۆمـەتی پـەیوەندی لەگـەڵ سـی ئـای ئـەی cia و عبدالرحمن عارف و ژمارەیەك لەوەزیرانی حکومەتی پێشوو بە بەکرێ گیراوی ئەمریکا تاوانبار کران [٨٢]. لەمانگی یەکی ١٩٧٠، رادیۆی عیراقی دەسـتی دەکـرد بـەدووبارە کردنەوەی ئەوەی کە پیلانێکی ئـێرانی ویسـتویەتی زیـان ببەخشـێ بـە "شـۆڕش" و چەندەها کەس خرانە بەندیخانەوەو چلو چواریان لێ ئیعدام کران [٨٣].

ئەم روداوانەو بێ گومـان روداوی دیکـەش کەلەگـەڵ هاتنـەوەی رژێمـی بەعسـیدا دەستیان پێکردو شـێوەی هـەوڵدان بـۆ هـاڕینی هـەموو ئۆپۆزیسـیۆنێکی سیاسـی، ئەوەمان پیشان دەدات کە تا چ رادەیەك حـیزبی بـەعس قەناعـەتی بەهەڵسـوکەوتو رەفتاری خۆی هەبوو. راپۆرتـی سیاسـی کۆنگـرەی هەشـتەمی حـیزبی بـەعس ئـەوە دەردەخات کە بەعس لەبەرئەوەی قەناعەتی بەوە هەبوو کەهەڵگری پەیامێکی نـەمرە "الرسالة الخالدة"و خاوەنی حەقیقەتی ڕەهایە، لەبەر ئـەوە دەبوایـە هـەموو کۆمـەڵی عیراقی لەگەڵیابێت. لەهەموو رستەیەکدا، لەهەموو لاپەڕەیەکداو لەهەموو بەشێکدا ئەم قەناعەتە دەخاتە روو و بەدڵنیاییەوە دەڵێ کـە ئـەرکی بەپەلـەی(زوو بـە زویـی) حیزبی شۆڕشگێڕ، جێگیرکردنو بەهێز کردنی دەسەڵاتە لەپێناو رزگار کردنـی عـیراق لەپیلانو هەوڵدانی روخێنەرو ئەو ئەرکە پڕە لـە گرفـتو ئـالۆزیی [٨٤]. بەشـێوازێکی راستەوخۆو سەرسوڕهێنەر دان بەوەدا دەنێ کە دۆخی سایکۆلۆژی ولآتەکـەو ئـەنجامی ئەزمونی(٨ ی شوباتی١٩٦٣) ئەوەی فـێرکرد کـە پاکتـاو کردنـی کۆنـە پەرسـتانو گومان لێکراوان ئێلێمێنتی گەندەڵو خائینەکانی لەشکرو مخابەراتی ئـەمنو شـوێنی حەساسی دەوڵەت کـارێکی وائاسـان نـەبوو [٨٥]. دان بەوەشـدا دەنـێ کـە لـەپێناوی لەناوبردنی رکەبەرەکانی، پێویستی دەکرد کە بەنەرمیو بێ هەڵپـەیی رەفتـار بکـات چونکە ئەو هەڵوێستە هەلێکی بەوکەسانە دەبەخشی کە رەفتاریان چاك بکەنەوەو وەك

هاوولاتی بەرپرس هەڵسوکەوت بکەن [٨٦]. گومانی تێدانییە ئەم نەرمیەی کە بەعس باسی لێ دەکرد پەیوەندی هەبوو بەو بارودۆخە ناسەقامگیرەی کەحیزب تیایدا دەژیا. لەساڵی١٩٦٨، پشتگیری ولات بۆ حیزبی بەعس زۆر لاواز بوو. بەگوێرەی بۆچونی بەعسیەکان، ئەندامانی ئەکتیڤی رێکخراوەکەیان لەپێنج هەزار تێپەری نەدەکرد [٨٧]. لەبەر ئەوە هەندێ "بارودۆخی بابەتی" و کێشەی کەمو کورِی لەکادێری بەعسی کەتوانایان هەبوایە شوێنی بەرپرسیێتی لەناو دەزگاکانی دەوڵەتو رێکخراوە میللیەکان وەرگرن، حیزبیان ناچار کرد پرۆگرامێکی پلە بەپلەیی(تدریجی) جێبەجێ بکات بۆ دانانی ئەندامانی خۆی لەپۆستە گرنگەکانی حکومەت[٨٨]. جگە لەمەش راپۆرتەکە جەخت دەخاتە سەر ئەوەش کەسەرەرای نارەزایی جیهانیی دژی کوشتنو برینی بەرچاو و رەخنەی خەست دژی شۆرشو گەل، حیزبی بەعس هیچ دوودلی نەکرد لەپاك کردنەوەی عیراق لەدوژمنانو بەرگری کردن دژی تۆری سیخورپی لەناو لەشکرو مخابەراتی ئەمنو ناوەندی حەساسی دەزگاکانی دەوڵەتو کۆمەڵی عێراقی[٨٩].

ئەم کورتە باسە لەسەر چەند مانگێکی حکومەتی بەعسی دوەم، دەیەوێ تەنها ئەوە دەربخات کەئەو توندوتیژیەی کە لەسەر ئاستی سایکۆلۆژیو ئەخلاقیو مادی رەواکراو ئەو هەڵمەتی پروپاگەندەیە کە بەدوایدا هات ، ئامانجێکی دوفاقەیی هەبوو:

١-هەوڵدان بۆ گرموڵەکردنی میللەت بەدەوری حیزبداو مسۆگەر کردنی سەقامگیریو سەپاندنی دەسەلات.

٢- ئاگادار کردنەوەی کۆمەڵگەی عیراقی بەشێوەیەکی رەهایی سەبارەت بەوەی کە هەموو هەوڵدانێك دژی دەسەلات بەبێ بەزەیی سزا دەدرێت. ئەم ئامانجە جێگەی سەرەنجی حیزبی بەعس بوو هەر لەداگیرکرنی دەسەلات هەتا هەرەسهێنانی.

ئامانجی ئێمە لەم بەشەدا گێرانەوەی ژمارەی سروشتی دەستگیرکردنو خستنە ناو بەندیخانەو ونبوونو تیرۆرکردنو ئەشکەنجەو لەسێدارەدان نییە، چونکە ئەم کارانە ئەوەندە زۆرن کە باس کردنیان پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی جیاواز هەیە. ئامانجی ئێمە ئەوەیە تیشك بخەینە سەر ئاکاری ئایدیۆلۆژیاو جیهانبینییەك کە لەبەشەکانی

داهاتودا باسی لێ دەکەین. پاساو کردنی کوشتنو بڕین لەڕێگەی دەست راکێشـــان بـۆ دوژمنو خائینو سیخوڕ رەنگدانـــەوەی ئایدیۆلۆژیـای عەفلەقیـە کەهاوبەشـە لەگـەڵ سەرجەم ئایدیۆلۆژیا تۆتالیتاریەکان.

## بەرەی نیشتمانی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز

بەرەی نیشـــتمانی نەتـــەوەیی پێشـکەوتنخواز (الجبهـة الوطنیـة القومیـة التقدمیـة) لەمانگی تەموزی ساڵی ١٩٧٣ دروستکرا. بێگومـــان مەبەستی حکومـەتی بـەعس دابەشکردنی دەســـەڵات نـەبوو لەگـەڵ هیـچ هـێزێکی سیاسـیدا. مـەرامی بـەعس، لەراسـتیدا، بریتـی بـوو لـەدوو خـاڵ: مژیـنو ملکـەچ پێکردنـی هـەموو ئاراسـتە سیاسـیەکان کـە لەسـەر گۆڕەپـانی سیاسـی عـیراقی مابونـــەوە بـۆ پێداویسـتیە ناسیۆنالیسـتە پـان عەرەبـەکانی حزبـــی بـــەعسو دانـــی رواڵـــەتێکی پۆزەیتـــڤ بەدەسەڵاتەکەی، لەسەر ئاستی ناوخۆو لەبەردەم جیهانی عەرەبیو را یگشتی جیهانی.

لەدێڕەکانی پێشودا تێبینیمان کـرد کـە چـەند مـانگێك حکومـەتی بـەعس هیـچ لایەنێکی بەبێ سزا نەهێشتەوە. هەموو ئەوانەی لەناو برد کە پێی دەگوتـــن "سـیخوڕ ،ناپاك، بەکرێگیراوی ئیمپریالیزم". بەم شێوەیە، هیچ لایەنێك لە ئۆپۆزیسیۆنی عیراقی نەمابوەوە جگە لەحیزبی کۆمۆنیســـت، دوژمنـــی ئـایدیۆلۆژیو مێژوییـی، و هـەروەها پارتی دیموکراتی کوردستان. بێ گومـان، دەبێ بڵێـین کـە حکومـەتی بـەعس کـاتێك هەنگاوی نا بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لەرێگەی رێککەوتننامەی١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ لەبەر هۆیـــەکی ئـایدیۆلۆژی نـەبوو. هـەنگاونان بـەرەو ئیمـزا کردنـی رێککەوتننامەی ئازار رەنگدانەوەی جیهانبینی بەعس نەبوو چونکە ئایدیۆلۆژیایـەکی ناسیۆنالیستی تۆتالیتاری پان عەرەب ناتوانێ مەسەلەی میللەتێکی دیکـە تەماشـا بکات لـەناو چوارچێـوەی مـافی رەوا. حکومـەتی بەعسـی عـێراقی، بـەئیمزاکردنی رێککەوتنامەی ئادارو دروست کردنی بـەرەی نیشـتیمانی نەتـەوەیی پێشـکەوتنخواز، ویستی بۆ ماوەیەك تاخۆی بگرێتەوەو خۆی بەهێز بکـاتو کـەڵك لـەکات وەربگـرێ .

ئەگینا دوژمنی دوێنێ ناتوانێ ببێ بەبرادەری خۆشەویستی ئەمڕۆ. دەتوانین بڵێین کە ئەگەر لەساڵی ١٩٦٣ ڕۆحی تۆڵە سەندنەوە وای لێکرد کە بەبێ گوێدانە هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت‌و وڵاتە سۆسیالیستەکان کۆمۆنیستەکان بهارێ، ئەمجارەیان لەبەر هۆی تەکتیکی‌و مانەوە، ناچاربوو ستراتیژیەتێك هەڵبژێرێ کەزامنی یارمەتی سیاسی‌و سەربازی بۆ بکات بۆ ئەوەی باشتر دوژمنەکانی دابمرکێنێ. ڕێککەوتن لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیست وەك شتێکی پێویست دەبینرا بەتایبەتی کاتێك پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت بەرەو باشی دەڕۆیشت. کرانەوە لەگەڵ بلۆکی سۆسیالیست‌و بەتایبەتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت ناچاری دەکرد کەهەڵوێستێکی "ڕێکەوتنانەی" هەبێ لەگەڵ کۆمۆنیستە عێراقیەکان. هەروەها کۆمۆنیستەکان بەدەوری خۆیان کاتێك ئەم کرانەوەیە ئومێدی ڕێکەوتنی پێ دەدان لەگەڵ حکومەتی بەعس، ئەوەی کەبەسەریان هاتبو لەنۆمانگی حوکمی بەعسدا لە ١٩٦٣ بۆیان بوو بەڕوداوێکی ڕابردوو. لەبەر ئەمە، دەستیان کرد بەڕازی کردنی خۆیان سەبارەت بەوەی کەحیزبی بەعس نوێنەرایەتی "بۆرجوازی ناسیونال" دەکات. سەرەڕای دەسەڵاتخوازی، حکومەتی بەعس بریتی بوو لەبۆرجوازییەکی ناسیۆنال کە بەلای کۆمۆنیستەکانەوە بەتوێژێکی شۆڕشگێڕی پێشکەوتنخواز لەخەباتدا دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکی دەژمێردرا. خەوی هاوکارییەکی بەرهەمهێنەر، ئەندێشەی کۆمۆنیستەکانی زیاتر دەخرۆشان کاتێك کە حکومەتی بەعسی خۆی ئامادە دەکرد بۆ خستنەکاری پرۆگرامێکی سۆسیالیست‌و ناسیۆنالیزە کردنی نەوتی عیراقی‌و چارەسەرکردنی کێشەی میللەتی کورد. زیاتر لەوەش، حیزبی بەعس پێش دروستکردنی بەرەی نیشتمانی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز، ڕێگەیدا بەحزبیی کۆمۆنیست هەفتەنامەی (الثقافة الجدیدة) بڵاوبکاتەوەو عەزیز شەریفی کرد بە وەزیری داد. بەلام قەوارەی "زۆرزانیی" بەعس زۆر لەوەی حیزبی کۆمونیست گەورەتر بوو. بەپاڵ ئەم ئیجرائاتانەوە، حیزبی بەعس دەستی کرد بەهەڵمەتی تیرۆرو فڕاندن‌و خستنە ناو بەندیخانەی ئەندامان‌و لایەنگرانی حیزبی کۆمۆنیست. لەمانگی حوزەیرانی ساڵ ١٩٦٩ ستار خضیر، ئەندامی لیژنەی مەرکەزی

کوژرا، لەمانگی سێپتەمبەر کادێری گرنگی حیزب، عبد الامیر سید، فڕێنرا، لەمانگی ئاداری ١٩٧٠ ئەندامێکی دیکەی لیژنەی مەرکەزی، محمد احمد الخدری، لە بەغدا کوژراو هەروەها زۆر لەکادێری بەرزی حزب خرانە بەندیخانەو هەتا مردن ئەشکەنجە دران[٩٠].

حکومەتی بەعس هەمان سیاسەتی لەگەڵ میللەتی کورد بەکارهێنا. لەگەڵ ئیمزا کردنی ڕێککەوتننامەی یانزەی ئاداری ١٩٧٠ سەبارەت بەئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، پێنج وەزیری کوردی لەحکومەتی عێراقی دانا و مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤاری بەزمانی کوردی داو هەروەها هێشتی زمانی کوردی لەخوێندنگە سەرەتاییو ناوەندیەکانی کوردستان بخوێنرێ. بەڵام لەهەمان کاتدا، لە سێپتەمبەری ١٩٧١ چل هەزار (٤٠٠٠٠) کوردی بەرەو ئێران دەرکرد و لەهەمان مانگدا هەوڵی کوشتنی سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستان، (مەلا موستەفای بارزانی) داو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر بەردەوام بوو لەسیاسەتی عەرەباندنی کوردستان بەتایبەتی لە کەرکوكو خانەقینو شەنگارو شێخانو بەبێ سنور ڕەفتاری تیرۆریستی خەستکزدەوە لەکوشتنو خستنە ناو بەندیخانەوەو فڕاندنی چەندەها کەسایەتی کورد[٩١]. لەم بارودۆخەدا، حزبی بەعس مەبەستی خۆی ئاشکرا دەکرد سەبارەت بەدروستکردنی بەرەیەك کەسەرجەم هێزە سیاسیە "پێشکەوتنخوازو نیشتمانیەکان" بگرێتەوە. پارتی دیموکراتی کوردستان، هاوبەشیکردنی لە ناو ئەم بەرەیەدا ڕەتدایەوە، بەڵام حزبی کۆمۆنیست مەرجەکانی چونە ناو بەرەی پەسەند کرد. شایستەی تیشك خستنە سەرە کە بۆ پەسەند کردنی چوونە ناو بەرەی بەعسیەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان چەند مەرجێکی دانا کە لە لایەن حیزبی بەعسەوە پەسەند نەکران. هەندێ لەو مەرجانە بریتی بوون لەهاوبەشی کردنی ڕاستەوخۆی حیزبە سیاسیەکان لە بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت، لەپێناوی ئەوەی دەزگای دەوڵەت تەنها لەژێر کۆنترۆڵی بەغدا نەبێو، بەزوترین کات پرۆسەی هەڵبژاردن ڕێکبخرێ . . . هتد[٩٢]. زیاتر لەوەش، پارتی دیموکراتی کوردستان نارەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر هەڵمەتی عەرەباندنی

کوردستانو لەبەر ئەم هۆیەش هەتا ساڵی ١٩٧٥ لە دەرەوەی بەرەی بەعسی مایەوە. بەڵام دەبێ زوو بەزوویی بوترێ کە لەم کاتانەشداو پاش هەرەسهێنانی ڕێککەوتننامەی ئادارو شۆڕشی کورد، لە ساڵی ١٩٧٥ ڕێکخراوێکی سیاسی کوردسانی دیکە دروست بوو: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کە بەسەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی توانی بەردەوامی بە شۆڕشی خەڵکی کوردستان بدات و ببێ بە ئاستەنگێك دژی سیاسەتی حکومەتی بەعسو ببێ بە هێزیك بۆ بەرزکردنەوەی وورەی خەڵکی کوردستان. دەبێ ئەوەیش بوترێ کەحکومەتی بەعسی لەعەرەباندنی کوردستان نەوەستا و هەندێ گروپی کارتۆنی کوردی لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی عیراقی خستە ناو بەرەی پێشکەوتنخوازەوە. بۆ هاتنە ناو بەرەوە، حکومەتی بەعسی هەندێ مەرجی دانا. هەندێ لەو مەرجانە بریتی بوون لەم خاڵانەی خوارەوە: حیزبی کۆمۆنیست دەبوایە بەشێوەیەکی "روونو بابەتی" دانی بنایە بەسەر ئەوەی کەحیزبی بەعس "حیزبێکی شۆڕشگێڕی یەکێتیخوازی سۆسیالیستی دیموکراتیە". دەبوایە ئیعلانێکی دەربکردایە لەسەر پێشکەوتنخوازیی شۆڕشی (١٧)ی تەمووز. دەبوایە دانی بنایە بەسەر ڕۆڵی سەرکردایەتی حیزبی بەعس لەناو حکومەتو ڕێکخراوە میللیەکانو بەرە. دەبوایە لەسەر ئاستی رەسمی پەیمانی بدایە کە چالاکی سیاسی نەباتە ناو لەشکرەوە، چونکە ئەم چالاکیانە بەندن تەنها بەحیزبی بەعسەوە: تەنها حیزبی بەعس رەوایەتی ڕێکخستنی سیاسی هەبوو لەناو لەشکرو خوێندنگەکاندا. دەبوایە پەیمانی بدایە هەڵبستێ بەهەوڵدان بۆ رازی کردنی حیزبە کۆمۆنیستەکان کە هاوپەیمانیەتی بکەن لەگەڵ حزبیی بەعس لەوڵاتە عەرەبیەکانی دیکە. دەبوایە دەوڵەتی زایۆتی بەشێوەیەکی رەها رەتبدایەو بیری خەباتی میللی چەکدارانە بۆ رزگار کردنی تەوای فەلەستینی پەسەند بکردایە. دەبوایە یەکێتی عەرەبی پەسەند بکردایە، وەك "ئامانجی یەکەمو بنەڕەتی" یەکگرتنی سەرجەم وولاتە عەرەبیەکانو هەروەها دەبوایە "گۆڕانی سۆسیالیستی" پەسەند بکردایە لەناو وولاتەکەدا[٩٣]. حیزبی کۆمۆنیست هەندێ لەم مەرجانەی رەتدایەوە. بۆ نمونە چەمکی حیزبی سەرکردەی "الحزب القائد"ی پەسەند

نەکردو فۆرمەلەی "گۆڕانـی سۆسیالیسـتی" ڕەتدایـەوە چونکـە لەروانگـەی حـیزبی کۆمۆنیستەوە چەمکی گۆڕانی سۆسیالیست لەسەر ئاستی تیۆری ڕاستو "زانستیانە" نەبوو، چونکە عیراق هێشتا "شۆڕشی ناسیۆناڵ دیموکراتـی" تـەواو نـەکردووە. دەبـێ بوترێ کەسەبارەت بە یەکێتی عەرەبو خـەبات دژی زایۆنـیزمو ئیمپریـالیزم، حـیزبی کۆمۆنیست هیچ ناڕازییەکی دەرنەبڕی [٩٤] و پاش چەند چاوپێکـەوتنو گفتوگۆیـەك، ئەم مەرجانەی پەسەند کرد و بوو بە ئەندام لـە بـەرەی نیشـتیمانی و نەسیۆنالیسـتی پێشـکەوتنخواز. لـە ٤ی ئـەپریلی ١٩٧٢ حکومـەتی بـەعس ڕێکەوتننامەیـــەکی هاوپەیمانییەتی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەت ئیمزا کرد [٩٥].

لەتەموزی ١٩٧٣ ، سەرۆك ئەحمـــەد حەسـەن بـەکرو سـکرتێری یەکـەمی لیژنـەی مەرکەزی حیزبی کۆمۆنیست کارتی کاری نیشتمانیان "ورقة العمـل الوطنـي" ئیمـزا کرد. بەم شێوەیە بەرەی نیشتمانی ناسیۆنالی پێشـــکەوتنخواز کـە لـەحیزبی بـەعسو پارتی کۆمۆنیست پێکهات، کەوتە کارو لەلایەن لیژنەیەکەوە بەناوی "اللجنة العليا" سەرکردایەتی کرا. ئەم ئەنجومـەنە بریتی بوو لە١٦ کورسی: هەشتی بۆ حزبی بەعسو سێی بۆ حزبی شیوعیو سێی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان (ئەگەر چونە ناو بەرەی پەسەند بکردایە)و دووش بۆ "کەسایەتیە سـەربەخۆکان" [٩٦]. گومـانی تێـدا نییـە کەکاتێك ڕێنمایی وەردەگـرت بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ لەئەنجومــەنی سـەرکردایەتی شۆڕش، بەرەی نیشتمانی ناسیۆنالی پێشکەوتنخواز بوو بەداردەستێك لەژێر کۆنـــترۆڵی حیزبی بەعس. زیاتر لەوەش کاتێك پارتی دیموکراتی کوردستان هاوبەشیکردنی بـەرەی ڕەتکردەوە، حیزبی بەعس توانی لەئەنجومەنی باڵا "اللجنة العليا" زۆرینەی هەبێ.

ئایا حیزبی کۆمۆنیست چاوەڕوانی چی لەحیزبێك دەکردکە مەرامی زۆر ئاشکرا بوو: نەك تەنها هەموو ئۆپۆزسیۆنێك بخاتە ژێـر بـاڵی ناسـیۆنالیزمی پـان عەرەبیەکـەی، بەڵکو هەروەها بەگوێرەی نەخشەیەك کە لەوەو پێـش بـیری لـێ کراوەتـەوە، هـەموو ووزەی هێزە سیاسیەکان هەڵمژێ و لەسەر شانۆی سیاسی عیراقدا وونی بکات. گومانی تێدا نییە کە دەکرێ ئاشتی لەنێوان دوو دوژمندا بهێنرێتـــە کایـەوە هەڵبـەت تەنـها

لەرێگەی مەبەستیان نەك لەرێگەی ئیمزا کردنی پارچەیەك کاغەز. یوتۆپیای کۆمۆنیستی سەر بەیەکێتی سۆڤیەت حیسابی ئەوەی دەکرد کە هاوپەیمانیەتی لەگەڵ حیزبێکی "بۆرجوازی بچوك" وەك حیزبی بەعس پێویست بوو لەپێناوی رێگە خۆش کردن پێش هەموو شتێك بۆخەبات دژی ئیمپریالیزم، قۆناغی بالآی سەرمایەداری. هەروەها کرێکاران‌و جوتیاران‌و بەشێکی بەرچاوی بۆرجوازی ناسیۆنالی رادەکێشا بەرەو خۆی و وورده وورده عیراقی دەبرد بەرەو بنیادنانی سۆسیالیزمێکی زانستی. بەلآم نەیدەزانی کە بە پەسەند کردنی فۆرمەلەی: بزووتنەوەی شۆرشگێری عەرەب دەبێ سەرکردایەتی بکرێ لەلایەن حیزبی بەعسەوە کەنوێنەرایەتی زۆرینەی جەماوەری میللی عیراقی‌و عەرەب دەکات [(٩٧)]، قەبری مردنی خۆی لەپێشدا بۆ ئامادە دەکرد. حیزبی بەعس نەخشەی خۆی لەپێشدا دانابو. هەر لەیەکەم چرکەی گرتنی دەسەڵاتەوە، دەیزانی کاتێك کە بەرپرسیێتی سەرکردایەتی وەردەگرێ دەبێ "بەرەیەکی پێشکەوتنخوازی راستەقینە بنیادبنێ نەك وەك رواڵەتێکی ئاسایی بێکاریگەری بێ داهاتوا لەبواری ناسیۆنال‌و پان عەرەبدا" [(٩٨)]. حیزبی بەعس نەیدەتوانی زامنی رێزی شیاوی هەڵوێستە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکانی بکات‌و نەیدەتوانی "متمانەی گەل پەیدا بکات، پێش ئەوەی ژیانی سیاسی وڵاتەکە بگرێتە دەست لەسەر ئاستی ئەخلاقی و مادی" [(٩٩)]. لەبەر ئەم هۆیە، حیزبی بەعس پەیوەندیەکانی لەگەڵ کۆمۆنیستەکان تەماشادەکرد نەك وەك قەوارەیەکی ئایدیۆلۆژی بەڵکو بۆ هۆیەکی پراکتیکی پوخت. هەروەها، هاریکاری، بۆ ماوەیەك، لەگەڵ کۆمۆنیستەکان رێگەی بۆخۆش دەکرد بۆ ئەوەی لەداهاتودا باشتر دەسەڵاتی خۆی بەسەر کۆمەڵگەی عیراقدا بسەپێنی. راپۆرتی سیاسی کۆنگرەی هەشتەمی حیزبی بەعس زۆر لەسەر ئەم خاڵە راستەوخۆو روونە. بەرامبەر بەرەواکردنی چالاکیە سیاسیەکانی حیزبی کۆمۆنیست‌و رێگە دان بە بلاوکردنەوەی هەندێ رۆژنامەو گۆڤارو دانانی هەندێ وەزیری کۆمۆنیست لەناو حکومەتدا، حیزبی بەعس توانی سەربەست بێ لەکارکردن بۆ راپەراندنی "پرۆگرامە پێشکەوتنخوازەکەی"و بەعساندنی تەواوی بواری کارگێری‌و سەرجەم دەزگاکانی

دەوڵەت لەلایەکەوەو ئامادەکردنی نەخشە باش حیسابکراوەکەی سەبارەت بەهاڕینی هەموو ئۆپۆزیسیۆنێك بۆ دەسەلاتی خۆی لەلایەکی دیکەوە.

دروستکردنی بەرەی نیشتیمانی ناسیۆنالی پێشکەوتنخوازو پشتگیری پارتی کۆمۆنیست ڕێگەی بۆ هەلگیرساندنی جەنگ دژی میللەتی کورد ئاسان کردەوە. سەرکەوتنی بەسەر شۆرشی کورد لە ١٩٧٥ لەئەنجامی ڕێکەوتنامەی جەزائیر، ڕێگەی بۆ خۆش کرد بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لەسەر نەخشەی رەگەز پەرستی و عەرەباندنی کوردستانو راگواستنی هەزارەها خێزانی کورد بۆ ناوچەکانی خوارووی عیراقو روخاندنو وێران کردنی هەزارەها لادێی کوردو هێنانی هاوردەی میسریو عەرەب لەجێگەی راگوێزراوە کوردەکان.. هتد [١٠٠].

پاش سالێك، حیزبی بەعس دەستی کرد بەشەڕ فرۆشتن دژی حیزبی کۆمۆنیست. سەدام حوسەین کەئەوسا بریکاری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش بوو کاتێك رەخنەی لەکۆمۆنیستەکان دەگرت لەبەر ئەوەی ڕێزیان نەدەگرت لەناوەرۆکی "ورقة العمل الوطنی" لەکۆبونەوەیەکی بەرە لە١٩٧٦/٨/٢١ دەیگوت: "ئۆتۆنۆمی ئایدیۆلۆژی" حیزبە سیاسیەکان لەناو بەرەدا نابێ وا لەهەندێ بکات کە خۆیان لەشۆرشی بەعسی دوور بخەنەوە. چونکە شۆرش وەك چەترێك وایە کە لەژێریدا سەرجەم هێزە سیاسیەکان بەپاڵ یەکتریەوە دژی ئیمپریالیزم خەبات دەکەن. لەبەر ئەم هۆیە، شۆرش راستیەکی گەورەی ئێمەیە کە "ئۆتۆنۆمی ئایدیۆلۆژی" رەتناکاتەوە [١٠١].

سەدام حوسەین دەویست، لەراستیدا، بە کۆمۆنیستەکان بلێ کە لەبەر ئەوەی حیزبی بەعس خاوەنی "شۆرشەکەیە"، واتا کودەتای تەموزی ١٩٦٨، لەبەرژەوەندی ئەوانە کە بەگوێرەی ئەو مەرجانەی کەبەعس دایناون رەفتار بکەن. لە بۆنەیەکی دیکەدا لە١٠/٢/١٩٧٦ دەیگوت کە پێویستە حیزبە سیاسیەکان هەست بکەن کە ئەوان بەعسین هەرچەندە ئینتماشیان بۆ حیزبی بەعس نییە. سەدام حوسەین جەختی دەختە سەر ئەم خاڵە: کاتێك بەعسیەکان باس لەتایبەتمەندی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست دەکەن، مەبەستیان کەمکردنەوەی رۆڵو گرنگی خەلکی سەربەخۆی

نیشتیمانی لەکۆمەڵداو ڕۆڵی هێزە سیاسیەکان نییە ، چونکە بەعسیەکان حیزبی بەعس تەنها بەحیزبی خۆیان دانانێن، بەڵکو بەحیزبی هەموو کەسێك، تەنانەت ئەوانەی کە ئینتماشیان بۆ حیزبە سیاسیەکانی دیکە ش هەیە [١٠٢].

هەروەها لەبۆنەیەکی دیکەشدا لە ٢٥ /٢/١٩٧٦ دەیگوت: "ئێمە رامان وایە کە عیراقیەکان نابێ دژواو دژی ببینن لەنێوان ئەوەی کەئینتیمایان هەیە بۆ حزبە سیاسیەکانی دیکەو دانانی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست وەك حیزبی خۆیان. چونکە حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست سەرکردایەتی کۆمەڵو شۆڕش دەکاتو توانای خۆی لەم بوارەدا دەرخستوە " [١٠٣].

کاتێك کە ئامۆژگاریەکانی بۆ حیزبی کۆمۆنیست ئاراستە دەکرد، سەدام حوسەین داوای لێ دەکرد کەدوای نمونەی شۆڕشی کوبا بکەوێ. بەلای ئەوەوە حیزبی کۆمۆنیستی (کوبا) هاوکاری دەربڕی لەگەڵ شۆڕشەکەی کاسترۆ تائەوکاتەی کاسترۆ بوو بەسەرۆکی حیزب لەکوبا [١٠٤]. ئەگەر سەیری ئەم نمونەیە بکەین، تێبینی دەکەین کە لەسەر ئاستی لۆژیکی ئەم نمونەیە ئەوەندە روون نییە، بەڵام سەدام حوسەین دەیوست بڵێ کە بەعسیەکان خاوەنی سەرەکی شۆڕشنو لەبەر ئەوە پێوست بوو ئەوانی دیکە بەبێ ئیحراج بوون، ملکەچی بۆ بکەن: "ئێمە زانیاریمان پێ گەیشتوە سەبارەت بەهەندێ لەبراکانمان بەتایبەتی حیزبی کۆمۆنیست کەتائەمڕۆ ئیحراج دەبن کاتێك داوایان لێ دەکرێ: ئێوە لەگەڵ حکومەتن یان نا؟ ئایا لەگەڵ شۆڕشن یان نا؟ ئایا بوون لەگەڵ شۆڕشی گەورەو حکومەتەکەی شتێکی موحریجە؟ ئەو شۆڕشەی کە هەموو هاونیشتمانیەکی بەوەفا شانازی پێوە دەکات، هیچ کەسێك ناتوانێ کاری بخاتە گومانەوە" [١٠٥].

لەنێوان ١٩٧٥-١٩٧٦ کۆمۆنیستەکان، لەناو ڕۆژنامەو کۆڕە میللیەکاندا، سکاڵای خۆیان دەردەبڕی بەرامبەر ڕەفتارو کردەوەکانی حیزبی بەعسو نارەزایی خۆیان بەرامبەر هەڵوێستی ئیژیمۆنی حیزبی بەعس لەناو دەزگاکانی دەوڵەتی عیراقو دژی سیاسەتی ڕاگواستنی میللەتی کورد دەردەبڕی.

داوای ئازادی سیاسیو هەڵبژاردنی ئازادیان دەکرد لەسەر بنچینەی رۆحی "ورقة العمل الوطني". پێویستە بوترێ کەهەرچەندە ئەم رەخنەو سکاڵا دەربڕینە بەشێوازێکی مام ناوەندی ئاڕاستەی حکومەتی بەعس دەکران، بەڵام ئاشکرایە کە لەروانگەی حیزبی بەعسەوە دادەنران بە "هێرشێکی پەسەندنەکراو" بۆ سەر شێوازی حوکمکردنی وڵاتەکە[١٠٦]. بەم بۆنەیەوە، سەدام حوسەین دەیگوت: با بەپێچەوانەوە شتەکان گریمانە بکەین. ئەگەر ئێمەی بەعسی دەست بکەین بەهێرش بردنە سەر کۆمۆنیستەکان. لەرێگەی ووتارو ماسمیدیاکانمان ، چی روو دەدا؟ ئەم شتانە قبوڵ دەکرێن؟ ئەگەر وابێ ئێوە زیانتان لێ دەکەوێ. بۆ خۆ هەڵکێشان نییە کە ئێمە بەم شێوەیە گوزارشت دەکەین، بەڵکو بۆ ئەوەیە بڵێین کەپەیوەندی ئێمەو جەماوەر دەوەستێتەوە سەر هاوکاریەکی پۆزەتیڤ و متمانەی هاوبەش. لە بەر ئەم هۆیە جەماوەر گوێمان لێ دەگرێ (. . .). کاتێك بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ لەناو بەرەدا باس لەرۆڵی ئێوەو رۆڵی هێزە نیشتیمانیەکانی دیکە دەکەین ، چونکە ئەمە بۆ بەرژەوەندی گەورەی ئێوەیە[١٠٧].

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کەهەر لەسەرەتاوە، حیزبی بەعس دڵنیا بوو کەکۆمۆنیستەکان کاتێك دانیان نا بەرۆڵی سەرکردەی حیزبی بەعس لەکاروباری دەوڵەتدا، هیچ ئیختیارێکی دیکەیان نەبوو جگە لەملکەچ بوون بۆ فەرمانی بەعس کەناونرا بوو بە "هاوکاری هاوبەش (متبادل)". بەم بۆنەیەوە، سەدام حوسەین بانگەشەی دەکرد بۆ ئەوەی کە ئەگەر بارودۆخی ئەم "هاوکاریە هاوبەشە" نەیەتە کایەوە، ئەوا حیزبی کۆمۆنیست باری بەرپرسێتی هەڵدەگرێ، چونکە "هاوکاری هاوبەش" ئەو واتایەی دەگەیاند کە سەرجەم هێزە سیاسیەکانی بەرە، هەمویان پێکەوە خەبات بکەن "لەناو یەك سەنگەر" (خندق واحد)، نەك لە ناو "دوو سەنگەری جیاواز" (خندقین منفصلین) دژی دوژمنەکانی شۆڕش. بەلای سەدامەوە، شتەکان بەو شێوەیە نەدەهاتنە پێشەوە، چونکە هەریەکە دەیویست بەهەڵوێستێکی جیاوازەوە خۆی بێنێتە پێشەوە[١٠٨].

گومانی تێدانییە، ئەم ووتارە سەرەتای کۆتایی هاوپەیمانیەکی مۆر کرد کەهێشتا بەتەواوی خۆی جێی خۆی نەگرتبو. میدیای بەعس، هەروەك پێشبینی دەکرا، دەستیان کرد بەتاوانبار کردنی حیزبی کۆمۆنیست چونکە، بەووتەی بەعسیەکان، نەیدەویست خۆی بگونجێنێ لەگەڵ رۆحی "ورقة العمل الوطنی" کەخۆی ئیمزای کردبوو. هەروەها کەم تەرخەمی دەکرد لەرێزگرتن لەپرەنسیپەکانی "شۆڕش" کە بواری پێدا بەشێوەیەکی رەواو ئاشکرا چالاکیە سیاسیەکانی بنوێنێ لەناو دەزگاکانی دەوڵەت‌و کۆمەڵگەی عیراقی.

بێ گومان، ئەم هەڵمەتە ئیعلامیە، هەڵمەتی گرتن‌و کوشتنی بەدواداهات. لەسەرەتای ١٩٧٦ ژمارەیەك لەکۆمۆنیستەکان خرانە بەندینخانەوەو ئەشکەنجەدران‌و دواییش ئازادکران. لەئەپریلی ١٩٧٢ چالاکیەکانی حیزبی شیوعی تارێژەیەکی زۆر لەناو رێکخراوەکانی وەك "اتحاد الشعب الدیموقراطی"و "رابطة المرأة العراقیة" کۆنترۆڵ کران‌و وەستێنران. هەتا ساڵی ١٩٧٨ لەم لاو لەولا هاوولاتیانی کۆمۆنیست راو دەنران. لەمانگی مایسی ١٩٧٨ میدیای بەعس دەستیان کرد بەئاگادار کردنەوەی حیزبە سیاسەکان کە "شۆڕش" سزای ئەو کەسانە دەدات کە هەوڵ دەدەن لەناو هێزەکانی لەشکر کاری سیاسی بکەن‌و بەشێوەیەك یان بەشێوەیەکی دیکە باسی ئەوەیان دەکرد کە کودەتایەك خەریکە رێك بخرێ لەلایەن حیزبی کۆمۆنیستەوە. ئەمجا بەشێوەیەکی ئاشکرا، حکومەتی بەعس دەستی کرد بەتاوانبار کردنی سەبارەت بەوەی کەئیتر حیزبی کۆمۆنیست حیزبێکی عیراقی راستەقینە نییە، بەڵکو حیزبێکی کلکە (ذیلی) بۆ بەرژەوەندی یەکێتی سۆڤیەت کار دەکات. دەرئەنجامی ئەم تۆمەتانە بریتی بوولە لەسێدارەدانی ٢١ کۆمۆنیست چونکە هاوبەشیان کردبوو لەرێکخستنی شانەی کۆمۆنیست لەناو هێزی لەشکردا. لەمانگی تەموزی ١٩٧٨، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڵاوی کردەوە کە جگە لە حیزبی بەعس، چالاکی سیاسی حیزبەکانی دیکە لەناو لەشکردا بەکارێکی نارەوا دادەنرێ و ئەو تاکەی سەر بە حیزبێکی دیکە بێت دەدرێ بە دادگاو سزاکەشی مردنە. بێ گومان ئەمە سەدەها

لەدەستگیرکردنو کوشتنی لەگەڵ خۆی گلان. بێ گومان، هەڵمەتی کوشتنو بڕین تەنها کۆمۆنیستەکانی نەگرتەوە، بەڵکو چەند کەسایەتەکی کوردیشی گرتەوە.

بەم شێوەیە، حیزبی کۆمۆنیست کە تاساڵی ١٩٧٩ دا بەفاکتەرێکی سیاسی لەناو بەرەی نیشتمانی ناسیۆنالی پێشکەوتنخواز دانرا، دەستی کرد بەسیس بونەوەو ئەمجا توانەوەو لەو چرکەیە بەدواوە دیسانەوە ڕێگەی لەگەڵ حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست کە لەلایەن میشێل عەفلەقەوە تیۆریزە کراو لەلایەن دوو کۆچکەی بەکرو سەدامەوە خرایە کارو جولایەوەو نهێنی هەڵبژاردو شاخەکانی کوردستانی کرد بەقەڵغانی بوونو مانەوەی خۆی. ئەمە بوو ئەزمونی "دیموکراسی" ئەمجا لەلایەن سەدامیشەوە باقی ئەو ڕێگەیەی بڕی کەکۆتایی هات بەترسناکترین سەردەم نەك تەنها لەمێژوی عیراقدا، بەڵکو لەمێژوی نوێو هاوچەرخی مرۆڤایەتیدا.

### لە لیڤیەتانی دوو سەرەوە بۆ لیڤیەتانی یەك سەر

هاڕینی ئۆپۆزسیۆنی کۆمۆنیستو خەستکردنی هەڵمەتی لەناوبردنی میللەتی کورد، سەردەمێکی دیکەی لەمێژووی حکومەتی بەعسی هێنایە کایەوە کەسەردەمی سەدام حوسەین بوو. لەناو جەرگەی هەڵمەتی راونانی کۆمۆنیستەکان و میللەتی کورد، سەدام حوسەین لە١٧ی تەموزی ١٩٧٩ بە دەنگێکی سادەو پڕ لەڕێزەوە گرتنە دەستی دەسەڵاتی بۆ میللەتی عەرەب ڕاگەیاندو باسی هاتنە سەر حوکمی خۆی کرد پاش ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆك کۆمار. لە ووتارەکەیدا ئەوەی راگەیاند کە لەمێژووی کۆنی عیراقو عەرەبدا، هەروەها لەمێژووی نوێشدا، هەرگیز نەبووەو رووی نەداوە کە بۆ ماوەی یانزە ساڵ دوو دەسەڵات سەرکردایەتی ولاتێك بکەن بەبێ ئەوەی پەیوەندی نێوانیان تێك نەچێتو یەکێکیان ئەوی تر لەناو نەبات[١٠٩].

هۆکانی وون بوونی ئەحمەد حەسەن بەکر لەسەر شانۆی سیاسی عیراقدا زۆر روون نین. بەڵام ئاشکرایە کە لەمێژەوە دەنگو باسی بێتوانایی سەرۆکی بەعسی بلاوبوەوە لەنێوان بەعسیەکاندا. جگە لەوەش، لەمێژەوە دەوترا کەئیتر سەرۆك بەکر پیر بوەو

توانای بەجێ هێنانی "ئەرکە پیرۆزەکەی" نەماوە. نووسەری بەعسیو ژیاننوسی سەدام حوسەین بەم شێوەیەی خوارەوە باس لەئەحمەد حەسەن بەکر دەکات پاش خۆکێشانەوەی لەدەسەلاّت: " ئەم ئەفسەرە مێژووییە کاتێ بەتالّی خۆی لەبەجێهێنانی هەندێ کار بەسەر دەبات کە هیچ پەیوەندیەکیان نییە بەئەرك‌و خەم خواردن بۆ دەسەلاّت. بەیانیان زوو دەچێتە باخەکەی خۆی‌و ئاوی گوڵەکان دەدات‌و لقەکان دەبڕێ. سەرۆك ماندوەو پشو دەدات یان لەگەلّ مندالّە بچوکەکانی خۆی یان هەر خۆی بەتەنها" (١١٠).

هەر چیەك بن ئەو بارو دۆخانەی کەسنوریان دانا بۆ لابردنی ئەحمەد حەسەن بەکر، ئەوەی گرنگە بۆ ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە بزانرێت کە بۆ ماوەی یانزە سالّ ئەم دوو هاوسەرە سیاسیە بەبێ ماندو بون پێکەوە کاریان کردو بەپێکەوە گونجانێکی بێ هاوتا رەفتاریان کرد لەپێناوی گۆڕینی عیراق بۆ دەولّەتێکی تۆتالیتارو ملکەچ پێکردنی هاوولاّتیان بۆ ویستی رەهای حیزبی بەعس‌و گرمۆلّە کردنیان لەناو سیستەمێکی یەك حیزبی. هەتا سالّی ١٩٧٩ دەسەلاّتی فیعلی دابەش دەکرا لەنێوان ئەم دوو کەسایەتیە بەعسیە، یەکەمیان، ئەحمەد حەسەن بەکر، سەرۆکی دەولّەتی بەعسی بوو، دووەمیان، سەدام حوسەین، دەستە ڕاستی بوو. ئەگەر یەکێکیان، بەهۆی شوێنی رەسمی‌و رێزی نیشتمانپەروەری، جولێنەرو کارپێکەری دەزگای دەولّەت بوو، ئەوی تریان لەرێگەی " زیرەکی " و فێلّبازی خۆیەوە، پلاندانەرو نەخشەکێشی ئەم دەزگایە بوو. ئەگەر یەکەمیان دەنگ‌و "وتە بێژی" دەسەلاّت بوو، دووەمیان دەستی ئەم دەسەلاّتە بوو. هەروەها گرنگە هێل بەژێر ئەوەدا بهێنرێ کە بەپێچەوانەی ئەوەی کەزۆربەی نوسەران باسی لێ دەکەن، سەدام حوسەین سەرجەم لایەنەکانی دەسەلاّتی بەشێوەیەکی رەسمی وەرنەگرت. لەرووی رەسمیەوە، ئەحمەد حەسەن بەکر زۆر لایەنی دەسەلاّتی بەدەست خۆیەوە کەلّەکە کردبوو. هیچ کەسایەتیەکی سیاسی تائەم سنوورە ئەوەندە دەسەلاّتی پێ نەسپێرابوو. بەدلّنیایی شیکردنەوەیەکی دەستوری عیراق دەتوانێ یارمەتیمان بدات بۆ تێگەیشتنی ئەم راستیە. بەلاّم پێش ئەمە، پێویست دەکات بەکورتی ئاماژە بکرێ بۆ ئەوەی کەیەکەم بلاوکردنەوەی رەسمی دەستوری عیراق،

دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٦٨/٩/٢١، واتا کەمتر لەدوو مانگ پاش کودەتاکەی بەعس دژی عەبدولرەحمان عارف. ئەم دەستورە چەند جارێك گۆڕانی بەسەر هاتوەو هەموو جارێك کە حکومەتی بەعس تووشی بارودۆخێکی نوێ دەبو، دەستی دەکرد بەگۆڕینی هەندێ بڕگە بۆ ئەوەی باشتر بیلوێنێ لەگەڵ خواستو ویستە سیاسیەکانی خۆی. لەم بارەیەوە، لەساڵی ١٩٦٨ەوە تا ساڵی ١٩٨٣، واتا لەماوەی ١٥ ساڵدا، دەستوری عیراقی شەش جار هەموار کراوە. دەبێ بوترێ کەسەرەڕای ئەو هەموو گۆڕانکاریە، بڕگەو پرنسیپە سەرەکیەکانی دەستوری عیراقی واتا جەوهەرو سروشتی هەروەکو خۆیان مابونەوە، هیچ گۆڕانکارییەك نەهاتبو بەسەر ئەو پرنسیپانەی کە پەیوەستن بەرێکخستنی دەسەڵاتەوە. بێ گومان هەتا کەوتنی سەدام حوسەین، دەستوری عیراقی کەراکتەری "کاتیی" بەخۆی هێشتبوەوە، چونکە ئەم کەراکتەرە کاتییە رەنگدانەوەی فەلسەفەی بەعسیە کە "شۆڕش" دادەنێ بە " شۆڕشی بەردەوام". هەر لەبەر ئەمەشە کە ئەم دەستورەی بەعس کە لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە دانرابوو، هەموار دەکراو هەمیشە کەراکتەری "کاتی" هەبوە[١١١].

ئەمجا، بەگوێرەی دەستوری عیراقی، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی دەسەڵاتی باڵای دەوڵەتی پێکدەهێنا[١١٢]. ئەنجومەن ئەو یاساو رێنماییانەی پەسەند دەکرد کەهێزی یاساییان هەیە[١١٣]. ئەنجومەن ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوەشی پێ ڕاسپێردرا بوو: رێنماییەکانی حکومەت سەبارەت بە بەرگری نیشتمانیو ئاسایشی گشتی دەبوایە لەلایەن ئەنجومەنەوە پەسەند بکرایە. ئەنجومەن مافی ئامادەکردنی گشتیو راگەیاندنی جەنگی هەبوو. ئەنجومەن پەسەندکردنی بوودجەی گشتی دەوڵەتی دەکرد. ئەنجومەن پەیمانە نێو دەوڵەتیەکانی پەسەند دەکرد. ئەنجومەن ئەو یاسایانەی دادەنا کە پەیوەست بوون بەتاوانبارکردنی هاووڵاتیانو مافی جێگیر کردنی مەحکەمەی تایبەتی بۆ حوکمدانیان[١١٤]. سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەهەمان کاتدا سکرتێری گشتی حزب بو و هەروەها سەرۆکی کۆمار بووو سەرکردەی هێزی لەشکرو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو[١١٥]. جگە لەوەش، سەرۆکی ئەنجومەن جێگری

سەرۆك و حاكمەكان و فەرمانبەرە سەربازیەكانی دادەناو دەسەلاتی لابردنیانیشی هەبوو[١١٦].

هەروەكو تێبینی دەكەین، سەرۆكی كۆماری عیراقی، ئەحمەد حەسەن بەكر، ئەم هەموو دەسەلاتانەی كەڵەكە دەكرد لەدەستی خۆیدا لەرێگەی میكانیزمی ئەنجومەنی سەركرایەتی شۆڕش (ئۆرگانی یاسادانەرو راپەڕاندنی دەوڵەتی عیراقی).

كە سەدام حوسەین مومارەسەكردنی ئەم هەموو دەسەلاتانەی پاش ئەحمەد حەسەن بەكری بۆ مابێتەوە، ئەمە شتێكە كەنابێ بەتەنها دەسەلاتی رەهای سەرۆك شیبكاتەوە. پێویستە بگەڕێین بەشوێن فاكتەرێكی دیكە. كۆنترۆڵ كردنی تاكەكەسی (شەخسی) بەسەر سەرجەم ئۆرگانەكانی زانیاری مەدەنی و عەسكەری و پۆلیسی سیاسی، فاكتەرێكی سنووردانەری پێكدەهێنا بەرەو دەسەلاتێكی رەها. شیكردنەوەیەكی كورتی ژیانی سیاسی سەدام حوسەین یارمەتیمان دەدات لە تێگەیشتنی ئەم بابەتە.

سەركەوتنی سەدام حوسەین لەناو حزبی بەعسدا، لەراستیدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سالانەی كە دوا بەدوای چونە ناو حیزبەوە هاتن لەساڵی ١٩٥٧ [١١٧]. ئەو كاتانە، سەدام تەمەنی ١٨ ساڵ بوو كە لەلایەن حیزبی بەعسەوە لەسەر ئاستی سیاسی پەروەردە كراو زۆر جۆش و ئارەزووی خۆی دەربڕی بۆ ئایدۆلۆژیای بەعس. دەبێ بوترێ كە یەكەم چالاكی سیاسی سەدام حوسەین بریتی بوو لە پاڵ پێوەنانی هەڤالان و خوێندكارانی گەڕەكەكەی بۆ كاری ناڕەواو دزی و لێدانی خەڵكی. بەنۆزدە ساڵی پیاوێكی كۆمۆنیستی كوشت بەناوی سعدون ئەلناصری و شەش مانگ پاش بەندیخانە ئازاد كرا[١١٨]. لەساڵی ١٩٥٩ هاوبەشی كرد لەهەوڵدانی كوشتنی عەبدولكەریم قاسم[١١٩]. بێ گومان، ئەم روداوە بوو بە هۆی راكردنی بۆ سوریاو لەوێ لەلایەن میشێل عەفلەقەوە بەگەرمیەوە پێشوازی لێ كراو پلەی حیزبی بەرز كرایەوە. چوار مانگ پاش نیشتەجێ بوونی لەسوریا، نێرا بۆ میسر بۆ ئەوەی لە كۆلێژی یاسا لەقاهیرە خوێندن تەواو بكات. كاتێك حیزبی بەعس لەساڵی١٩٦٣ دەسەلاتی گرتە

دەست، سەدام گەڕایەوە بـۆ بـەغداد و بەرپرسـێتی نوسـینگەی کاروبـاری جوتیـاریی وەرگرت. بەڵام مێژووی سـەدام حوسـەین وەك کەسـایەتییەکی گرنـگ لـەناو حـیزبی بەعسدا، بەراستی پاش کەوتنی یەکەم حکومەتی بەعس دەستی پێکرد.

لەمانگەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٦٣و ١٩٦٤، رێکخراوی حـیزبی بـەعس تارێژەیـەك پرش‌و بڵاو بوو بووەوە بەهۆی راوەدووی رژێمی حیزبی بەعس. سەرکردایەتی ناسیۆنال کە ئەو کاتانە لەدیمەشق جێگیر بوو بووو لەلایەن میشێل عەفلەقەوە سەرکردایەتی دەکرا، بەرپرسێتی رێکخسـتنەوەی حیزبەکـەی وەرگـرت. پـاش چـەند پەیوەندییـەك لەگـەڵ کەسایەتییە بەعسیەکان، سەرکردایەتی ناسیۆنال توانی لقی عیراق لەرێگەی سکرتێرە گشـتییەکەیەوە رێکبخاتـەوە. لەسـاڵی ١٩٦٤ ئەحمـەد حەسـەن بـەکر بەسـەرۆکی سەرکردایەتی "هەرێمی" عیراق هـەڵبژێردرا و بەپەسـەند کردنـی میشـێل عەفلـەق سەدام حوسەین بو بەئەندامی سەرکردایەتی ناوچـەی عـیراق‌و بەرپرسـی رێکخسـتنی سەربازیی حیزبی بەعس [١٢٠].

لەنێوان ١٩٦٤و ١٩٦٦، سەدام حوسەین توانـی شـانەکانی ئـەوەی کـەدوایی دەبـێ بەدڵی پۆلیسی سیاسی‌و موخابەراتی نهێنی رژێمی بەعس، رێبخاتەوە. ئەو کاتانە ئەم رێکخراوە پێی دەوترا "جهاز الحنين".

لەسەر بناغەی دابەشبونی حیزبی بەعس بەسەر چەند شانەیەکی پچـڕاو لەیـەکتری، سەدام حوسەین دەستی کرد بەخستنە چوار چێـوەی ئـەو بەعسـیانەی کـەزۆر بـەتین‌و جۆشەوە کاریان دەکرد و دوایش بوون بەپسپۆڕی موخابەراتی نهێنی [١٢١].

بەم شێوەیە، پاش گرتنە دەستی دەسەڵات لەسـاڵی ١٩٦٨، موخابـەراتی ئاسایشـی حیزب وورده وورده بون بەمسۆگەرترین چەك بۆ سـەپاندنی دەسـەڵات بەسـەر حـیزبی بەعسـدا. کـاتێك لەنۆڤەمبـەری ١٩٦٩، سـەدام حوسـەین بـو بـەجێگری سـەرۆکی ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شـۆڕش‌و جێگـیری سـکرتێری گشـتی حـیزبی بـەعس، بەتوانایەکی مەکیەڤێللیانە سـەرکەوت لەئـەرکی گۆڕینـی لقـی نـهێنی حـیزب بـۆ ئامرازێکی کۆنترۆڵ بەسەر کەسایەتییە بەعسیەکاندا. لەبەر ئەوە، لقی نهێنی بـەعس

بوو بەهێزێکی سیاسی راستەقینە لەناو حیزبدا و بوو بە حیزب لە ناو حیزبدا. شایستەی جەخت خستنە سەرە، کە لەرێگەی ئەم "حیزبە بچوکەوە" ، سەدام حوسەین توانی بەراستو بەچەپ هەمو ئەو کەسانە لەناو بەرێ کەدژایەتی دەسەڵاتیان دەکرد. نابێ ئەوە لەبیر بکرێ کەکاتێك بوو بەسەرۆکی کۆمار، زۆر کەڵکی لەم "حیزبە بچوکە" وەرگرت بۆ هارِینی زۆر لەحیزبیە کۆنەکانو دوورخستنەوەیانو هێنانی بەعسی دیکە لەپلەی نزمتر لەخزمو کەسو کارو برادەرە کۆنەکانی[١٢٢]. لەوانەیە، چاوخشانێك بەسەر ئەو روداوانەی کەدوا بەدوای لابردنی ئەحمەد حەسەن بەکردا هاتن، زۆر کەڵکی هەبی بۆ تێگەیشتنی ئەم بابەتە.

لەیانزەی تەمموز، کۆبونەوەیەکی تایبەتی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری دا لەسەر لابردنی ئەحمەد حەسەن بەکرو دانی دەسەڵات بەسەدام حوسەین. بێگومان، دەبێ بوترێ کەدانی دەسەڵاتی سەرۆك بەسەدام ، رەزامەندی هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی لەسەر نەبوو. هەندێك پشتگیری لابردنی ئەحمەد حەسەن بەکریان نەکردبوو. لەوانەیە لەبەر خۆشەویستی بۆ سەرۆکی بە تەمەنتر یاخود لەبەر هەندێ رق یان حەساسیەت بۆ سەدام حوسەین. گومانی تێدانییە، لەناو سیستەمێك کەعەقلیەتی هاوکات عەشایەریو تۆتالیتار بەسەریا زاڵە، مەسەلەی زۆرینە یان زۆرینەی فراوان پشو نادات بەدڵی ئەو کەسەی کەدەیەوێ ببێ بەخاوەن دەسەڵاتی رەها. لەدیدی عەقلیەتێکی لەم بابەتەوە، پێویستە سەرجەم ئەندامان بەبێ مشتومڕو بەبێ "تحفظ" هەڵسن بەهەڵبژاردنی سەرۆك. ئەگەر وانەبێت، ئامێری دەسەڵاتی رەها دەست دەکات بەجوڵانەوە بۆ داهێنانی دوژمن لەهەموو شوێنێك. ئەوەی کەڕوویدا لەکۆبونەوەکەی ٢٢ی تەمموزی ١٩٧٩، بەبێ گومان جەخت لەسەر ئەم باسە دەکاتەوە. ئەو رۆژە، کادێرە گەورەکانی حیزب کۆبونەوە بۆ گفتو گۆکردن لەسەر کاروباری دەوڵەتی بەعسی. کۆبونەوەکە بەوتارێکی ئیرتجالی دەستی پێکرد لەلایەن تەها یاسین رەمەزان، برادەری سەدام حوسەینو سەرکردەی میلیشیای حیزب، "الجیش الشعبي" . بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، تەها یاسین دەستی کرد بەباس کردن لەبونی

"کودەتایەك" دژی "حیزبو شۆڕش"و لەوەی کەهەندێ "ناپاك" لەهۆڵەکەدا هەن. بێ گومان، ئەم ناپاکانە کەکۆکرابونەوە، تەنانەت ئاگاداریش نەکرابونەوە لەسەر بابەتی کۆبونەوەکە. ئەجارەیان کێ هەڵسوڕێنەری ئەم کودەتایە ؟ سوریا. دەزانرێ کە لەساڵی ١٩٧٥ەوە، سوریا هەوڵی لەناوبردنی ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام حوسەینی دەدا بۆ ئەوەی رێگە خۆش بکات بۆ بەدیهێنانی یەکێتی نێوان عیراقو سوریا لەژێر دەسەڵاتی حافظ الاسد. لەسەر بنچینەی تاوانبار کردنو شایەتی هەندێ بەعسی، سەدام حوسەین لەو کۆبونەوەیەدا بەدەنگێکی پر لەغەم دەستی کرد بەخوێندنەوەی ناوی ئەو"ناپاکانە". پاش تەواوکردنی وتارەکەی، شەستو شەش کەسایەتی لەهۆڵەکە هێنرانە دەرەوەی هۆڵەکەو ئەو ئەندامانەی کە مانەوە، دەستیان کردبە بەرزنرخاندنی سەرۆکی نوێو ووتنی سرودی سەرکەوتن دژی دوژمنەکانی میللەت. لە٢٨ی تەموز مەحکەمەیەکی تایبەتی پێکهێنراو ٥٥ کەسایەتی تاوانبارکران. لەم ژمارەیە، ٢٢یان لەسێدارە دران کە پێنجیان ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش بوون: محی عبدالحسین مشهدی، محمد عایش حمد، عدنان حسین الحمدانی، محمد محجوب مهدیو غانم عبد الجالی. سیوسێ کەسایەتی فرێدرانە بەندیخانەوەو سیانزەیان ئازادکران. لە هەمان کاتدا، حکومەتی بەعسی سەدامی، دەستی کرد بەخرۆشاندنی هەستی میللیو سەدەهاهەزار لەهاووڵاتی پاڵ پێوەنران بۆ خۆپیشاندان لەشەقامەکانی بەغدا بۆ ئەوەی وای دەرخەن کە لەسێدارەدانی ئەو کەسایەتانە بریتی بوە لە هەڵوێستێکی دادوەرانە [١٢٣]. رادیۆی بەغداش لەناوبردنی ئەو ناوبراوانەی وەك هێمایەك بۆ سەرکەوتنی "حزبو شۆرش"و "سەرۆكو پاڵەوان، سەدام حوسەین" ناو زەندکرد [١٢٤].

لە رۆژی هەشتی مانگی ئابدا، سەدام حوسەین راگەیاندنی ئەو کودەتایەی بە دەستکەوتێکی "شۆرشی بەعسی" لەقەڵەم داو دادگایی کردنی ئەو "ناپاکانە" لەلایەن دادگایەك بەرێوەچوو کەنیوەی پێکهاتبون لەئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرشو ئەم رەفتارەشی بەرەفتارێکی مەزنی دیموکراسیی تۆتالیتار دادەنا. بەم بۆنەیەوە دەیگوت: ئەمە یەکەم جارە لەمێژووی بزوتنەوەی شۆرشگێری یان لەمێژووی خەباتی

مرۆڤایەتی کەپتر لەنیوەی سەرکردایەتی باڵا هاوبەشی دەکات لـەناو دادگایـەك(...) لەپێناوی زامن کردنی دادوەریو دەنگی حەقیقەت"[١٢٥]. دەبێ بوترێ کەتەنـها چـەند مانگێك بوو کە سەدام حوسەین جڵەوی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی گرتبوە دەست. هـەموو بەعسیەکانی سەر بە"هێزی ئیبلیسی ئیمپیریالیزمو زایۆنیزم"[١٢٦] دەبوایە لەمـەودوا لەناوبرانایە لەلایەن موخابەراتی نهێنی. لەهـەمان مـانگدا، جێگـری سـەرکردایەتی ناسیۆنال، منیف الرزاز، دەستگیر کرا، لـەئەپریلی١٩٨٠ عبدالکریم الشیخلی کـە یەکێك بوو لەبرادەرە کۆنەکانو کە پـاش ١٩٧١ دوور خرابـوەوە لـەحیزب، تـیرۆر کـرا لەبەغدا، پاش دوومـانگ سعد عبدالبکي الحدیثی کـە یـەکێك بـوو لەئـەندامانی سەرکردایەتی ناسیۆنالو ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شـۆرش هـەتا ١٩٧٤تـیرۆر کـرا. لیستی کوشتنو برینو خستنە بەندیخانەو تیرۆری ئەندامانو کەسایەتی بەعسو خـزمو کەسوکار زۆر دوورو درێژەو نامانەوێ لێرەدا ناوو بارودوخی لەناو بردنی ئـەم خەڵکـە دارێژین. بەڵام پێویستە بوترێ کە لەگەڵ هەڵمەتی لەناوبردن دژی"دژمنانی شۆرش " هەنگاوێکی سیاسیی نرا کە بەراستی" زیرەکیو زۆرزانی" بێهاوتای سەدام حوسەینی دەرخست.

ئەم هەنگاوە سیاسـیە چـی بـوو ؟ دروسـتکردنی ئەنجوومـەنی ناسـیۆنال"المجلس الوطنی".

ئەنجومـەنی ناسـیۆنال کەپێشـبینی دەکـرا لەلایـەن دەسـتوری کـاتی ١٦ تـەمموزی ١٩٧٠[١٢٧] بەگوێرەی یاسـای ژمـارە ٥٥ لـەئاداری ١٩٨٠ دروسـتکرا[١٢٨]. ئامـانجی ئەنجومەنی ناسیۆنال، بەرۆکەش یاسادانەر، چی بوو؟

هەر وەك بەرەی نیشتمانی ناسیۆنالیستی پێشکەوتخواز، ئەنجومەنی ناسیۆنال دەبوایە رواڵـەتێکی دیموکراتیکـی ببەخشـیایە بەدەسـەڵاتی بـەعس کەسـەرکردایەتی دەکـرا لەلایەن سەدامەوە. ئەمەش چ لەناو وولاتو چ بەرامبەر رای گشتی جیـهانی. لـە٢٠ی حزیرانی ١٩٨٠، ٢٥٠ دووسەدو پەنجا لەکۆی٨٤٠ چوارسەدوچل کـاندید کـران[١٢٩]. بارودۆخو هەلومەرجی هەڵبژاردنی کاندیدە بوون چی بون؟

هەڵبژێردراو دەبو تەمەنی زیاتر بێ لـە ٢٥ ساڵو هاووڵاتی عـیراقی بێـتو باوكو دایکیشی عیراقی بن. زیاتر لەوەش، نەدەبوو ژنەکەی بێگانە بوایـەو بەتایبـەتی دەبـو "باوەڕی بە پرینسیپەکانی شۆرشی تەمموز" هەبوایە[١٣٠]. بۆ ئـەم مەبەستـە، لیژنـەی تایبەتی دروستکران لەپێناوی زامنکردنی ئەم هەلومەرجەو رۆژی هەڵبژاردن، سـەدام حوسەین لەسەر تەلەفزیۆن دەردەکەوت بۆ ئەوەی بڵێ:

"ئێمە دەبێ ئەوە مسۆگەر بکەین کەسیانزە ملیـۆنو نیـو هـەمان رێگـە وەربگـرێ. ئەوەی کەرێگەی چەوت وەردەگرێ، خۆی بەرامبەر شمشێر دەدۆزێتـەوە"[١٣١]. لەکـەشو هەوایەکی وا ترسناکدا، کێ دەیتوانی دەنگ نەدات بۆ بەعسیەکان؟

زیاتر لەوەش، هەلومەرجی خۆهەڵبژاردن بەشێوەیەکی وا وورد دارێژرابون کە بوبـون بەبەربەستێك بـۆ هـەڵبژاردنی ئەوانـەی کەبەعسـی نـەبون. لـەباودۆخی وادا چـەند کەسایەتی سەربەخۆ دەیانتوانی هەڵبژێردرێن؟

رۆژی دوای پرۆسـەی هەڵبژاردنەکـە، حکومـەتی بـەعس ئـەنجامی هـەڵبژاردنی رادەگەیاند: لەکۆی ٢٥٠ ئەندام، تەنـها١٧ "سـەربەخۆ" هـەڵبژێردران[١٣٢]. لـەنێوان نوێنەرە بەعسـیەکان، چواریـان ئـەندامی ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شـۆرش بـوونو چواریان وەزیر بوون. بەم شێوەیە، ئەم "هەڵبژاردنە"، لە روانگەی دەسەڵاتی بەعسیەوە، "بەراستی بریتی بوو لەرەنگدانەوەی پاڵپشتی میللی بۆ سەرۆك سەدام حوسەین"[١٣٣].

سەرۆکی بەعسیش لەکاتی کردنەوەی ئاهەنگی سەرکەوتنی حـیزب، رۆژنامەنوسـی عیراقیو عەرەبو بیانی بانگکردبوو بۆ ئەوەی "ئەزمونی هەڵبژاردنو واتای ئەم پرۆسە دیموکراتیە"[١٣٤] لەعیراقدا پیشانی رای گشتیو جیهان بدات. رۆژنامە نوسێکی New York Times بەم شێوەیەی خوارەوە جەژنی خۆشی ئەنجامی ئەم پرۆسەی هەڵبژاردنەی لەشارێك لەشارەکانی عیراق وەسف دەکات:

"لێرە، لەنەجەف، شارێکی نزیك رۆخی فورات، کەپیرۆزە بـۆ موسـڵمانە شـیعەکان، پارێزەر مضبان خدیر پێشوازی کرد لەمیوانەکان لەناو ژورێك (نوسینگەی خۆی) کـە هەشت تەلەفۆنو شـەش وێنـەی سـەدام حوسـەینی تێدایـە". کـاتێك کەسوپاسـی"

سەرکردەی حیزب‌و شۆرشی دەکرد" بۆ ئەم روداوە میژوییە دەیگوت کە "پشگیری‌و خۆشەویستیان بۆ سەدام حوسەین دەردەبرن. سەدام حوسەین ئومێدی نەتەوەی عەرەب‌و نیشتمانی عەرەبە"[١٣٥].

دەبێ تیشك بخرێتە سەر ئەوەی کە هەتا حوزەیرانی ١٩٨٠، عیراقی بەعسی لەلایەن سیستەمێکی سیاسیەوە دەبرا بەرێوە کەجەستەی یاسادانەری بریتی بوو لەئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش. لەگەڵ هاتنی سەدام حوسەین، چالاکی تەشریعی بەرواڵەت گوێزرایەوە بۆ ئەنجومەنی ناسیۆنال. بەلام چۆن دەتوانرێ باسی وەزیفەی تەشریعی‌و سەربەخۆی ئۆرگانێکی دادوەری بکرێ کەنزیکەی سەرجەم ئەندامانی بەعسین‌و فەرمان وەردەگرن لەئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش کە بەدەوری خۆی بەتەواوی ملکەچە بۆ ویستی سەرۆك؟

لەراستیدا، ئەوەی کەگرنگ بوو ئەوەبوو کە(جگە لەرواڵەتێکی دیموکراسی کەسەرۆك دەیویست بیدات بەدەسەلاتی خۆی) لەپراکتیکدا سەدام حوسەین دەیویست لەسەردووپەت یاری بکات: لەگەڵ هەندێ پەرلەمانتاری کوردی" بێلایەن " دەیویست هەموو ئەو بەرگریە هەلمژێت کە دەجولایەوە دژی دەسەلاتی مەکینەی بەعس، بەلام لەهەمان کاتدا دەیویست هەلمەتی کوشتن‌و برین داپۆشێ لەرێگەی هەلوێستی"چاکە" بەرامبەر عیراقیەکان بۆ ئەوەی بۆنەی هەبێت نوێنەری خۆیان هەلبژێرن . ئەم یاریە بریتی بوو لەیاری "گوێزەرو دار" یاخودلەیاری "رێوی‌و شێر" کە مەکیەڤێلی باسی لێ دەکات: "میریك دەبێ بزانێ کەلك لەئاژەل وەربگرێ . دەبێ بۆ ئەو مەبەستە رێوی‌و شێر هەلبژێرێ ، چونکە شێر ناتوانێ خۆی بپارێزێ لەتۆری تەلەو رێویش لەگورگ. لەبەرئەوە دەبێ وەك رێوی بێت بۆ ئەوەی تۆری تەلە بناسێت‌و وەك شێر بێت بۆ ئەوەی گورگ بترسێنێ"[١٣٦]. جگە لەوەی کە تائێستا هێلمان بەژێردا هێناوە، پێویستە بوترێ ئەوەی کە سەدامی کرد بەخاوەنی رەهای عیراق ، بریتیە لەتوانای بۆ شاردنەوەی مەرامی خۆی‌و پەنابردن بۆ فێل‌و وورییایی بەرامبەر مەترسی‌و سروشتی عەمەلی‌و سەرکەوتن لەهونەری ترساندن‌و تۆقاندنی ئەوەی بەرامبەری. بەلام

لەهەمان کاتدا سەدام دەیزانی چۆن خۆی خۆشەویست بکات‌و برادەر لەدەوری خۆی کۆبکاتەوەو خۆشەویستی‌و توندوتیژی پێکەوە تێکەڵاو بکات . لەبەردەم جەماوەر، سەدام بەباوکێکی بەبەزەیی‌و بەسۆزی عیراقیەکان خۆی پیشان دەدا ، بەڵام بەباوکێکی بێ بەزەیش لەگەڵ برادەرەکانیداو لەگەڵ ئەوانەی کە دەوروپشتیان دابوو بەتایبەتی لەگەڵ دەستوپێوەندو موخابەراتی نهێنی باشترین پەیوەندی هەبوو. پەیوەندی برادەرایەتی لەگەڵ ئەوانەی کە کوێرانە ملکەچیان بۆ دەکرد ) بەکاردەهێنا دژی ئەوانەی کەهەستی دەکرد برادەرنین یاخود دوژمنن. لەکۆبونەوە تایبەتیەکەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش لەبەرواری١١ تەموزی ١٩٧٩ کەبڕیاری پالاوتنی سەرۆکایەتی بۆدا ، سەدام حوسەین گوێی گرتبوو لە محي عبدالحسين مشهدي کەقسەی کردبوو دژی لاچونی ئەحمەد حەسەن البکر . گوێی لێگرتبوو کەوتبوی :"شتێکی ناپەسندە کە تۆ دەبێ خۆت بکێشیتەوە"، " ئەگەر تۆ نەخۆشی بۆچی نەختێ پشوو نادەیت ؟"[١٣٧]. هەروەها تێبینی کردبوو کە محەمەد عایش حەمەد" بەشێوەیەکی نائاسیی رەفتاری دەکرد و " دەیزانی" کە بەرقەوە" تەماشای دەکرد. گومان کردن لەم هەڵوێستە ، وای لێ کرد کەرۆژێکی پێش کۆبەنەوەکە ، تارق عەزیز را بسپێرێ کەبڕواو ئێواریەك لەگەڵ عایشدا بەرێتە سەر بۆ تاقیکردنەوەی هەڵسوکەوتی . برادەری سەروەرو نێردراوی خۆشەویستی سەدام پاش ئەوەی ئێوارەیەکی لەگەڵدا بردە سەر، بەدەستی خاڵی گەڕایەوە . بەڵام پەیامی تارق عەزیز سەرۆکی رازی نەکرد . بەرزان تکریتی ، زڕبرای‌و جێگری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش‌و عزەت ئیبراهیمی نارد بۆ لای[١٣٨] . ئەم شێوازە ، رێگەیەك بوو لەرێگاکانی لەناو بردنی دوژمن‌و ئەو کەسانەی ملکەچی رەهایان بۆ نەدەکرد. شێوازی دیکەش بریتی بوو لەبەرەنگار بونەوەی راستەوخۆ. لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٩ ، سەدام حوسەین دوو وەزیری کۆمۆنیستی بانگ کردبوو بۆ نوسینگەی خۆی بۆ ئەوەی باسی بەرزکردنەوەیان بکات لەدەزگای دەوڵەت. پاش دانیشتنیان، سەرۆك چەکەکەی دەرهێناو کوشتنی[١٣٩] . یاخود لەکۆبونەوەیەکی ئەنجومەنی وەزیران لەساڵی ١٩٨٢ ، وەزیری تەندروستی رياض ابراهيم حسين پێشنیازی

کردبوو بۆ سەدام کە بەشێوەیەکی کاتی خۆی بکێشێتەوە لە بەرپرسێتیو ڕێگە بدات بە احمد حسن البکر کە (هەتا ئەوسا لەژیاندا بوو) ڕێگە خۆش بکات بۆ وەستانی جەنگو وتوویژ لەگەڵ ئێراندا. وەڵامی سەدام چی بوو؟ "بابڕۆین بۆ ژورەکەی دیکەو پاشان گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەین". بێ گومان وەزیر ئەمەی پەسەند کردبوو و پاش چەند چرکەیەك، دەنگی گوللەیەك بەرزبووەوە. سەدام حوسەین بەتەنها گەڕایەوە بۆ کۆبونەوە کە هەر وەکوهیچ روی نەدابێ[١٤٠]. ئەوانی دیکە توانیان هیچ بڵێن یان هیچ بکەن؟ لەترسی ئەوەی تاوانبار نەکرێن بە ناپاكو هەڵسورێنەری پیلانو دوایش بکوژرێن یان تیرۆر بکرێن، لەبەر ئەوە باشتر نەبوو بێ دەنگ بن؟ کامیان باشتر بوو: بێ دەنگ بن یاخود زووبەزویی دەستگیر بکرێن لەلایەن موخابەراتی نهێنی کە دەورپشتی هۆڵەکەیان گرتبو؟

ئەم شێوازە، شێوازی بەرەنگار بونەوەی ڕاستەوخۆو کوشتن، سروشتی سایکۆلۆژی سەدام پێکدێنێ. هەوڵدانی کوشتنی عبدالکریم قاسمو کوشتنی سعدون الناصری لەتەمەنی ئەو پەری گەنجیەتیداو پێشنیازکردن بۆ کوشتنی علی صالح السعدی"بەگوللەیەکی پەنجا فلسی"[١٤١]، ئەم شێوازە دەردەخات. شێوازی خەڵکی عیراقی بیابان بەدابو نەریتی تیرەگەریو پێکهاتەیەکی سایکۆلۆژی پڕ لەرقو کینەو گیانی تۆڵە سەندنەوە کاتێك کە زمانی خۆشەویستی فەشەل دەکات. سەرەڕای هەموو شتێك، سەدام حوسەین بە"سومبول"، سومبولی حیزبو شۆڕشو میللەت دادەنرا. لەساڵی ١٩٨١ تەها یاسین ڕەمەزان دەیگوت: لەناو ڕێکخراوی ئێمەدا، سەرۆك سەدام حوسەین هەمیشە سکرتێری گشتی حیزبەو ڕێزی لێ دەگیرێ چونکە گوزارشت دەکات لە ئایدۆلۆژیای حیزبو ویستی میللەت"[١٤٢]. ڕاپۆرتی سیاسیی کۆنگرەی ناوچەیی نۆهەم لەساڵی ١٩٨٢ دەیگوت "سەدام حوسەین سومبولی ئازادیو سەربەخۆییو فەخرو ڕاستگۆییو ئاواتە لەپێناوی داهاتویەکی باشتر بۆ عیراقو میللەتی عەرەبو ئەم ڕاستیە(. . .) پاڵ بەئێمەوە دەنێ دوای ئەو بەیاغە کەوین کە ئەو بەرزی کردۆتەوە بەهەموو خۆتەرخانکردنو لەخۆبوردەییو توانای پێویستەوە.[١٤٣]

# پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

١- بڕوانە:
Magid Khaddury, Political Trends in the Arab World , The Role of Ideas in Politics, Baltimore: John Hopkins University Press, 1970, P. 153.

یان

Middle East Forum, Forum Interview, Michel Aflaq, Tome III, February, 1958, P.9.

2- Shafik A.R. assamarraie, Le Parti Bath Arabe – Socialiste et son role dans la politque arabe depuis sa creation a nos Jours, ( these de doctorat d'etat, Univeraite de droit et des sciences economiques, Nice, nov., 1976, P.23 .

3- Olivier Carre, Le nationalisme arabe, Fayard, 1993, Paris, P. 43.

4-Middle- East Forum, ibid, P.9 .

5- Norma Salem Babikian, "Michel Aflaq, A Biography outline , in , Arab Studies Quartery, Institute of Arab Studies and A.A.U.S. , Vol. II, P.162.

6- Hanna Batatu, The Old Social Classes and Revolutionary Mouvement of Iraq, A Study of Iraq's Old Landed and Commercial Classes and of its Communists , Bathists and Free Offices , 1978 , Princeton University Press , P. 725.

7- Patrick Seale , The Struggle for Syria, A Study of Post–War Arab Political 1954 – 1958 , 1965 , Oxford University Press , London, New York , Toronto, P. 148 .

8- Norma–Salem Babikian , Ibid, P. 164.

بڕوانە هەروەها Magid Khaddury , Arab Contemporary , The role of Personalities in Politics , 1973 , Baltimore : Johns Hopkins University , P. 213;

Kamel S. Abu Jaber , The Arab Bath Socialist Party , History , Ideology and Organization , 1966 , Syracuse University Press, P.10- 119.

Walfik Raouf , Nouveau regard sur le nationalism arabe, Bath et Nasserisme , 1984 , L'Harmattan , Paris , P. 92 .

9- Samir al–Khalil , Iraq , La machine infernale , Politique de l'Iraq moderne , 1991, Edition Jean–Claude Lattes , P.241 .
10- C . R . M . A . C , Parti Bath , Cahier 5 , p. 2 .

لەسەر پارتی میللی عەرەب ببینە:

Labib Yamak , The Syrien Social National Party , 1966, Cambridge , Mass , Harvard UN. Press ; Ed . SAAB, La Syrie Ou La revolution dans la rancoeur , 1968 , Julliard P.47.

١١- شبللى العيسمي، حزب البعث العربي الاشتراكي ، مرحلة الاربعينيات التأسيسية ١٩٤٠-١٩٤٩ ، دار الطليعة ، بيروت، الطبعة الثالثة، ص ٢١ .

12- Norma – Salem Babikan , of . cit ., P. 169 .
13- Patrick Seale, the Struggle for Syria , of . cit . p. 15
14- Roger Faligot et Remi Kauffer , Le Croissant et La Croix gammee , Les Secrets de l'alliance entre l'islam et le nazisme de Hitler a nos Jours, Editions Michel Albin , 1990 , Paris , Paris , p . 83 .

١٥- بۆ زیاتر لەزانیاری تەماشای هەمان سەرچاوە بکە، ص ٨١- ٨٤ .

16- Patrick Seale, of. Cit, p. 8.
17- Samir al – Khalil, of. Cit., p. 243

١٨- شيبلي العيسي، حزب البعث العربى الآشتراكي، نفس المصدر ، ص ٣٣ – ٣٤ .

١٩- سامي الجندي ، البعث ، بيروت، دار النهار للنشر ، ١٩٦٩ ص ١٩ .

20- Wafik Raouf, of. Cit., P. 96.

٢١- عەلەویەکان پێشیان دەوترێ نووسەیری. لەسالأنی دوای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، عەلەویەکی عەدەنە بەناوی محمد غالب الطویل کە سەرکردەی پۆلیس بوو دەستی کرد بەنووسینی " مێژووی عەلەویەکان" کە لەسالّی ١٩٢٤ بەعەرەبی بلأوکرایەوە (تأريخ العلويين) . لەم پەرتوکەدا محمد غالب الطویل بۆ یەکەم جار ناوی نووسەیریەکانی گۆڕی بۆ عەلەوی . لەو سالأتە بەولاوە عەلەویەکان کە هەر لەسەدەی ناوەڕاستەوە بەنووسەیری ناوبراوون ئەو ناوەیان وەرگرت . پەرتوکەکەی محمد امین غالب الطويل دەیویست نوسیریەکان دوور بخاتەوە لەسومعەی نێگەتیڤ چونکە ناسرابوون وەك ئەوانەی کە لەئایین لایان داوە (heretiques) یاخود ئەوانەی کە بێ ئاینن و هەروەها دەیویست عەلەویەکان دەربخات وەك شیعەی دوانزە گرێ . هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە لەسالّی (١٩٢٤ )ەوە کە لەشارەکانی خواروو حاکم کرا بەجەعفەری دوانزە گرێ. ببینە:

Encyclopedie de l'Islam, Editions Leiden, E.j. Brill, 1995, p. 149.

٢٢- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٨ – ١٥٠ ، بڕوانە:

23- Hanna Batatu, of. Cit. P. 723

٢٤- هەمان سەرچاوە، ل ٧٢٣ .

٢٥- هـ. س. ل ٧٢٣ . هەروەها ببینە

Hisham B. Sharabi, Governments and Politics of the Middle – East in the Twetieth Century, 1982, New York, pp. 125 – 126.

٢٦- هـ . س . ل ٤٢٣ .

27- Samir al–Khalil, Iraq, of. Cit., p. 244.
28- Olivier Carre, of. Cit. 1p.42.

٢٩- سەبارەت بە بیری زکی الارسوزی، بڕوانە ئەم پەرتوکانەی خوارەوە:

زکی الارسوزی ، العبقریة العربیة في لسانها، مطبعة الحیاة، دمشق( الطبعة الثانیة).

Samir al–Khalil, op.cit., p.244- 245 .Olivier Carre, Le Nationalisme Arabe , op. cit., pp, 71-90 .

٣٠- جلال السید، حزب البعث العربي، بیروت ، دار النهار للنشر ، ١٩٧٣ ، ل ١٩ .

٣١- هـ . س . ل٢٧ .

٣٢- حسن السعید، نواطیر الغرب، صفحات من ملف علاقة اللعبة الدولیة مع البعث العراقي ١٩٤٨- ١٩٦٨ ، بیروت، لبنان، ١٩٩٢، الطبعة الاولی ، ل. ٥٣- ٥٤.

٣٣- ببینە:

Bichara Khader, le Parti Bath, C. R. M. A. C., Institut des Pays en developpement, Universite Catholique de Levain, Cahier v, p, p 1-7

٣٤- بڕوانە حسن السعید، هـ . س . ل٦٢-٦٩ .

35- Fouad Mater , Saddam Husayn ou le devener irakien , la Sycomore, Paris, 1980, pp. 17-18.

٣٦- هـ. س . ل١٥٤ .

٣٧- بڕوانە :

Marion Farouk-sluglett and Peter-Sluglett, Iraq since 1958 , From Revolution to Dictatorship , 1987 , p. 90 and p. 157 .

بڕوانە هەروەها :

John Bullock and Harvey Morris , Saddam's War : The origins of the Kuweit Conflict and the International Response , Faber and Faber , London , 1991, p. 71 .

بۆ زیاتر لەزانیاری سەبارەت بەڕۆڵی لەناو حیزبی بەعسو بارودوخی کوشتنی، بڕوانە:

John F. Devlin , The Bath Party , A History From its Origin to 1966 , Hoover Instution Press Stanford , 1976 , p p . 149- 191 and n . 13 . 207 .

38- Amazia Baram , The Ruling Politcal Elite in Bathi Iraq , 1968 – 1986 : The Changing Features of a Collective Profile , in , Internationual Jouranal of Middle East Studies , vol . 24, Fasc. 4 , 1989 , pp 447 – 492 .

٣٩- بڕوانە کتێبەکەی ابن خلدون کە زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتنی میکانیزمی سیاسی بەعس: ابن خلدون ، المقدمة، دار احیاء التراث العربي، بیروت، (بدون تأریخ ) .

٤٠- بۆ زانیاری فراوانو دورو درێژ سەبارەت بەپەیوەندی خزمایەتیو ناوچەیی رژێمی بەعسی عیراقی بڕوانە : طالب الحسن، حكومة القرية، فصول من سلطة النازحين من ريف تكريت، الجزء الاول، دار اور للطباعة والنشر، بيروت، ٢٠٠٢ . بڕوانە هەروەها: جعفر الحسيني، على حافة الهاوية، العراق ١٩٦٨- ٢٠٠٢، دار الحكمة، لندن، ٢٠٠٣، بەتایبەتی ل ٩-١٢٠ .

٤١- بەلای بەتاتووەوە رێکخراوی حزب دوو جۆر لە ئەندامی هەبوو: ئەندامی ئەکتیڤو پالێوراو. پالێوراوەکان پاش شەشە مانگ تەزکیە دەکران بۆ ئەندامی ئەکتیڤ:

Hannah Batatu, The Old Social Classes and the Revolutionary Movement of Iraq, A Study of its Communists, Bathists, and Free Officers, Princeton University Press, Princeton, 1976, pp.742-745.

42- Ibid, p 816.
43- Marion Farouk – Sluglett, p. 69.

٤٤- بۆ زیاتر لەزانیاری بڕوانە:

Ala Tahir, Iraq aux origines du regime militaire, Editions L'Harmattan, Paris, 1989, pp. 40-45, pp. 152- 163.

٤٥- بۆ زانیاری سەبارەت بە ناوی وەزیرەکان ، بڕوانە:

Ala Tahir, Ibid. Pp. 132-133.
46- Ibid. Pp. 21-77.

٤٧- لیث الزبیدي، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق، وزارة الاعلام، بغداد ، ١٩٧٩، لەناو کتێبی:
Ibid, p. 182.

٤٨- حسن السعيد، نواطير الغرب، مؤسسة الوحدات للدراسة، بيروت، ١٩٩٢، ل ١٠٤- ١٠٥ .

٤٩- هەمان سەرچاوە، ل ١٠٥

٥٠- هەمان سەرچاوە، ل ١٠٥

51- Ala Tahir, Ibid, p.188.
52- Marion Farouk – Sluglett, Ibid. Ibid, p.65

٥٣- بۆ زیاتر لەزانیاری بڕوانــە: لیـث الحسـن الزبیـدي، ثـورة ١٤ تمـوز١٩٥٨ في العـراق، مكتبـة الیقظـة العربیـة، بغـداد، ١٩٨١ ، ل. ٣٦١-٣٧٥ . بڕوانـه هـەروەها ، خلیـل ابراهیـم حسـین، ثـورة الشواف في الموصل ١٩٥٩ .

٥٤- بۆ زیاتر لەزانیاری سەبارەت بە کەراکتەرو ئامانجو بارو دۆخی ئەم ڕوداوانە، بڕوانە:

Hanna Batatu, op. cit., pp. 866- 889.

Marion Farouk- sluglett, op. Cit., pp.66-70:

Ala Tahir, op. cit., pp. 198-204.

55- Marion Farouk – sluglett, Ibid, p. 65.

56- Ala Tahir, op. cit., p. 214

٥٧- یاسای بەرەسمی کردنی حزبە سیاسیەکان لەمانگی یەکی ١٩٦٠ دەرکرا، بەڵام ئەوەندە ناتەواو بوو کە نەیتوانی (جگە لەحزبی نیشتمانی دیموکراسیو حزبی جەمهوری) حزبــە سیاسـیەکان بخاتـە گۆڕەپانی سیاسی شەرعیەوە. بڕوانە:

Ala Tahir, Ibid. Pp. 233- 240.

٥٨- هەندی لەنووسەران پرسیار دەکەنو دەڵێــن چـۆن بەعسـیەکان توانیـان ئـەو لیسـتە دوورو درێژەیان هەبێت بەناوو ئەدرەسی کۆمۆنیسـتەکان. دەڵێـن کـە بـەدڵنیایی ئـەم لیسـتەیە لەلایـەن مخابراتی ئەمریکیەوە درا بوو بەعسیەکان لەترسی زیاد بوونــی هـێزو شـەرعیەتی کۆمۆنیسـتەکان لەساڵانی رابوردا. بڕوانە:

Marion Farouk – slugett, op. Cit., p.86.

زۆر روون نییە چۆن سی ئای ئەی (CIA) لەو مانگانەی پێش کودەتاکـە نـاوی کۆمۆنیسـتەکانی نەقڵ کردبوو بۆ حیزبی بەعس. پادشای ئەردەن لەچاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا لەگەڵ محمد حسنین دەیگوت: " بهێڵین با پێتان بڵێم کەدڵنیام لەوەی کە ئەوەی رووی دا لە٨ ی شوباتی ١٩٦٣ لەلایــەن سی ئای ئەیەوە پشتگیری لێکرا بوو. هەندێ لەوانەی کەحوکمی بەغدا دەکەن ئەم حەقیقەتە نازانن. زۆر ووتووێژ هەبوو لەنێوان حزبی بەعسو سی ئای ئەی لەوڵاتی کوەیت. دەزانــی (. . .) کـە لـە٨ی شوبات بنکەیەکی رادیۆی نهێنی هەبوو کە ناوو ئەدرەسی کۆمۆنیستەکانی ئاڕاستەی عیراق دەکــرد بۆ بەرپرسە عیراقیەکان؟ "

Hanna Batatu, op. Cit., pp. 985-986

جگە لەمەش، لەچاوپێکــەوتنێکدا لەلایــەن گۆڤـارێکی میسـری لەسـاڵی ١٩٦٧، علـی سـاڵح ئەلسەعدی دەیگوت: " ئێمە بەشەمەندەفەرێکی ئەمریکی دەسەڵاتمان گرتەدەست" بڕوانە:

Mahdi F., Les limites du development: remarques sur l’etat et la societe irakienne, in, L’Iraq, le Petrole et la gurre, peuples Mediterraneens, n. 40, Juil – sept, 1987, p.119

بەلاّم حسن ئەلسەعید دەڵێ کە علی ســاڵح ئەلسـەعدی وتویـەتی: " ئێمـە بەشـەمەندەفەرێکی ئەنگلۆ- ئەمریکی دەسەلاّتمان گرتە دەست" بڕوانـە: حسـن ئەلسـەعید، نواطـیر الغـرب، ه . س. ل ١٢٥. بۆ زیاتر لەزانیاری بڕوانە ه . س گشت کتێبەکە. هەروەها بڕوانە:

Edith and E, F. Penrose, Iraq International Relations and National Development, London, 1978.

59- Samir al-Khalil, Iraq, La machine infernale, Editions Jeans Claude Latte's, 1991,p.60 .

60- Hanna Batatu, Ibid., p. 982 .

ناوەڕۆکی ئەم بەیانە لەلایەن حەنا بـەتاتوەوە وەرگـیراوە لـە: الوقـائع العراقیـة، ژمـارە ٧٧١ لـە ١٨/٢/١٩٦٣. بەلاّم د. مجید خوری لەناوەڕۆکی ئەم بەیانە بەشێوەیەکی جیاواز دادەڕێژێ: بڕوانە، د. مجید خدوری، العراق الجمهوري، انتشارات الشریف الرضي، امیر رقم، ل ٢٦٤- ٢٦٥ .

61- John F. Devlin, The Bath Party, A History from its Origins to 1966, Hoover Institution Press, Stanford, California, 1976, p. 255 and n.2 p. 276.

٦٢- بڕوانە حسن السعید، ه. س. ل ١٣٩ .

63- Ibid, p. 990.

٦٤- علی ساڵح ئەلسەعدی دەرچوی خوێندنگەی بازرگانی بوو لەبـەغدادو لـە ١٩٦٠ەوە بوبـو بەسکرتێری گشتی حیزبی بەعس هەتا ساڵی ١٩٦٣و بو بەسەرۆکی حکومـەتی بـەعس لەشـوباتی ١٩٦٣. کاتێك پاش کەوتنی حکومەتی بەعسی لە نۆڤەمبەر هەوڵی دا "باڵی چەپ" دوور بخاتـەوە لەحیزب (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو ئەو بەعسیانەی کە دوایی لە ١٩٦٨ دەسەلاّت دەگرنە دەسـت)، خۆی دوور خرایەوەو ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر خرایە شوێنی.

65- Hanna Batatu, Ibid. p. 990.

٦٦- حسن السعید، نواطیر الغرب، ه. س. ل ١٣٩ .

٦٧- حسن السعید، ه. س. ل ١٣٩.

٦٨- محمد سعید النجدي، حصیلة الانقلابات الثوریة في بعض الاقطار العربیـة، دار امیـة، ١٩٦٦، ل٤٤، لەناو حسن سعید، ه. س. ل ١٣٩ .

69- Hanna Batatu, Ibid., p. 1012.

لەراستیدا یەك دەنگی نییە لەژمارەی ئەندامانی حەرەسی قەومیدا: بۆنمونە: نوسەرێك کە ئامـاژە دەکات بۆ رۆژنامەی بەعس دەڵێ کە لەمانگی ئازار ژمارەیان دەگەیشتە حەفتا هەزارو علـی سـاڵح ئەلسەعدی دەیگوت کە لەمانگی مایسدا ژمارەیان بیست هەزار بوو. بڕوانە:

John Devlin, op. cit. P.264.

بڕوانە هەروەها:

Uriel Dann, Iraq under Kassem, Praeger, New York, 1969, p.367.

٧٠- بۆ زانیاری سەبارەت بەلیستی ناوەکان بڕوانە:

Phebe Marr, The Modern History of Iraq, Westview Press, London, 1985, pp.331-332.

هەروەها بڕوانە، حسن ئەلسەعید، نواطیر الغرب ، هـ. س. ل. ٤٢٩-٤٣١ .

٧١- راپۆرتی سیاسی کۆنگرەی حزبی بەعس بەدرێژی ئەو روداوانە بـاس دەکـات کـە دوا بـەدای کودەتاکەی ١٧ی تەمموز هاتن‌و عەبدلرەزاق نایف‌و ئیبراهیم عەبدولرەحمان داودیان خستە لاوە، بڕوانە:

The 1968 Revolution in Iraq, Experience and Prospects, The Political Rapport of the Eith congress of the Arab Bath Socialist Party, January 1974, Ithacha Press, London, 1979, pp.20 –29.

72-Marion Farouk – sluglett, Ibid. P. 115. Phebe Marr, Ibid., p. 212 and n.2, p.332.

73- Samir al – khalil, Iraq, la machine infernale, op. cit., p. 83 .

74- Marrion Farouk- sluglett, Ibid. p.121.

75- Ibid, p.121 Samir al – Khalil, op. Cit., p. 86s.

٧٦- حسن ئەلسەعید، هـ. س ، ل ١٦٥ .

77- Max Sawdayee, All Waiting to be Hunged: Iraq Post Six Days Diary, Tel Aviv, Leranda Press, 1974, p,90.

78- Samir al-khalil, op. cit., p. 87.

79- Ibid. , p,88.

٨٠-لەسەر حیزبی کۆمۆنیست (قیادەی مەرکەزی)و عزیز الحاج بڕوانە

Abbas Kelidar, Aziz al- Haj: A Communist Radical, in, The Integration of Modern Iraq, Croom Helm LTD, London, 1979, PP. 183-192.

81-Hanna Batata. Of. Cit., PP. 1069-1071.

82-Marion Farouk- Sluglett., of. cit., PP. 121-122.

83-Samir al- Khalil, Ibid., P. 88.

84-The 1968 Revolution in Iraq, of. cit., P. 39.

85-Ibid., P. 40.

86-Ibid., P.40.

87-Phebe Marr, The Modern History of Iraq, of. Cit., P. 213

88-The Revolution in Iraq, Ibid., P. 41.

89-Ibid., PP. 45-48.

٩٠-بۆ زیاتر لەزانیاری بڕوانە:

.Hanna. Batatu, op. cit., PP. 11o1- 1105

91-Chris Kuschera, Le mouvement national Kurde, Flammarion, Paris, 1979, pp. 279-299.

92- Ibid., p. 287.

93- Hanna Batatu, op. cit., p.1103.

94- Ibid., pp. 1103-1004.

٩٥- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەناوەڕۆکی ئەم ڕێکەوتن نامەیە بڕوانە:

Ibid., pp. 1107-1008.

96- Richard F. Nyrop, Iraq, ACountry Study, the American University, Washington, D.C., 1979, po.199.

97- Ibid., pp. 198-199.

98- The 1968 Revolution in Iraq, op. Cit., p. 67.

99- Ibid., p. 68.

١٠٠- زۆر کتێبو نامیلکەو لێکۆڵینەوە هەیە لەسەر سیاسەتی بەعس دژی میللەتی کورد.

بڕوانە بەتایبەتی:

Mirella Galletti, Sviluppi del problema Kurdo 1976- 1978, in, Oriente moderno, n. 58, 1978, pp. 463-474.

Mirella Gallrtti, L'ultima rivolta kurda in Iraq, Oriente Moderno, n. 55, 1975, pp.462-472.

Edmond Ghareeb, The Kurdish Question in Iraq, Syracuse University Press, 1981.

Ismat cherif Vanly, Le Kurdistan d'Iraq, in, les Kurdes et le Kurdistan Couvrange Collectif dirige par Gerard Chaliand), Paris, 1978, pp. 285-305.

Chris Kutsuchera, le Mouvment national Kurde, op. Cit., 301-333.

Hans Rimscha et Ralf Schneider, Les Deportations dans le Kurdistan irakien et les refugies Kurdes eu Iraq , in, Les Kurdes Par-dela- l'exode, l' Harmattan, Paris, 1992, pp. 24-40.

١٠١- سەدام حوسەین، خندق واحد ام خندقان، لەناو کتێبی: الثورة والنظر الجدیدة، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٨١، ل ٢٢٠.

١٠٢- هـ. س. ل ١٠٨٧.

١٠٣- ووتاری سەدام حوسەین لەناو:

P. Mansfield, Iraq; the Contemporary State, London, croom Helm, 1982, p.68.

١٠٤- الثورة والنظر الجدیدة، هـ. س، ل ٢٢٢.

١٠٥- هـ. س. ل ٢٢٤.

106- Marion Farouk- Sluglett, op. Cit. P. 183.

١٠٧- سەدام حوسەین، خندق ام خندقان، ه. س. ل ٢٢٥ .

١٠٨- ه. س، ل ٢٣٣ .

109- Fouad Matar, Saddam Hasayn ou le devenir, Le Sycomore, Paris, 1980, p.225.

110- Ibid., p. 37

١١١-سەرچاوەی لێکۆڵینەوەمان دەگەڕێتەوە بۆ دەستوری عیراق ساڵی ١٩٧٠ کەبە بڕیاری ژمارە ٧٩٢ ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش دەرکرا: " الدستور الموقت و تعديلها، الجمهورية العراقية، وزارة الاعلام، مديرية الاعلام العامة، الطبعة الثانية". بڕوانە مادەی ٣٧ لەدوستوری عیراقی، ه . س ل١٦

١١٢ - ه. س.، مادەی ٤٠، ل١٤.

١١٣ - بڕوانە مادەی ٢، ٣، ٤، ٥، ٦ لەناو هەمان سەرچاوە، ل١٨-١٩.

١١٤ - مادەی ٥٧، ل٢٤.

١١٥ - مادەی ٥٧، ل٢٥.

١١٦ - نوسەرێك چونە ناو حیزبی بەعس دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی١٩٥٧، بەڵام زۆر لەسەرچاوە دەیگەڕێننەوە بۆ ساڵی١٩٥٥. ئەم دژاو دژیەش بەڕای ئەم نوسەرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سەدام حوسەین ویستویەتی دووساڵ خۆی گەورە بکات، واتا ساڵی لەدایکبونی بگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٧ نەك بۆ ساڵی ١٩٣٩و بۆ ئەوەی دژاودژی نەکەوێتە نێوان ساڵی خۆنوسینی لەناوحیزبی بەعس و بەرواری لەدایکبونی، هەموو چوارچێوەکانی نفوسی گۆڕیوە. ئەم نوسەرە کەبە دۆکۆمێنت و پرۆڤەوە ساڵی لەدایکبونی سەدام دەسەلمێنێ، رەخنە لەحەننابەتاتو و لەنوسەران دەگرێ بۆئەم مەبەستەو دەڵێ کە سەدام دووساڵ خۆی گەورە کردوە بۆ ئەوەی لەگەڵ تەمەنی خێزانەکەی، ساجدە، بگونجێ کە دووساڵ لەمێردەکەی گەورەتر بوەو ئەمەش هەندێ کێشەی سایکۆلۆژی بۆ سەدام دروست کرد لەناو ژینگەیەکی عەشایەری و حوکمی لادێ.

بڕوانە: طالب الحسن، حكومة القرية، فصول من سلطة النازحين من ريف تكريت، دار ادرللنشر، بيروت، ٢٠٠٢، ل٣٤٩-٣٥٨.

١١٧ - بۆزیاتر لەزانیاری بڕوانە جعفر الحسيني، على حافة الهاية، العراق ١٩٦٨- ٢٠٠٢ دار الحكمة، لندن،٢٠٠٣، ل ١٠٤. لەسەرمندالی و دزی و لەخەڵکی دان و توندوتیژی سەدام، بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو: طالب الحسن، ل٣٣٧-٥٢٥

بڕوانەبەتایبەتی:

Efraim Karsh and Inari Rautsi, Saddam Husayn, A Political Biography, Bpcc
Wheaton, London, 1991

١١٨- بۆ زانیاری سەبارەت دورو درێـژی هەوڵدانەکـە- بڕوانـە طـالب الحسـن، ه . س، ل. ٣٥١-٣٥٥. بڕوانە هەروەها:

Marion Farouk-Sluglett, op.cit. p.p 72-74.

نوسەری ژیانی سەدام، فؤاد مطر بەمەدحەوەو بەدوردرێژی باسی بارودۆخی هەوڵدانەکـە دەکـاتو باسی بریندار بوونی دەکات:

Frouad Matar, op. cit., pp. 27-37,

ئەم باسە دژاودژە لەگەڵ گێڕانەوەکەی طالب الحسن، سەرچاوەی پێشور، ل. ٣٥١-٣٥٥.

119- Efraim Karsh and Inai Rautsi, op. cit., pp. 24-25.
120 -Samir al-Khalil, op. Cit., p. 61.
121-Christine Moss-Helms, Iraq, Eastern Flank of the Arab World, Washington, D.C., 1984,P.94.

بۆ زیاتر لەزانیاری، بڕوانە:

122-Efraim Karsch and Inari Rautsi, op. Cit. Pp. 113-116.

123-Ibid., p.116.
124-Ibid., p.117.
125- Ibid., p.117

١٢٦ - بۆزیاتر لەزانیاری بۆئەم مەبەستە زۆر کتێب هەیە. بڕوانە بۆ نمونە:

عثمان الرواندوزی المحامی، استجواب صدام حسین رجل المتناقضـات، الـدار الاندلسـیة، ل٢٠٠٢.

طالب الحسن، فصول من ساطة النازحین من ریف تکریت، ە. س.

حسن السعید، نواطیرالغرب، سەرچاوەی پێشو .

حسن العلوی، العراق دولة المنظمة السریة، لندن، ١٩٩٠

بڕوانە بەتایبەتی: جعفر الحسنی، علـی حافة الهاویـة، العـراق ١٩٦٨-٢٠٠٢، دار الحکمـة لنـدن، ٢٠٠٣.

Efraim Karsch, op. Cit.وەهەروەها

١٢٧ - بڕوانە: الدستور الموافت وتعدیلاتە، ل٢٠-٢٤.

بڕوانە:

128- The National Assembly, Legislation, Supervision, Ministry of Information and Culture, Dep. of Information, al- Hurriyya Press, Baghdad, 1989, p, 12.
129- Ibid., p.14, p.18.
130- Efraim Karsch, op. cit, p.120.
131- Ibid.,p. 120.
132-Ibid. ,p.120.
133- The National Assembly, Ibid, p. 19.
134- Ibid., p.20.
135- New York Times, June 21, 1980.
136- Nicolo Machiavelli, Il Principe, Milano, 1960, X .V111-3,P.72
137- Efraim Karsh, op. cit., p. 113

١٣٨ - بڕوانە وتاری سەدام بەم بۆنەیەوە لە :Ibid., p.114.

139- Ibid., p. 96.
140- Ibid., p. 66.

١٤١ - طالب الحسن،حكومة القرية، هـ . س . ل٢٠٢.

نوسەر دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ١٩٦٣، لەململانێیەك لەنێوان طالب حسین الشبیب، وەزیری دەرەوەی عیراقو علی صالح السعدی لەسەر فراوان کردنەوەی بناغەی حیزبو حەرەس قەومیو پێشنیازی میشێل عەفلەق بۆبەستنی کۆنگرەیەکی قطری بۆدۆزینی چارەسەرێك بۆئەم ململانێیە، سەدام حوسەین ڕێگەیەکی دیکەی دۆزیەوە: بۆئەوەی علی صالح السعدی سەرنەکەوێ پێویست بور بکوژرێ بەگوللەیەکی پەنجا فلسیو دوایش دوو لەکۆمۆنیستەکان تاوانبار بکرێن بەکوشتنیو ئەوانیش ئیعدام بکرێن. بڕوانە هـ . س، ل. ٢٠٠١-٢٠٠٣ .

142- Christine Moss- Helms, op. cit., p.95

١٤٣ - ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەی قطری نۆهەم لەناو:

Marion Farouk- Sluglett, op. cit., p. 262.

# بەشی دووەم

# میکانیزمی کارکردنی رژێمی بەعسی عیراقی

## رێکخراوی حیزبی بەعس و پۆلیسی سیاسی

پاش ئەوەی حکومەتی بەعسی عێراق لە١٧ی تەموزی١٩٦٨دەسەلاتی گرتەدەست، زوو بە زوویی دەستی کرد بەپلان دانان بۆ بەعساندنی کۆمەڵی عێراقی بە گوێرەی جیهانبینیەکی تۆتالیتار . بێگومان ، ئەم پرۆسەیە پێش گرتنە دەستی دەسەلات لەلایەن بەعسەوە پێشبینی کرابوو و راپۆرتی سیاسی کۆنگرەی هەشتەمی حیزبی بەعسیش زۆر روونە لەسەر ئەم بابەتە (١) .

یەکەم هەنگاو بریتی بوو لە رێکخستنی رێکخراوی ناوخۆی حیزب بە شێوەیەکی تەواو و لەرێگەی مەکینەی پروپاگەندەوە هەڵسان بە هەڵمەتی رێکخستنی هاولاتیانی عێراقی . بە چەند ساڵێك ، بەتایبەتی پاش ساڵی ١٩٧٥ ، حیزبی بەعس توانی بیێ بەجیهازێکی رێکخستنی تەواو و بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر پێکهاتەی ناوخۆی خۆی پەرەپێبسێنێ . رێکخراوی حیزبی بەعس پێکهاتبوو لە چەند شانەیەکی جیا جیا کە شێوەیەکی هەرەمی هەبوو . ئەم شانانە لەرێگەی زنجیرەیەکی هەرەمی بەسرابوون بەیەکەوەو لە هەمان کاتدا بەسرابوون بە ئەندامانی موخابەرات و ئاسایش کەراستەوخۆ لە لوتکەدا پەیوەندیان بە دەست و پێوەنی سەدام حوسەینەوە هەبوو . لەگەڵ رۆیشتنی کاتدا ، رێکخراوی بەعس بوو بە داردەستێکی ترسناك کەکاری بریتی بوو لەکۆنترۆڵ کردنو چاودێری کردنی سەرجەم هاولاتیانی عێراقیو تەنانەت خودی ئەندامانی حیزبی بەعسیش.

لەپێناوی باش تێگەیشتنی کاری ئەم مەکینە ترسناکەدا ، پێویستە پێش هەموو شتێك دەست بکەین بەشیکردنەوەی ستروکتوری رێکخراوەیی .

هەرلەسەرەتای دامەزراندنیەوە لەساڵی ١٩٤٧ و پاش ساڵانی گرتنە دەستی دەسەڵات ، حیزبی بەعس پێکهاتەی شانەیی کرد بەبنچینەی رێکخستنی سیاسی. لەراستیدا ، رێکخستنی شانەی حیزبی بەعس لە ساڵانی ١٩٤٠ و ١٩٥٠ لەلایەن میشێل عەفلەقەوە ، کەدامەزرێنەری بەعس بو، بنیاد نرابوو . ئامانج و ستراتیجیەتی بەعس بریتی بوو لەوەی کەبتوانێ لەهەر وڵاتێکی عەرەبیدا کاربکات و " شۆرش " بەرپاکات . بەم واتایە ، دەتوانرێ بوترێ کە بە گوێرەی تێروانینێکی پرێتۆریەوە [٢] و لە رێگەی میتۆدی نادیموکراتیانە ، حیزبی بەعس هەوڵیدا بەشێوەیەکی ئاشکرا یان نهێنی تۆری خۆی لە هەروڵاتێك لەو وڵاتە عەرەبیانەی کەدەیتوانی کاریان تیادا بکات بنیاد بنێ. شایستەی ئاماژەیە ، لقی ئەردەنی لەساڵی ١٩٤٨ و لقی تونسی ١٩٥٠ و لقی عێراقی لەساڵی ١٩٥٢ و لقی لوبنانی و لیبی لەساڵی ١٩٥٤ دا مەزرێنران . هەروەها ، حیزبی بەعس توانی لەعەرەبیستانی سعودی و قەتەرو عومانو کویتو یەمەن خۆی رێکبخات [٣] .

یەکەی بنچینەیی حیزب پێکهاتبوو لەوەی کە پێی دەوترا " الخلیة " ، " الحلقة " یان " حلقة الانصار " . " الخلیة " بچوکترین یەکەی رێکخراوەیی بوو . "الخلیة "، واتا شانەیەك بریتی بوو لەسێ تا حەوت ئەندام . دوو تا حەوت شانە " فرقە " یان پێك دەهێناو بە لایەنی کەمەوە دوو " فرقە " "شعبة" یەکی دروست دەکرد .لەساڵانی ١٩٨٠ بیست و یەك "شعبة" لە عێراقدا هەبو کە دابەش بوبون بەسەر پارێزگاکان و سێ "شعبة"ش لە بەغدا[٤] .سەرجەم شعبەکان پێکەوە "قطر"یان پێکدەهێنا و لەهەر ئاستێك لە ئاستەکانی هەرەمی حیزبی سەرکردایەتیەك هەڵدەبژێردرا کە پێ ی دەوترا "القیادة القطریة ". لەتیۆریدا دەبوایە لە هەروڵاتێکی عەرەبی "سەردکردایەتیەکی هەرێمی " " القیادة القطریة " هەبوایە . بەڵام لەواقیعدا جگە لەعێراق و سوریا( لەوانەیە لە ئەردەن و لوبنانیش )، بەعس نەیتوانی بگاتە ئاستی

دامەزراندنی ئەم ئۆرگانە بەرزە . هەرچۆنێك بێت ، بەسەروی "القیادة القطریة"ی بەعسی عێراقیدا ، ئۆرگانی "القیادة القومیة"هەبوو کە بریتی بوو لە بالاترین دەسەلاتی حیزب و ئەندامەکانی پێکهاتبوون لەخەلکی عێراق و ولاتە عەرەبیەکان . بۆنمونە ئەندامانی " القیادة القومیة" لەسالانی ١٩٨٠دا بریتی بوون لەمانەی خوارەوە:

میشێل عەفلەق ، دامەزرێنەرو سکرتێری گشتی حیزب (هاولاتی سوری ) ، سەدام حوسەین جێگری سکرتێری گشتی (عیراقی ) ، شیبلی العیسمی (هاولاتی سوری ) ، عبدالمجید الرفاعی ( لوبنانی ) ، علی غنام ( عەرەبی سعودی ) ، قاسم سلام (یەمەنی ) ، بدرالدین مدثر (سودانی ) ، عزت ابراهیم (عیراقی ) ، تەهایاسین رمضان (عیراقی )، معین حداد (عێراقی ) ، طارق عزیز ( عیراقی ) [٥] .

لەسەرئاستی تیۆری، "القیادة القومیة" بەرزترین ئۆرگانی راپەراندن بوو ، هەروەها بەرپرس بوو لە بەدانانی چوارچێوە بۆ عەقیدەی بەعسو بەرێوەبردنی سیاسیو رێکخستن لەنێوان سەرکردایەتی هەرێمەکانو هاوبەشیکردن لەناو کۆنفرانسی جیهانی . . . هتد ، بەلام لەراستیدا پاش بوونی بەعس بەدووبەشەوە لەسالی ١٩٦٦ لە نێوان سوریاو عێراق ، وورده وورده ئەو گرنگیەی کەم بوەوە .

هەرچۆنێك بێت ، نابێ ئەوە پشت گوێ بخرێ کە چ سەرکردایەتی هەرێم ( القیادة القطریة ) و چ سەرکردایەتی نەسیۆنال (القیادة القومیة ) لە ژێر سێبەری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرشدا کاریان دەکرد . ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش بریتی بوو لە بەهێزترین جەستەو بریاردەری سیاسەتی عێراقیو دەسەلاتی یاسادانانو راپەراندن و دادوەریشی هەبوو . لەراستیدا پاش ئەوەی سەدام حوسەین بوو بەسەرۆکی کۆمار ، ئەم ئۆرگانەش بوو بە داردەستێك لە ژێر دەستی خۆی و خزمو کەسو کارو برادەری کەکاری موخابەرا تو سیخوریان پێ راسپێردرابو.

# ڕێکخراوی حیزبی بەعسی عێراقی لەساڵی ١٩٨٤

**سەرچاوە**

Christine Moss Helms, Iraq Eastern Flank of the Arab World, Washinton, D. C., 1984, P. 84.

لەساڵانی ١٩٦٤ کاتێك کەرێکخراوی حیزبی بەعسی عێراقی بەسەر چەند قەیرانێکدا ڕۆیشت ، شێوەیەکی تایبەتی لە ڕێکخستنی هەڵبژارد کە پێی دەوترا " التنظیم او الجهاز الخیطي " ئەم شێوەیە لە ڕێکخستن هەروەها لەسوریا لەپاش ساڵی ١٩٧٦ ەوە و لە هەندێ وڵاتی دیکەش بەکار هێنرا . " الجهاز الخیطي " بە شێوەیەك ڕێکخرابوو کەئەندامێکی حیزب تەنها دوو کەس لەڕێکخراوەکەی دەناسی: ئەوەی سەروی خۆی و ئەوەی خوار خۆی .

لەکۆتایی ساڵی ١٩٦٢ چەند بەشێك لەحیزب هەبوو کەپێیان دەوترا"لجان الانذار" کەپێکهاتبوو لەچەند ئەندامێك کەرۆڵی گەورەیان هەبوو لەحیزبدا .پاش کەوتنی ڕژێمی بەعس لەنۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦٣ و تاسێپتەمبەری ١٩٦٤ ، کاتێك کەحیزبی بەعس بەئەزموونێکی ناخۆشدا ڕۆیشت و بارودۆخی بەعسیەکان لەقەیراندابوو، گروپێکی بچوك لەبەعسیەکان ڕێکخراوێکی زۆر نهێنی وتەریب لەگەڵ ڕێکخراوێکی ناسراودا دروست کرد کەلەلایەن فایلی حیزبی بەعس خۆیەوە نەناسرابو. سەدام حوسەین کاری لەم ڕێکخراوەدا دەکرد (٦).

## ریّکخراوی " خیطي " حیزبی بەعسی عیراقی

سەرچاوە:

Christine Moss Helms , Iraq Eastern Flank of the Arab World , op. cit. p.86.

ئەوەی کەئینتمای دەکرد بۆ ڕێکخراوی بەعس دەبوایە بە لایەنی کەمەوە تەمەنی حەڤدە ساڵ بوایە و وەك لایەنگیر "مؤید" دەبوایە دووساڵی لەناو حیزبدا بردایەتەسەر بۆئەوەی دوایی ببوایە بە "نصیر". ئەمیش دەبوایە بۆماوەی دووساڵی دیکە یان سێ ساڵ لەناو حیزبدا پەروەردە بکرایە.پاش ئەم ماوەیەش بۆ ماوەی ساڵ ونیوێك دەبو بە "مرشح " بۆ ئەوەی پاشان بیێ بە"متدرب".لەماوەی ساڵێکدا "المتدرب " بەشێوەیەکی قول`پرنسیپەکانی عەقیدەی بەعسی دەخرایە مێشکیەوە وپاشان دەبو بە ئەندام "عضو" لەپێشدا ئەندام وەك سەرۆکی "الانصار "،ئەمجا ئەندامی "الفرقە"و دوایش بەرپرسی ئەندامان، ئەمجا ئەندامی "الشعبة"و دواییش بەرپرسی ئەندامانی "الفرقة" و ئەگەر ببوایە بە ئەندامی "الفرع" دەبوو بە بەرپرسی ئەندامانی " الشعبة". . . هتد. لە راستیدا ڕێکخستنی بەعسی بە شێوەیەك بوو کە بەردەوام سەرۆکێك هەبو بە سەر سەرۆکێکەوە [٧] کە کۆنترۆلی خوار خۆی دەکردو راپۆرتی بەرز دەکردەوە سەبارەت بە هەموو بارو دۆخێکی تایبەتی.

دەشی`بوترێ کەپانتایی حیزبی بەعس لەهەموو شوێنێك بەدی دەکرا وشانەو لقی بەعسی لەسەرجەم یەکە کارگێڕیو ناوچەییەکاندا بلاوبوبونەوەو: لەناو لادێ وشارو شارۆچکەو کارگەو دائیرەو خوێندنگەو زانکۆو سەندیکاو نەخۆشخانە . . ..هتد [٨].

شێوەی ڕێکخستنیشی بەکەمترین کات ڕێگەی بۆگواستنەوەی زانیاری لەنزمەوە بۆ بەرز خۆش دەکرد . بۆ نمونە ئەندامانی شانەکانی خوارەوە وناوەڕاست دەبوایە بەشێوەیەکی سیستێماتیك لەسەر خەڵك و بارودۆخی شوێنی کاری خۆیان راپۆرتیان بەرز بکردایەتەوە. رادەی سەروەریی وخۆتەرخان کردن، بۆپێشکەوتنی ئەندام سنوری دادەنا. چەند ئەندام لەنوسینی راپۆرت و گواستنەوەی زانیاری ئەکتیڤ بوایە، ئەوەندە بەخێرایی بەرزدەبوەوە بۆ پۆستی حیزبی بەرزتر . لەناو ڕێکخراودا ئەندامان مافی مشتومرو رەخنەیان لەسەر میکانیزمی کارکردنی حیزب و بڕیاری ناوخۆ نەبوو و بەشێوەیەکی گشتی پێویست بوو لەسەریان فەرمانی بەرپرسەکەیان لەسەر بنچینەی پرینسیپی دەسەلات لەسەرەوە بۆ خوارەوە و پرنسیپی بەرپرسیەتی دەسەلات لەخوارەوە

بۆ سەرەوە راپەڕێنن. بەم شێوەیەو بەهۆی ستونی پەیوەندیەکان لەنێوان رێکخراوە بەعسیەکان و پچڕانی شانەکان لەیەکتری ، حیزبی بەعس دەیتوانی کۆنترۆڵی سیستەمی وەرگرتنی ئەندام بکات و ئەندامان ملکەچ پێ بکاتو ئاستەنگ دابنێ بەرامبەر دابەشبونی حیزب .

بە گوێرەی فایلی پۆلیسی عێراقی ، حیزبی بەعس لەساڵی ١٩٥٥ تەنها ٢٨٩ ئەندامی هەبوو . پاش کودەتاکەی عبدالکریم قاسم لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ دژی پادشایەتی ، حیزبی بەعس توانی ٣٠٠ سێ سەد "ئەندامی ئەکتیف "[٩] و٢٠٠ دوو سەد لایەنگیر و١٢٠٠هەزارو دوسەد خەڵکی رێکخراو و ١٠٠٠٠دە هەزار هاوڵاتی بێنێتە ناو جوڵانەوەی حیزبەوە [١٠]. لەساڵی ١٩٧٦ توانی ٥٠٠٠٠٠پێنج سەد هەزار عێراقی رابکێشێتە ناو حیزبەوە و لەمانەش ١٠٠٠٠دە هەزار ی بریتی بوون لە "ئەندامی ئەکتیف "کە زۆربەیان ئەو کەسانە بون کەهاوبەشیان کردبوو لەهەوڵدانی کوشتنی عبدالکریم قاسم لە ساڵی ١٩٥٩ و کودەتاکەی ساڵی١٩٦٣ و ئەوەی ١٩٦٨[١١] .ئەمانە کە دادەنران بە ئەریستۆکراسیەتی حیزب ، بوون بە بڕبڕەی پشتی دەزگاکانی حکومەتو پۆلیسی سیاسیو پۆستی حەساس لەحیزبدا . لەساڵانی ١٩٨٠ بناغەی لایەنگیرانی بەعس فراوان کراو لەو ساڵەدا سەدام حوسەین بە دەنگی بەرزو فەخرەوە دەیگوت کە"زیاتر لە یەك ملیۆن هاوڵاتی رێکخراو، مومارەسەی دیموکراسیەت لەناو حیزبدا دەکەن بەشێوەیەکی فراوان قوڵ لەسەر کاروباری میللەت گفت گۆ دەکەن.." [١٢] . ئەم ژمارەیە بە شێوەیەکی سەرسورهێنەر زیادی کرد و لەساڵی ١٩٨٤ گەیشتە یەك ملیۆن ونیو لە لایەنگر ،واتا ١٠,٧% ی دانیشتوانی گشتی چواردە ملیۆن لەعیراقی و٢٥٠٠٠ بیست وپێنج هەزار لەئەندامی ئەکتیف [١٣].

گرنگی ئەم ژمارانە کاتێك دەردەکەوێ ، کەدەزانرێ لەکۆتایی ساڵی١٩٨٠ ،حیزبی بەعس بوو بەشەیتانەماسیەك کەئەندامی هەستەوەری لەهەمو رەهەندێکدا بڵاوبوەوە: لەناو دەزگاکانی دەوڵەت ، لەناو رێکخراوی لاوان ، لەناو خوێندنگەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی ، لەناو زانکۆکاندا ، لەناو دەزگاکانی کەرتی گشتی و تایبەتی،

لەناو کۆمەڵەی بازرگانی ، لەناو سەندیکاو کۆمەڵەی وەرزشی و هونەری و پیشەییداو . . .هتد . دەشێ بوترێ کە "تۆتالیتاریزەکردنی " کۆمەڵی عێراقی بەگوێرەی ئەو لۆژیکە بەعسیە ڕۆیشت کەدەیویست هەموو عێراقیەك خۆی لەگەڵ هزری شۆرشگێری حیزب نەك تەنها لەرێگەی بوون بەئەندام بەڵکو بە بیرکدنەوەو واقیع و باوەریش بگونجێنێ . لەساڵی ١٩٧٦ ، سەدام حوسەین ئەم لۆژیکەی بەدرۆ نەدەخستەوە بەڵکو جەختی دەخستە سەر: " ئێمە ئومێدەوارین هەموو عێراقیەك لەم وڵاتەدا بکەین بە ئەندامی بەعس و بەعسیەکی ئیماندار (. . .) ، وە هەموو میللەتەکەمان لەناو نیشتیمانی عەرەب بکەین بە بەعسی " [١٤] .

گومانی تێدا نییە ، بەرزخوازیەکان (تموحاتی) بەعس بریتی بون لەوەی کەسەرجەم عێراقیەکان بکات بەجەماوەرێکی بێ وێنەو بیانگۆرێ و بیانکات بەکوتلەیەکی ئایدۆلۆژی بەدەوری ئەریستۆکراسیەتی حیزب. مەرام و مەبەست پێکهاتبوو لەتێکەڵ کردنی کوردو عەرەب و تورکمان و کلدۆئاشوری و کرێکارو جوتیارو بۆرژوازی و خوێندکارو سەرباز بۆئەوەی جەماوەرێکی مردو و بێ جوڵەیان لێ دروست بکات . سەدام حوسەین باش گوزارشتی دەکرد لەم مەرام و مەبەستە لەرێگەی " مێتافۆری ( metaphor تعبیر مجازی ) " پاپۆڕ " کەسەرجەم عێراقیەکان بەخۆیەوە بگرێ : " لەگەڵ ویستی خودا ( انشاء الله ) کەس ناهێڵین لەدەرەوەی ئەم پاپۆڕە ، چونکە لەبارو دۆخی ئێستادا ، ئەم پاپۆڕە ئەوەندە گەورەیە کەدەتوانێ هەموو عیراق بگرێتە خۆی "[١٥] .

لەپێناوی ئەوەی سەرجەم عێراقیەکان بخاتە ناو ئەم "پاپۆڕە گەورەیەی " بەعس ، حیزب داوای دەکرد لەئەندامان کەوەکو خەڵکی بیرۆکرات رەفتار نەکەن و تەنها لەزەت لەخۆشی دەسەڵات لە ناو دەزگاکانی دەوڵە تدا وەرگرن ، بەڵکو دەبێ بەجۆش و " پەرۆشی شۆرشگێرانەوە " کار بکەن بۆ راکێشانی ژمارەیەکی زیاتر لە دانیشتوانی عێراق . ئەگەر لەساڵی ١٩٦٣ " هەندێ لە هەڤاڵان خۆیان جێگیر کرد لەناو خزمەتگوزاری حکومەت وەك فەرمانبەری رژێمی رابردوو بەبێ ئەوەی رەنج بدەن بۆ

راكێشانی برادەرانیان لە پێناوی رازی کردنی خەڵکی نیشتیمانپەروەر لــە بــەرژەوەندی حیزب و شۆرش " (١٦)، لەگەڵ شۆرشی نوێدا ، داوایــان لــێ دەکـرا کـە هەسـت بـە بەرپرسێتی بکەن . لەبەر ئەوە ، رەوشت و رەفتــاری شۆرشـگێری چـاك پێویسـت بـوو لەگەڵ بەلایەنی کەمەوە دوو پێوانە بگونجایە : لەلایەکەوە ئەندامی نوێ پەیدا بکرێ ، لەلایەکی دیکەوە ، زانیاری نهێنی کۆ بکرێتەوە لەسەر هاولاتیان .

بەم شێوەیە حیزبی بەعس کە بووبوو بەرێکخراوێکی پۆلیســـی ، پێکـهاتبوو لــەدوو جۆر لەئەندام : کاستی (توێژێکی کۆمەلایەتی داخراو ) ئەریستۆکراسی حــیزب کـە بەشێوەیەکی وورد چوبووە نــاو مخابــەراتی ئــەمن و ئاسـایش ، و جـەماوەری لایــەنگیرو ئەندامی شانەکانی خوارەوە کەپیشەیان بریتی بوو لە جاسوسیەت و چـاودێری کـردن و زانیاری کۆکردنەوەو گواستنەوەیان بــۆ ئۆرگانــەکانی بــەرپرس سـەبارەت بــە چـالاکی دراوسێکانی گەرەك و برادەرو خەڵکی شوێنی کار لەلایەکەوەو هــاندانی هاولاتیــان بـۆ خۆپیشاندان و نارەزایی دەربرین دژی ئیمپریالیزم کاتێك کـــەرژێم مـەکینـەی کوشـتنی ئیش پێ دەکرد دژی دوژمن لەلایەکی دیکەوە .

ناتوانرێت ئینکاری لەوە بکرێت کە لەگەڵ هەموو جیاوازیەکدا ، شێوەی رێکخســتنی رێکخراوی بەعسی بەوشێوەیەی کەباسمان کرد زۆر خەسلەتی هاوبەشــی هەیـە لەگـەڵ ئەوەی رژێمە تۆتالیتاریەکان . ئەگەر بمانەوێت بۆ نمونە شێوەی رێکخستنی حیزبی نازی یان فاشی شیبکەینەوە ، دەتوانین زۆر لایەنی هاوبــەش تێبیــنی بکــەین . رێکخــراوی نەسیۆنال سۆشیالیزم و فاشیزمیش بەسرابوو بە مەرکەزیەتێکی ئەوپەرەوەو دەوەستایەوە سەر " سیستەمێکی پــەیوەندی ستونی کـە لــەناویدا ماکـەکانی بناغــە پچرابــوون لەیەکتری " . ئەم سیستەمە دارێژرابوو بەتایبەتی بۆ " پاراستن دژی هەموو هــەوڵێك کەئامانجەکــەی پارچــە پارچــەکردن و دابــەش بــوون بــێ " (١٧) . راسـتە ئـەم شـێوە رێکخستنە تایبەتــە بەســەرجەم ئــەو حیزبانــەی کــە لــەبارودۆخی جــەنگ و خــەباتی چەکداریدا کاردەکەن . بەلام نــابێ لــەبیر بچێتــەوە کــەحیزبی بــەعس یــان نەســیۆنال سۆسیالیزمیش ئەو جۆرە رێکخستنەیان هێشتەوە تەنانەت کاتێك لەسەر حوکم بوون و

هیچ مەترسیەك نەبوو لەئۆپۆزسیۆن و خۆیان مۆنۆپۆلی سەرجەم دەزگاکانی دەوڵەتیان دەکرد . دەبێ بوترێ کە لەکاتی جەنگدابێت یان لەکاتی شەڕی چەکداری یان لەکاتی ئاشتیدا بێت ، ئەم جۆرە حیزبانە کەلەسروشتیاندا تۆتالیتارن ، باوەریان هەیە بەوەی کەکۆمەڵ لەبارودۆخی دوژمنایەتی و ناسەقامگیری بهێڵنەوە .

لەبەر ترسی کەوتن و نەگەریی کەمترین هەڕەشە بۆ مانیان شێوەی رێکخستن لەناو چوارچێوەیەك دەهێڵنەوە کەبتوانێ زامنی "دیسپلینێکی زۆر سەخت" بکات ورێگە خۆش بکات بۆ دانانی بەر پرس لەسەرەوەو " دەسەلاتی رەهای سەرکردایەتی مسۆگەر بکات لەسەرەوە بۆ خوارەوە وملکەچی رەها لەخوارەوە بۆ سەرەوە "[١٨]. نەسیۆنال سۆسیالیزمیش پێکهاتبو لەشانەی بچوك بچوك کە بۆ "خۆگونجاندن لەگەڵ بارو دۆخی شەری ئاشکراو خەباتی نهێنی "[١٩] دروست کرابو. خواروی هەرەمی حیزب پێکهاتبو لەشانە. شانە بچوکەکان سەرپەرشتی و چاودێری کۆمەڵێك ماڵیان لەناو شار دەکردو لەلایەن بلۆکلایتەرەوە Blockleiter سەرکردایەتی دەکران. ئەوانەی بەسەروی بلۆکلایتەرەوە بون پێیان دەوترا زێللێنلایتەر Zellenleiter . ئەمانە چاودێری لەچوارەوە بۆ هەشت کۆمەڵە ماڵیان دەکرد . بۆ نمونە شەقامێکی گەورە پێکهاتبو لەچەند شانەیەك کەلەلایەن زێللێنلایتەرەوە سەرکردایەتی دەکرا. ئەوانەی بەسەروی زێللێنلایتەرەوە بون پێیان دەوترا ئۆرتسگروپێنلایتەر Ortsgruppenleiter کە بەر پرسی ژمارەیەکی زۆر لەشانە بوون لەناو شارەکاندا وهەروەها بەرپرسی لادێ یەك یان چەند لادێ یەك بون. بلۆکلایتەرو زێللێنلایتەرو ئۆرتسگروپێنلایتەر کاریان گواستنەوەی فەرمانی حیزب بوو بۆ شانەکان و چاودێری راپەڕاندنی فەرمان وئاگادارکردنەوەی دەسەلاتی سەرەوەیان لەزانیاری سەبارەت بە هاوولاتیان و هەڤاڵانی حیزب دەکرد. ئۆرتسگروپێنلایتەر لەژێر دەسەلاتی سەرۆکی دیکە کاریان دەکرد کەپێیان دەوترا کرایزلایتەر Kreisleiter وئەمانیش راستەوخۆیانە ئیعتیمادیان دەکردە سەر گاولایتەر Gauleiter. گاولایتەریش لە ژێر دەسەلاتی ئەریستۆکراسی حیزبی نازی

کاریان دەکرد کە بەر پرسێتی کارگێڕی دەوڵەت وحیزبیـــان هــەبوو. لـەنێوان ئـەمان و هیتلەردا ، نوێنەری فوهرەر هەبوو [٢٠].

پێکهاتەی حیزبی نەسیۆنال سۆسیالیزم کەبەم شـێوەیە دارێژرابـو ، هــەروەك ئـەوەی حیزبی بەعس ، کۆنــترۆڵی سیســتەمی کــارکردن و هەڵســوکەوتی ئـەندامانی ئاســان دەکرد و سورانەوەی زانیاریشی کەم دەکردەوە و ملکــەچی رەهــای شــانەکانی خــوارەوەی مسۆگەر دەکرد . پــەیوەندی ســتونی کەدیســیپلین و پــەیرەوو رەقــی هــەرەمی بەســەر ئەنداماندا دەسەپاند ، مەتێریالیزەکردنی ویستی فوهــرەری ، وەك ســەرۆکی دەولــەت و حیزب ئاسان دەکردەوە .

حیزبی نازی کەدەیویست بچێتە ناو " ناخی کۆمەڵ " و ناو قولایی جەماوەرەوە [٢١] تاتوانی هاولاتیانی ناچار کرد بۆ کارکردن لــەناو رێکخــراوداو بەشـێوەیەکی بــەردەوام پانتایی لایەنگیرانی گەورەکردو لەهەمان کاتدا (هەروەك حیزبی بەعس ) سنوری دانــا بۆ ژمارەی ئەریستۆکراسی حیزب [٢٢] . دەبێ بوترێ کەسەرەڕای هەمووشـتێك ، نــە نەسیۆناڵ سۆسیالیزم و نە فاشیزم نەیانتوانی وەك بەعس بەشێوەیەکی وا خێرا بـناغەی حیزبەکەیان ئەوەندە فراوان بکەنەوە. بۆنمونە ، فاشیزمی ئیتالی لە ساڵی ١٩٣٩ توانی بگاتە تەنها لە ٥٪ (لەسەدا پێنجی ) دانیشتوانی ئیتالیا [٢٣] . هەروەها نەســیۆنال سۆسیالیزم تەنها لەساڵی ١٩٤٤ توانی بگاتــە ١٢٪ لەســەدا دوانزەی دانیشــتوانی ئــەکتیف [٢٤] و هــەروەکو دەشــزانرێت نەســیۆنال سۆســیالیزم و فاشــیزم لەرێگــەی میکانیزمی هەڵبژاردنی دیموکراتیەوە دەسەلاتیان گرتە دەست .

هــەرچۆنێك بێــت ، هیتلــەر دەیگــوت کــەحیزب وەك ئێلیتێــك ( هەڵبژاردەیــەك ) دەمێنێتەوە و بوون بەئەندام تەرخان دەکــرێ تەنــها بــۆ ئەوانــەی خۆیــان دادەنێــن بــە خزمەتکەرانی دەولەتی نەسیۆنال سۆسیالیســت [٢٥] . ئـەم جیاکردنەوەیـەی لـەنێوان ئەندامانی حیزب (ئێلیتی سیاسی ) و لایەنگیران ، یەکێکــە لەپێکهاتــەکانی رژێمــە تۆتالیتاریەکان کە ئایدۆلۆژیایان لەجیهانبینیــەکی ئێلیتیســتانە ســەرچاوە دەگــرێ .

ئاننــە ئـەرێندت Hannah Arendt بەشـێوەیەکی فـراوان پیشـانی داوە کــە ئــەم

جیاکردنەوەیەی نێوان کەمینەیەکی حیزبیو زۆرینەیەك کە بەدەوریا دەسوڕێتەوە ، گرنگە چونکە رژێمە تۆتالیتاریەکان هەمیشە دەیانەوێ بەتەواوی زاڵبوونی خۆیان بەسەر تەواوی بەشەکانی ژیان بسەپێنن. دەزانن کە پرۆژەی" تۆتالیتاریزەکردنی " کۆمەڵ نەلەلایەن "دەوڵەت و نە لە لایەن ئامرازێکی ئاسایی توندو تیژەوە بەدی ناهێنرێ، بەڵام لەرێگەی بزوتنەوەیەك کە هەمیشە لەجوڵانەوەدا بێتە دی " [٢٦]. ئەم بارودۆخی جموجۆڵ و وروژاندنە هەمیشەییە ، نایەتەدی ئەگەر لەرێگەی جوڵانەوەی لایەنگیرانەوە نەبێت . رژێمە تۆتالیتارەکان کاتێك بەم " دیوارە پارێزەرە " دەورە دەدرێن ، هەرگیز ترسیان نییە جاری جەنگ بدەن دژی ئەو ئێلیمێنتانەی کەنیازیان نییە بچنە ناو خولگەی ( فلك ) ئەوانەوە ، واتا کە لۆژیکی وروژاندنی هەمیشەیی پەسەند ناکەن . لەرێگەی ئەم " دیکۆتۆمیزەکردنە " ( واتا جیاکردنەوە لە نێوان کۆمەڵی ئەندامان و لایەنگیران لە جموجۆڵداو کۆمەڵی دەرەوەی ئەم توێژانە ) ، رژێمە تۆتالیتاریەکان بەئازادیەکی رەهاوە پەنجە بۆ دوژمنانی خۆیان رادەکێشن . هەرەمی ناوخۆیی رێکخراوە تۆتالیتاریەکان پرینسیپی " ئەم دیکۆتۆمیزەکردنە " رادەپەرێنێ . بەسەروی لایەنگیرانەوە ، ئەندامانی ئاسایی هەن کە دەورەی ئەریستۆکراسی بەرزی حیزب دەدەن کە لەناو جیهازی نهێنی و پۆستە هەرەبەرزەکانی بڕیاری سیاسی کاردەکەن . لەراستیدا ئەم ئەریستۆکراسیە بەرزەیە کە کۆنترۆڵی ئەم جموجۆڵە دەکات و بۆ هەڵس و کەوتی ئەندامانی سنور دادەنێ و پاڵیان پێوە دەنێ دژی هەموو رەفتارێکی بێ لایەنیی (محايد) بوەستنەوە چونکە بەلای رژێمی تۆتالیتاریەوە بەرەفتارێکی دژ بە رەهەندە شۆرشگێڕەکان دادەنرێ . بەسەروی دەوڵەتەوە و هەروەها بەسەروی حیزبەوە ، دەسەڵاتی رەهای پۆلیسی سیاسی هەیە کەلەهەموو شوێن و کونجێکدا خۆی دەشارێتەوە . رژێمە تۆتالیتاریەکان بە بەردەوامیی دەسەڵاتیان بەندە بە هێزی پۆلیسی سیاسی . لەراستیدا ، پۆلیسی سیاسیە کەهاوڵاتیان رادەکێشێت بۆ ناو رێکخراوی حیزبو جۆش دەخاتە ناو دڵی جەماوەرو " دژی دوژمنانی گەل " رەفتار دەکات و پەردە لە ڕوی پیلان و گۆبەند نانەوە هەڵدەماڵێ . هەروەها پۆلیسی سیاسیە

که دوژمنی شاراوه لێرەو لەوێ دەدۆزێتەوە کاتێ بۆی بلوێ و بەشوێن ئەوانەدا دەگەڕێ کەگومانیان لێ دەکرێ وەك ئیلیمینتی دژ بە شۆرش‌و هەرئەویشە کەهەڵدەسێ بە راستکردنەوەی " هەموو بیرێك کە لەهێڵی رەسمی کێشراو(دانراو) لادەدات " [٢٧] . پۆلیسی نهێنی دەوڵەتی نەسیۆنال سۆسیالیزم ، گێستاپۆ Gestapo یان گێهایم ستادپۆلیسای ( Geheim Staatpolizei) بەتەواوی هەر وەك پۆلیسی نهێنی بەعسی ، ئەم کارەی هەبوو ، واتا پیشەی " لەناوبردنی دوژمنانی نەسیۆنال سۆسیالیزم " [٢٨] . گێستاپۆ Gestapo کەلەساڵی ١٩٣٣ لەلایەن گۆرینگەوە Goering دروست کراو لەژێر کۆنترۆڵی تەواوی هیملەر Himmler بوو ، بریتی بوو لەزۆرینەیەکی تەواوی یەکەی س.س (Schutzstaffeln) کەئەندامەکانی بلاوبوبونەوە لەناو حیزب پێش ئەوەی نەسیۆنال سۆسیالیزم دەسەلات بگرێتە دەست [٢٩] . بەهاوکاری لەگەڵ گێستاپۆ ، چەندین رێکخراوی دیکەی وەك (Sicherheitsdienst)S.D و S.S . . .هتد [٣٠] ، بەرپرسبوون بەرامبەر "ئەوەی کەئایدۆلۆژیای نازی بەقوڵی بچێتە ناو سەرجەم توێژەکانی میللەتی ئەڵمانی " و بەرێوەبەرایەتی هەموو خۆپیشاندانێك بکات لە ئەڵمانیاو جیهاندا [٣١] . هەرلەساڵی ١٩٣٦ ەوە، بەشەکانی پۆلیسی سیاسی بەسەرۆکایەتی یەکەکانی S S لەکۆنترۆڵی دەوڵەت چونە دەرەوەو بوون بەچەند کیانێکی سەربەخۆو پێگەی نارەوایی یاسایی [٣٢] . جگە لە ( دوژمنی بابەتی ) واتە جولەکە ، گێستاپۆو یەکەکانی .S.Sو S.D ئەرکیان بیریتی بوو لەراوەدونانی دوژمن و سیخوڕ کەلەم لاو لەولا دەردەکەوتن هەمووکاتێك کە ئەریستۆکراسیەتی بەرزی نازی (کەبەشێوەیەکی ئاینانە بە هیتلەرەوە بەسرابوون) دەیویست دوژمن لەدەرەوەو لەناوەوەی حیزب لەناو بەرێ. گومانی تێدا نییە ، پێکهاتەی پۆلیسی سیاسی ئالۆز بوو ، بەلام لەروی میتۆدی لەناوبردن‌و شێوازی تاوانبارکردن‌و کۆنترۆڵی سیاسی ئەوەندە جیاواز نەبوو لەوەی رژێمی بەعسی. دەتوانین بەدڵنیایی بڵێین کەهەروەك رژێمی نازی ، پۆلیسی نهێنی بەعسی بریتی نەبوو لەسیستەمێکی بەرگری‌و پارێزگاری ئاسایشی دەوڵەت، .بەڵکو پێکهاتبولە ئامرازێکی هێرشبەری بەر پرس سەبارەت بەبلاوکردنەوەی

ئایدیۆلۆژیای رەسمی لەناو دانیشتوانی عێراق وراپەڕاندنی ئارەزوەکانی سەدام حوسەین وکۆنترۆڵ کردنی خەلکی وگەڕان بەشوێن دوژمنەکانی "شۆرش" . شایستەی ئاماژەیەکە لەسالانی ١٩٧٠و ١٩٨٠ ،پۆلیسی سیاسی بەعسی پێکهاتبوو لەسێ بەشی تایبەتی : "الامن " کەپیشەی ئاسایشی ناوخۆبو ،"الاستخبارات " کەبریتی بو لەگەیاندنی زانیاری سەربازیی و"المخابرات " کەپێکهاتبو لەهەڵسان بە کاروباری زانیاری حیزب .پۆلیسی سیاسی بەعسی بریتی بوو لەمەکینەیەکی ئالۆزی ترسناك وبەهاوکاری لەنێوان بەشەکانیداو لەژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی سەدام حوسەین و خزم وکەس وکاری ،هەڵدەسابەچەند کارێکی سەرەکی: چاودێری کردنی تۆرەکانی حیزب لەناو کۆمەڵگەی مەدەنیدا ،کۆنترۆلکردنی هاوولاتیانی عێراقی لە دەرەوەی عێراق ، کوشتنی ئەندامانی ئۆپۆزسیۆن لەدەرەوەی عێراق ، هەڵسان بەکاری سیخوری لەناو هێزەکانی لەشکرو دامەزراوەکانی دیکە .

بەشە هەرە ترسناکەکەی بریتی بوو لە " المخابرات " . ئەم دەزگایە راستەوخۆ لە " جیهاز الحنین " ەوە هاتبووە کایەوە و ئەرکی پێکهاتبو لە "چاودێری کردنی تۆرەکانی دیکەی پۆلیس و کۆنترۆلکردنی چالاکیەکانی دەزگاکانی دەوڵەت و لەشکرو کاروباری حکومی و دامەزراوە جەماوەریەکان" .

لەساڵی ١٩٧٠ ەوە هەتا ساڵی ١٩٨٣ ، ئەم دەزگایە لەلایەن زڕبرای سەدام حوسەین ، بەرزان ئیبراهیم التکریتی یەوە بەڕێوە دەبرا لەساڵی ١٩٨٣ هەتا ساڵی ١٩٨٩ فاضل البراك بەرێوەی دەبردو لەساڵی ١٩٨٩ ەوە لەلایەن زڕبراکەی تری سەدام حوسەین ، السبعاوی بەرێوە دەبرا [٣٣] .

لەساڵی ١٩٨٥ەوە دەست و پێوەنی ئاسایشی بەعسی پێکهاتبو لە نزیکەی چل هەزار ٤٠٠٠٠ کەس [٣٤] . ئەمانە بە گوێرەی مێتۆدی توندو تیژو تەعداکردن مەشقیان پێدەکرا و وەك ئەنجام هیچ بوارێکیان نەدەدا بە هیچ سەرپێچیەك دژی یاسای بەعسی . لە هەموو بەشێکی کارگێری دەوڵەت ، لە هەموو یەکەیەکی سوپا، لەهەموو خوێندنگەیەك و زانکۆو لادێ و گەڕەك و تەنانەت مزگەوتیش قۆمیسەرێکی

سیاسی دانرابوو کەپەیوەندی بە تۆڕەکانی پۆلیسی سیاسیەوە هەبوو [٣٥] و ئەمانیش ڕاستەوخۆ بەسرابون بەسەدام حوسەینەوە . سەدام حوسەینیش هەرخۆی بەتەنها ڕێکخراوێکی نهێنی تەواو بوو [٣٦] .

## سوپای عیراقی

شایستەی ئاماژەیە کەهەر لەسەربەخۆیی عیراقەوە لەساڵی ١٩٣٢، دەست تێ وەردانی سوپا لەکاروباری سیاسی بوو بوو بەفاکتەرێکی بڕیاردەر بۆرێگرتن لەژیانێکی سیاسی سەقامگیرو ئاسوودە. بەم شێوەیە سوپا بوو بووبە "کۆڵەکەی هێزی سیاسی" [٣٧] وهۆکاری کودەتای سەربازی. بەم بۆنەیەوە دەبێ بوترێ کە لەنێوان ١٩٣٦-١٩٤١، حەوت کودەتا بەجێ هێنرا دژی دەسەلاتی دەوڵەت لەلایەن ئەفسەرانی سوپاوە. وە ئەگەر لەدوای ١٩٤١ سوپا توانی " دەسەلاتی ڤیتۆ بسەپێنێ بەسەر سیاسەتی ناوخۆ" [٣٨]، لەساڵی ١٩٥٨ دەستەبژێری سوپا، لەپێناوی کۆنترۆڵ کردنی تەواوی ژیانی عیراق بەدەست بەسراوی نەمایەوە، کاتێك کەپادشایەتی روخێنراو هەتا ساڵی ١٩٦٨، ئەم دەستەبژێرە توانی دەسەلاتی خۆی هاوکات بەسەر سوپاو بەسەر بیروکراسیەتی دەوڵەتدا بسەپێنێ. کودەتای بەعسی ساڵی ١٩٦٨، ئەویش، کاری ئەفسەرانی سوپا بوو، بەلام بەجیاوازی لەگەڵ کودەتاکانی پێشو، ئەم روخساری دەوڵەتو سوپای عیراقی گۆری. بەپێچەوانەی دەستە بژێرەکانی دیکە کەتا ڕێژەیەك خاوەن تێروانینێکی ئایدیۆلۆژی تایبەتی نەبوون، دەستە بژێری بەعسی نوێنەرایەتی حیزبێکی سیاسی دەکرد کە ئامانجی بریتی بوو لەئێژمۆنی سەربازیی بەسەر ژیانی سیاسیدا، یان بە لایەنی کەمەوە ئەمە ئامانجی یەکەمی نەبوو، بەلکو ئامانجی بریتی بوو لەملکەچ پێکردنی سوپا بۆ پێداویستیەکانی حیزب. ئەم دەستە بژێرە چەکدار بوو بوو بەئایدیۆلۆژیایەکی چونیەك کە لەژێر کاریگەری باڵی مەدەنی حیزب دەیویست دەسەلات بخاتە ناو دەستی ئەوانەی کەبتوانن هێزی سوپا ئاراستەی ئامانجە پان

عەرەبەکانی حیزبی بەعس بکەن، ئەو حیزبە کە لەپێشدا نەخشەی بۆئەم ستراتیجیەتە دانابو.

دەزانرێ کە هەر لەساڵی ١٩٦٣ەوە، حیزبی بەعس جوت بوونی ئۆرگانێکی پێشەوای شۆڕشگێری مەدەنی و سەربازیی وەك تەنها رێگە بۆ بنیادنانی کارلێکێکی (interaction) ئایدیۆلۆژی لەنێوان هەردوو لادا دادەنا [٣٩]. لەپێناوی پێکنانی ئەم ئامانجە رژێمی بەعس، هەر لەکاتی گرتنە دەستی دەسەلات، دەستی کرد بەئایدیۆلۆژیزە کردنی سوپاو " نا سەربازاندنی" دەسەلاتی سیاسی لەرێگەی " بەعساندنیەوە ". دەتوانرێ، بەم بۆنەیەوە، ئەوە بیربخرێتەوە کەلەکاتی کودەتاکەی بەعس، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش پێکهاتبوو لەپێنج ئەندام، کە هەموویان ئەفسەری سوپا بوون. بەماوەی کەمتر لەدەساڵ ئەم ئەنجومەنە بوو بەئۆرگانێك کە زۆربەی ئەندامانی پێکهاتبوون لەکەسایەتی مەدەنی. لەساڵی ١٩٧٨، تەنها سێ ئەندامی سەربازیی بوون لەکۆی بیستو دووئەندام. لەساڵی ١٩٧٩ ئەم سێ ئەفسەرە تەنها کەسایەتی سەربازی بوون لەناو ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشو ئەنجوومەنی وەزیران کە ئەوانیش (سەرۆك ئەحمەد حەسەن بەکر، عەدنان خیرالله تفاحو سەعدون غیدان) بوون [٤٠]. لە هەمان کاتدا، کاتێك کە بەعس کاری دەکرد بۆ (چاندنی پرینسیبی پان عەرەبو سۆسیالیست لەنێوان سەربازەکاندا) لەپێناوی جێگرکردنی " پێوانەی ئایدیۆلۆژیو سەربازیی کە یارمەتی هێزی سەربازیی دەدا بۆجێبەجێ کردنی ئەرکەکەی بەشێوەیەکی باشو چەکداری دەکات دژی لاچون" و دەیخاتە ناو "جولانەوەی گەل بەسەرکردایەتی حیزب"، رژێمی بەعس توانی بەشێوەکی کاریگەرو پتەو رێکخراوی خۆی بچەسپێنێ لەناو هێزی سەربازیدا [٤١]. راپۆرتی سیاسی کۆنگرەی هەشتەمی حیزبی بەعس لەساڵی ١٩٧٤ زۆر راستەوخۆو بەروونی دەری دەخات کە لەماوەی پێنج ساڵدا حکوومەتی بەعسی توانی "ژێرخانی حیزب فراوانو بەهێز بکات " و لەرێگەی پێشەنگی هێزی سوپاو "بەهاوکاری ئەفسەرو سەربازی نیشتیمانی " توانی ببێ بەدەستو چاوی شۆڕش کە چاودێری وڵاتو سەرکەوتنەکانی گەل دەکەن [٤٢].

جگە لەبەعساندنی هێزی سوپا، رژێمی عیراقی هەوڵی دا ژمارەی زیادبکات. لەنێوان ١٩٦٨-١٩٧٨، واتا لەماوەی دەساڵدا هێزی سوپا فراوان بوونێکی بێ پێشنەیی بەخۆیەوە بینی. کاتێك کە لەنێوان ساڵی ١٩٦٨-١٩٧٣ ژمارەی هێزی سوپا لە ٨٠,٠٠٠ەوە بوو بە ١٠٠,٠٠٠، لەساڵی ١٩٧٨ گەیشتە ٢٣٠,٠٠٠، واتا نزیکەی سێ جار زیاتر لەوەی ساڵی ١٩٦٨ [٤٣].

جێی ئاماژەیە کە ئەم فراوان بوونە گەورییە پێش جەنگ لەگەڵ ئێراندا بوو. لەسەرتای جەنگەکەدا ژمارەی هێزی سوپا گەیشتە ٢٤٢,٠٠٠ و لەکاتی جەنگدا لەساڵی ١٩٨٤ پێکهاتبوو لە ٦٠٧,٠٠٠ [٤٤]. و لەساڵی ١٩٩٠ گەیشتە یەك ملیۆن [٤٥]. بێ گومان، بەبێ ئەژمارکردنی ژمارەی سەربازی یەدەگو پۆلیسو میلیشیای بەعسی. خزمەتی ئیجباری یاریدەدەرێك بوو بۆئەم زیادبوونە. لەساڵی ١٩٧٨ نزیکەی ملیۆنو نیوێك لەعیراق کەتەمەنیان لەنێوان (پانزە تا چلونۆ ساڵ) بوو ئامادەبوو بۆخزمەتی سەربازیو هەموو ساڵێك نزیکەی ١٢٠,٠٠٠ دەگەیشتە تەمەنی خزمەتی سەربازی [٤٦]. پاش دوو ساڵ لەخزمەتی سەربازی، هاوولاتی عیراقی ناچار دەکرا هەژدە ساڵ بەرێتە سەر لەناو یەکەیەکی یەدەگیی. لەساڵی ١٩٧٨ هێزی یەدەگ ئەژمار دەکرا بە ٢٥٠,٠٠٠ هاوولاتیو ئەگەر تا پێش ساڵی ١٩٨٠ بەهیچ شێوەیەك رێز نەدەگیرا لەتەسریح کردنی سەربازو سەربازەکان تا پێنج ساڵ لەناو لەشکردا دەهێلرانەوە بەبێ تەسریح [٤٧]، پاش ئەم بەرواره خزمەتی سەربازی بوو بەشتێکی بێکۆتایی، چونکە بوو بەدەزگایەك کەگوزارشتی دەکرد لەحاڵەتی باری ناکاو. لە کاتی تەنگەتاویەکانی دواییدا، سوپای عیراقی گەیشتە دوو ملوێن، واتا لە ٧٥٪ سەرجەم ئەو عیراقیانەی کەتەمەنیان لە نێوان ١٨-٣٢ ساڵ بوو.

جگە لەهێزی سەربازیی رێکخراو، رژێمی بەعسی خاوەن دەزگایەکی سەربازی دیکە بوو: گاردی نیشتیمانی (الحرس الجمهوری). گاردی نیشتیمانی بریتی بوو لەدەستەبژێرێکی بەعسی کە لەسەرجەم سەربازەکانی دیکە موچەی باشتر بو و بە شێوەیەکی تایبەتی مەشقی پێ دەکراو باشترین چەکی هەبوو. ئەرکی ئەندامانی

گاردی نیشتیمانی بریتی بوو لەپاراستنی سەدام حوسەین و پارێزگاری ئاسایش لە بەغدا. زۆربەی زۆری ئەندامانی ئەم دەزگایە پێکهاتبون لەپیاوی موخابەرات و ئاسایش لە خزم و کەس و کاری سەرۆك و بڕیاردەر بوون بۆ هێشتنەوەی دەسەڵاتی سەدام.

### میلیشیای بەعس: سوپای میللی

سوپای میللی(الجيش الشعبي) بریتی بوو لەڕێکخراوێکی پەرە سەربازی para military(واتا لەسەر بناغەی دیسیپلین و پێکهاتەی سەربازی ڕێکخرابو) حیزبی بەعس. سوپای میللی داردەستێك بوو بەدەستی حیزبەوە بۆ سەپاندنی دەسەڵات بەسەر میللەتی عیراقدا. لەساڵی ١٩٧٠ کرا بەدەزگایەك کەئامانجەکەی بریتی بوو لەمسۆگەرکردنی پاڵپشتێکی سیاسی بۆ ڕژێم و یارمەتی دانی هێزی سوپا بۆ جوڵانەوە دژی هەموو هەوڵدانێکی هەڕەشە دژی پەیڕەوی بەعسی. ڕاپۆرتی سیاسی حیزبی بەعس لەساڵی ١٩٧٤ زۆر بە ڕوونی و ئاشکرا وەسفی ئەرکی سوپای میللی دەکات و دەڵێ ""پرۆگرامی گشتی گۆرانی شۆرشگێڕانە لەقۆناغی داهاتودا پێویستیی بە هەوڵێکی زۆر هەیە لەپێناوی بڵاوکردنەوەی بەها ناسیۆنالیست و پان عەرەبەکان و هەروەها بەهاکانی غیرەت و خۆبەخش کردن و بەرپرسێتی و ڕێز بۆ کاری بەکۆمەڵ".
هەروەها جەختی دەخستە سەر ئەوەی کە "مەشقی سەربازیی جەماوەر شوێنێکی تایبەتی دەگرێ لەم بوارەداو پێویستە ئەم مەشقە فراوان بکرێتەوە بۆ ئەوەی گەورەترین ژمارە بگرێتەوە لەهاووڵاتیان بەتایبەتی گەنج و گروپی ڕێکخراو".

پێویست بوو کە "بەکارهێنانی چەك، پێکهاتە بنەڕەتیەکانی هاووڵاتی و کۆمەڵی نوێی بگرتایە". زیاتر لەوەش، مەشقی سەربازیی بۆ ژمارەیەکی زۆری هاووڵاتیان، لەشکرێکی یەدەگی زامن دەکرد بەپاڵ لەشکری ئاسایی کە دەیتوانی بەشێوەیەکی ئەکتیف هاوبەشی بکات لەپاراستنی شۆرش و وڵات و ئەرکی پان عەرەبیش ڕاپەڕێنێ(٤٨).

هەر لەساڵانی یەکەمی حەفتاکانەوە، خۆنوسین لەناولیستی میلیشیای بەعس تەرخان کرابوو بۆ ئەو لایەنگیرە بەعسیانەی کە تەمەنیان لەهەژدە ساڵ پتر بوو. سەرۆکی ئەم میلیشیایە (تەها یاسین رەمەزان) بو کەهاوکات ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش‌و سەرکردایەتی هەرێم‌و نیشتمانی بوو. بەرپرسەکانی سوپای میللی لەنێوان حەرەس قەومی‌و ئێلێمێنتی موخابەرات‌و ئاسایش هەڵدەبژێردران: ئەوانەی کە هاوبەشیان کردبوو لەکودەتاکەی ساڵی ١٩٦٣ و١٩٦٨. بەڵام لەساڵی ١٩٧٥و رژێمی عیراق دەستی کرد بەناو نووسینی هاووڵاتیانی نابەعسی لەناو ئەم میلیشیایە. بەم شێوەیە، لەبەشی دووەمی ساڵانی حەفتادا، سوپای میللی ژن‌و پیاوی سەرجەم توێژە کۆمەڵایەتیەکان دەگرتەوە{کرێکار، مامۆستا، فەرمانبەر، ...هتد}. ئەندامانی سوپای میللی، دوو مانگ لەساڵێکدا مەشقی سەربازی‌و ئایدیۆلۆژیان دەکرد لەژێر دەستی ئەفسەری سوپاو سەرکردە بەعسیەکان لەناو"خوێندنگەی مەشقی میللی" (مدرسة التدريب الشعب). لەساڵی ١٩٧٠ پێکهاتبوو لەچەند هەزارێك لەپیاوو ژن، بەڵام لەساڵی ١٩٧٨ەوە فراوانبوونێکی بێ هاوتای بەخۆیەوە بینسی، واتا پێکهاتبووله (١٠٠,٠٠٠)ئەندام [٤٩]. لەنێوان (١٩٨٠و١٩٨١)ژمارەی ئەندامانی گەیشتە (٢٥٠,٠٠٠)و لەساڵی (١٩٨٢)گەیشتە (٤٥٠,٠٠٠).گرنگە هێڵ بەژێر ئەوەدا بهێنرێ کە ئەگەر بەپاڵ ئەم ژمارانەوە، ژمارەی پۆلیسیش(٢٦٠,٠٠٠) ئەژمار بکەین (بێ گومان ئەم ژمارەیە پۆلیسی نهێنی‌و پۆلیسی سنورو هێزی جوڵانەوەشی دەگرتەوە)، دەتوانین بڵێین کە ژمارەی سوپای میللی زیاتر بوو لەژمارەی هێزی سوپای ئاسایی کە ئەو کاتانە بریتی بوو لە (٢٤٢,٠٠٠). دەبێ بوترێ کە پۆلیسی سنوروو هێزی جوڵانەوە بریتی بوو لەهێزێکی دیکەی زیادە لەناو دەزگای ئاسایش. ئەمانە پێکهاتبوون لە(٥٠,٠٠٠) پیاو کە بەتایبەتی‌و بەشێوەیەکی سەرەکی لەکوردستان لەسەر سنووری ئێران‌و تورکیاو سوریا جێگیرکرابوون. هێزی جوڵانەوەش بریتی بوو لەهێزێکی سەربازیی کە پاڵ پشتی پۆلیسی ئاسایی دەکرد لەکاتی پێویستداو بەتایبەتی دژی پێشمەرگەی کورد (بەکاردەهێنرا [٥٠]. بەم شێوەیە بۆ مان دەردەکەوێ

که توانای کۆنترۆڵی بەعس چەند بڵاوبوو و چەندگرنگتر بوو لەوەی هـێزی سـەربازیی.
لێرەشەوە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە بـەپاڵ هـەوڵی سیسـتیماتێك بـۆ دروسـت کردنـی
لەشکرێکی گـەورە وبـێ سنور، چـەند ڕژێمـی بـەعس هـەوڵی دا بـۆ سـەربازاندنو
سیاسـەتاندنی میللـەتی عـیراقی. هـەر لەسـەرەتاوە، کـاتێك میلیشـیای کـرد بـە
ئۆرگانیزمێکی دەزگایی، ڕژێمی بەعس مـەرامی بریتـی بـوو لـەچاندنو پتـەوکردنی
یەکـە لەشـکرەکان لـەناو سـەرجەم لادێو شـارۆچکەو شـارەکاندا: زۆر لـەچاودێران
بیردەکەنەوە کە ڕژێمی بەعس توانی ئەم ئامانجە هەر لەسـاڵی ١٩٨٧ەوە بپێکـێ [٥١].
دیارە ئامانجی بەعس بریتی بوولەوەی کە بەپاڵ سـەرجەم لقـە نـهێنیو ئاسـاییەکانی
پۆلیس، میلیشیا بکات بەئامێرێکی بەرگری چالاك بەرامبەر هەموو هەڕەشەیەك دژی
بەردەوامیی دەسەڵات. دەشێ ئەویش وەبیر بخرێتەوە کەهەر لەسـەرەتای دروسـتبونیەوە،
میلیشـیای بەعسـی لـە نـاو هێزیسـەربازیی تێکهـەڵکێش کـرا. هـــەر لەسـاڵی
(١٩٧٥)ەوە، بـۆ نموونـە، یەکـەکانی میلیشـیای بـــەعس بەشـێوەیەکی ئـەکتیڤ
لەئۆپێرەسیۆنە سەربازیەکان دژی پێشمەرگەی کوردو جەنگی لوبنان هاوبەشیان دەکرد
[٥٢] وهەروەها ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان بینی لەجـەنگی دژ بـەئێرانو جـەنگی کـەنداو.
شایسـتەی ئاماژەیـە کـە لـەچوارچێوە پەرەسـەربازیەکان، هـەموویان، بریتـین
لەپێکهاتەیەکی بنەڕەتی بزوتنەوە تۆتالیتاریەکان. سیسـتەمی میلیشـیا، لـە ڕژێمـە
تۆتالیتاریەکان، وەزیفەی هێشتنەوەی هێزێکی سـەربازیی حیزبیـان هەیـە کـەتوانای
بـەرگری هـەبێ دژی هـەموو هـێزێکی ئۆپۆزیسـیۆن لـەناوەوەی وڵات لەلایەکـەوە،
لەلایەکی دیکەشەوە دەتوانـێ هـەموو ئـەرکێکی سـەربازی بـەپاڵ هـێزی لەشـکرەوە
لەدەرەوەی وڵات بەجێ بێنێ. بۆ نمونە ڕێکخراوە پەرەسەربازیەکانی ناسیۆنال سۆسیالیزم
(ss SA یەکەکانی کوشتن . . . هتد)ئەم وەزیفەیـەیان هـەبوو . هـەروەها میلیشـیای
خۆبەخشـی ئاسایشـی ناسـیۆنالی (Milizia Volontaria Per la Sicurezza
Nazionale ) فاشیزمی ئیتالیش هەمان وەزیفەی هـەبوو. چـەند جیـاوازی هـەبێت،
لەسەر ئاستی بەهای سـەربازیی لـەنێوان پێکهاتـە ڕێکخراوەییـەکانی ئـەم حـیزبو

رژێمانە، بەڵام وەزیفەو ئامانجیان زۆر هاوبەشن‌و لەیەك دەچن. بۆ نموونە، یەکەکانی SA کەپێش گرتنە دەستی دەسەڵات بنیاد نران، بریتی بوون لە ئامێرێکی سەربازی نازی لەمەسەلەی وروژاندن‌و ئاژاوەی سیاسی وکۆمەڵایەتی. پاش گرتنە دەستی دەسەڵات، بوون بەتەواوکەری یەکەکانی ss کەبریتی بوون لە "کۆپیەکی راستەقینەی سوپا" یان لە" دووەم سوپای ئەڵمانی"[٥٣]. ئایا ئەمانە، هەر وەك هێزە پەرە سەربازیەکانی بەعس، بریتی نەبوون لە هێزی ترسناك‌و سامناکی چەوساندنەوەی سەربازی‌و سیاسی؟ بێ گومان ئەمانیش بون بە زامنکەری دەسەڵاتی نازی‌و تەواوکەری سوپای پیشەیی پێش و پاش جەنگی جیهانی دووەم. هەروەها لەئیتالیاش، میلیشیای خۆبەخشی ئاسایشی ناسیۆنال "بریتی بوو لەفۆرمێکی "بەدەزگاکراوی "پۆلی جوڵەوکار" ( Squadre d'azione) کە هاوبەشی لەوەرگرتنی دەسەڵات کرد. پۆلی جوڵەوکار لە ساڵی١٩٢٣ بەشێوەیەکی ڕەواکراو کاری دەکردو ئەرکی پێکهاتبوو لە بەجێهێنانی وەزیفەی هێزێکی گەورەی سوپا لەپێناوی بەرگری کردن لەفاشیزم‌و حکومەتی فاشی‌و نەتەوەی ئیتالی[٥٤].کاتێك کەفاشیزمی ئیتالی هێزی میلیشیای بەپیاوە هەرە ئەمەکدارو دڵسۆزەکانی رێکخراوی خۆی سپارد، ئەو ئەرکەی پێ راسپاردن کەچوار چێوەی شۆرش بپارێزن‌و بە هاوکاری هێزی پۆلیسی ئاسایی یان بەبێ ئەو هاوکاریە بتوانن رێگە بگرن لەهەر هەوڵدانێك کە بۆ تێکدانی ئاسایشی گشتی‌و هەرکۆسپێك کە لەبەردەم حکومەتی فاشی دابنرێ[٥٥]. رژێمی فاشی ئیتالیش، کەمیلیشیای خۆی بەجەستەیەکی سەربازیی دەوڵەت دانا[٥٦]، ئامۆژگاری پیاوەکانی رێکخراوی خۆی کرد کەبەرگری لە دەوڵەت‌و نەتەوە لە ناوەوەو لە دەرەوەی وڵاتدا بکەن، بۆ نمونە لەئەسوبیاو ئەسپانیا[٥٧].

## هەندێ دەزگای پەرە سەربازی دیکە

لەم ساڵانەی دواییدا رژێمی بەعس درێغی نەکرد لە دروست کردنی چەندین رێکخراوی پەرە سەربازی دیکەش: "فدائیی صدام"، "سیف القائد"، "اشبال صدام". منداڵانی نێوان ١٢-١٧ لە ناو ئەم هێزەی دوایین لەسەر چەکی سوك بۆ ماوەی یەك مانگ لە هاویندا مەشقیان پێ دەکرا. جگە لەمانەش، لەمانگی دووی ٢٠٠١، رژێمی بەعسی رێکخراوێکی دیکەی دروست کرد بە ناوی " جیش قدس". هەر وەك لەشکری میللی، ئەم رێکخراوەش خۆویستی (تەتەوعی) بوو. ئەندامان بۆ ماوەی دوو مانگ لە سەر کلاشینکۆف و قونبولەو مەدفەعیەتی سوك مەشقیان پێ دەکرا. جگە لە کاری بەرگری لەهێشتنەوەی دەسەڵات، ئەندامان هەڵدەسان بەئەرکێکی دیکە: بەهاوکاری لەگەڵ موخابەرات، سەردانی ماڵی کوردو تورکمان و ئاسوریان دەکرد لە پێناوی ئەوەی ئینتمای نەتەوایەتیان بۆ عەرەب بگۆڕن. لەبەر رۆشنایی بڕیاری " تصحیح القومیە"ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ژمارە ١٩٩ی ٦. ٩. ٢٠٠١، هەڵدەسان بە تۆمارکردنیان وەك عەرەب و دواییش لە ژێر فشاری سایکۆلۆژیو هەڕەشە کردن، وەك بەعسیو ئەندام لەم رێکخراوەدا تۆماریان دەکردن*.

## سەربازاندنی لاوان و پەروەردەی منالان

هەر لەدامەزراندنیەوە، حیزبی بەعس گرنگی بێهاوتای لاوانو پەروەردەی لاوانو رۆڵیان لەناو شۆڕشی بەعسی، خستە ناوەندی ئاگایی خۆی. دەزانرێ کە میشیل عەفلەق دامەزرێنەری حیزبی بەعس، چەندەبایەخی بەلاوان دەدا و هەوڵیدا "بەرپرسێتیەتی مێژوویی"یان لەپێناوی ئامادەکردنی داهاتوی نەتەوەی عەرەب پێ ببەخشێ. هەروەها دەزانرێ چەندین جار پێشنیازی ئەوەی دەکرد کە" نەوەی نوێ" (الجیل الجدید) بکرێ بە"سەربازی شەڕکەر" (جنود محاربین)و "تاکی خەبات گێڕ" (افراداً مناضلون)ی پڕ لە"رۆحی سەروەرو رەسەنو بەهێز" (روحاً صادقة، اصیلة، قویة ). گومانی تێدانییە کەبەلای عەفلەقەوە ئەرکی حیزبی بەعس بریتی بوو

لەپەردە هەڵماڵین لەسەر تواناو بلیمەتیی سیاسی لاوان بۆ ئەوەی واتای "پەیامی نەمری" (الرسالة الخالدة) بەعسیان بۆ بگوازێتەوەو بکرێن بەئامرازێکی ئەکتیڤی بزووتنەوەی بەعسی لەناو نیشتمانی عەرەبدا(٥٨). لەڕوانگەی میشێل عەفلەقەوە لاوان مەرجێکی بنەڕەتی پێك دەهێنن بۆ بەدیهێنانی "بیری" نەتەوەی عەرەب بەواتا هێگلیەکەی. لەپێناوی ئەوەی کە ئەم "بیرە" بەدی بهێنرایە، نەتەوەی عەرەب پێویستی بە "جۆرێکی تایبەت بەلاوان" (نوع معین الشباب) هەبوو چونکە ئەم جۆرە تایبەتییە، توانای هەبوو لەو " واقیعە گەندەڵە" (الواقع الفاسد) بێتە دەرەوەو هێزی خۆی دژی بەکار بێنێ. نەوەی نوێ نەیدەتوانی بگاتە ئامانجی مەزنو خۆی بەدی بهێنێ ئەگەر خۆی جیا نەکردایەتەوە لەنەوەی کۆنو ئەم جیابونەوەیەش نەدەگەیشتە ئەنجام ئەگەر ئەم "بیرە" لەناو رۆحی لاوان بەرجەستە نەبوایە.

کاتێك حیزبی بەعس لەعیراقدا دەسەڵاتی گرتە دەست، کارکرا بۆ ئەوەی نەوەی نوێ ئامادەبکرێ بۆ بەدیهێنانی "بیری" نەتەوەی عەرەب کەمیشێل عەفلەق چارەکە سەدەیەك لەمەوبەر تیۆریزەی کردبوو. بەم شێوەیە، پێویست بوو هەموو هەوڵو تەقەلایەکی سیستیماتیك بدرایە بۆ پەروەردەکردنی گەنجو گەنجیش دەبوایە خۆی لەگەڵ رۆحی شۆڕشی بەعسی بگۆڕیایە. بۆ بەدیهێنانی ئەم مەرامە، رژێمی عیراقی، هەر لەسەرەتای گرتنە دەستی دەسەڵاتەوە، دەستی کرد بەناونوسینی لاوان لەناو بەشە تایبەتیەکانی " یەکیەتیی گشتی لاوانی عیراق" (الاتحاد العام لشباب العراق). ئەم لقە تایبەتیانەی گەنجان پێکهاتبوون لە " الطلائع" کەمنداڵانی خوێندنگە سەرەتاییەکانی دەگرتەوە، "الطليعة" کەکچو کوڕی مێر منداڵ (١٠-١٥)ساڵی دەگرتەوەو هەروەها رێکخراوی "الفتوە" کەگەنجی (١٥-٢٠) ساڵی دەگرتەوە.

ئەم رێکخراوانە کە پاش ١٩٦٩ دامەزرێنرا بون، بەشێوەیەکی رەسمی بەدەوڵەتەوە لکێنران و خرانە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە. "الطليعة" رێکخراوە هەرە گرنگەکانی لاوانی عیراقی، کە پێکهاتبوو لەزنجیرەیەك لەهەرەمی هاوشێوە بەوەی حیزبی بەعسو کۆنگرەی ناوچەییو هەرێمیو نەسیۆنالی

هەبوو، وە هەروەها ئەندامانی فێری بیروباوەڕو ناوەڕۆکی ئایدۆلۆژی حیزب دەکران و لەسەر چەك و ئۆپەراسیۆنی بەرگری مەدەنی مەشق پێدەکران. جگە لەمەش، جلی تایبەتی خۆیان لەبەر دەکرد و سوێندی دڵسۆزیان دەخوارد بۆ حیزب و شۆڕشی بەعسی و داوایان لێ دەکرا راپۆرت بنوسن و هەموو جۆرە زانیارییەك سەبارەت بەڕاو هەڵوێستی دەورو بەر کۆبکەنەوە[٥٩].

لەساڵی ١٩٨٧، نزیکەی ٥٥ یان ٦٠٪ لەدانیشتوانی عیراقی بریتی بوون لەگەنجی کەمتر لە٢٠ساڵ[٦٠]. ئیعتبارمان بۆ رێژەی ئەم گەنجانە، دەتوانرێ وێنابکرێ تا چ رادەیەك رژێمی بەعس توانیویەتی ئەم جبەخانە ئایدۆلۆژیە بخاتە جوڵانەوەوە. شیکردنەوەیەکی کورتی راپۆرتی سیاسی حیزبی بەعس لەساڵی ١٩٧٤ ئەمەمان بۆ روون دەکاتەوە. راپۆرتی سیاسی بەعسی ئارەزووی بەرز خوازی خۆی سەبارەت بەئامادەکردنی کۆمەڵی عیراقی (لەرێگەی بزووتنەوەی لاوانەوە) بۆ " گۆڕانێکی شۆڕشگێڕانە" دەردەخات. دوپاتی دەکاتەوە کە " لاوان سەرچاوەیەکی هەمیشەیی هێزی نوێی حیزبن"و حیزبیش دەبێ رۆڵی ئەکتیڤ وەرگرێ لەنێوان لاواندا بەشێوەیەك کە بتوانێ (سروش)یان بۆ بێنێ (ئیلهامیان بداتێ)و سەرکردایەتیان بکات. پێویستی ئەم رۆڵە زیاتر دەبێ کاتێك کە "زۆربەی زۆری لاوان هەتا ئێستا لەژێر کاریگەری نەریت و شێوەی بیرکردنەوەی دژ بەرۆحی نەسیۆنال و سۆسیالیست و پێداویستیەکانی گۆڕانی شۆڕشگێڕانەن"[٦١]. راپۆرتی سیاسی بەعسی ئەوەش دەخاتە روو کەسەرەڕای زیاد بوونی ژمارەی لاوان لەناو رێکخراوە تایبەتیەکان و هاوبەشیان لەرەفتاری شۆڕشگێڕانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە لەسەر ئاستی ئارەزو و بەرز خوازی حیزبدا نین[٦٢]. کاتێك کەویستی خۆی دەردەبڕێ سەبارەت بەپاڵ پێوەنانی گەنج بۆ ناو رێکخراوە تایبەتیەکان لەماوەی پێنج ساڵی داهاتودا، واتا لە١٩٧٤- ١٩٧٩، بەعس دووپاتی کردەوە کە" ئەوەی کەکراوە هەتا ئێستا لەم بوارەدا تەنها دەست پێکردنێکە. ئێمە لەبەرزخوازی (طموح) حیزب و پێداویستیەکانی قۆناغی نوێ دواین. لەم بارەیەوە حیزب دەبێ زوو بەزوویی هەوڵی زۆر بدات بۆ پێشخستنی چالاکی رێکخراوەکانی

لاوانو ئەمانەش دەبێ زۆربەی زۆری گەنج بگرێتەوە لەکچو کورو هاوبەشی بکەن بەشێوەیەکی ئەکتیف لەچاندنی پرنسیپی پان عەرەبیزمو سۆسیالیست. حیزب دەبێ دیدێکی تایبەتیان بۆ دروست بکاتو بەشێوەیەك پەروەردەیان بکات کەبتوانن هاوبەشی بکەن لەبنیادنانی شۆڕشو داکۆکی کردن لەنیشتمانو راپەڕاندنی ئەرکە پان عەرەبیەکان [٦٣].

یەکێك لەو فۆرمۆلە ئایدۆلۆژیانەی کە بەگوێرەی ئەو دەبوایە گەنجی عیراقی لەناو بۆتەی (بوتقە) بزووتنەوەی ئایدۆلۆژیای بەعسییەك بخرانایە بریتیی بوو لەم ناونیشانەی خوارەوە:" نكسب الشباب لنؤمن المستقبل" [٦٤] . سەدام حوسەین کەئەم وتارەی لە ١٩٧٦/٢/١٥ پێشکەش دەکرد، دەیگوت کەهۆکاری ناونوسینی لاوان لەناو رێکخراوە تایبەتیەکان پێکهاتبو لەوەی کەلاوان زیاتر ژیانیان لەبەردەمدایە.

لەبەر ئەمە، دەتوانن پتر هاوبەشی بکەن لەبنیادنانی داهاتوو. کاتی تەرخان کردنی هەوڵو تەقەللا بۆ گەنج هاوکاری دەکات بۆ ئامادەکردنی داهاتو لەناو چوارچێوەی پرۆسەی گۆڕانی شۆڕشگێڕانەو ئەم کاتەش دەبێ درێژتربێ [٦٥]. زامن کردنی داهاتوو واتای ئەوەبو کەئەو میانەیەی کەتەمەنی گەنجیەتیو تەمەنی کاملی جیادەکردەوە، دەبوایە بخرایەتە ژێر "خزمەتی ئامانجەکانی شۆڕش" [٦٦]، چونکە کاتێك دەگەنە تەمەنی کاملی، لاوان کە بەگوێرەی پرنسیپی حیزبو شۆڕش پەروەردە کراون، دەتوانن مناعەی (الحصانة) تەواویان هەبێ دژی لادانی ئایدۆلۆژی. زیاتر لەوەش، حیزب دەبێ تێبگات کەهاوجوتکردنی گەنجان لەگەڵ پرینسیپو بیری نوێ، زۆر ئاسانترە لەوەی خەڵکی کامڵ [٦٧]. کاتێك کە بایەغ بەلاوان دەداو متمانەیان رادەکێشێ، حیزب دەتوانێ ئەو لقانە ببڕێ کە هێزی دژ بەشۆڕش بەهێز دەکەن [٦٨] و وا دەکات کە دوژمنانی شۆڕش بواری ئەوەیان نەبێ خراپە بگەیەنن بەدەزگاکانی دەوڵەتو زیان بە رێپێوانە(مسيرة) شۆڕشگێڕانەکەی بگەیەنن [٦٩].

لەم بوارەشدا خۆمان بەرامبەر هەمان لۆژیكو دامەزراوەی بزووتنەوەی تۆتالیتاریەکان دەدۆزینەوە. چونکە فۆرمۆلەی زامن کردنی متمانەی لاوان بۆ مسۆگەر

کردنی داهاتوو ئاراستە کردنی بزوتنەوەی گەنجان بەرەو خزمەتی تەنــها یـەك حـیزب، تایبەت نییە بەتەنــها ئایدۆلۆژیــای بەعسـی. پـرۆژەی ســەرجەم ئایدۆلۆژیــاو رژێمـە تۆتالیتاریەکان هەمان رەهەندیان هەیــە. بـۆ نمونــە پــرۆژەی نەسـیۆنال سۆسـیالیزم‌و فاشیزمی ئیتالی ســەبارەت بەئاڕاسـتە کردنـی ئایدۆلۆژیــای لاوان بــەرەو بــەرزخوازی تۆتالیتار زۆر لەیەکتری دەکەن‌و لەگەڵ ئەوەی بەعسیشدا وەك دوو دڵۆپەی ئاو وان. بـۆ نمونە، کاتێك لەیەکی دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٦ یاسای لاوانی ئەڵمانی دانــا، هیتلــەر دەیگوت: " داهاتوی میللەتی ئەڵمانی دەوەستێتەوە سەر لاوان. بەم شــێوەیە ســەرجەم لاوانی ئەڵمانی دەبێ ئامادە بکرێن بۆ ئەم ئەرکانەی داهاتو" (٧٠) . هەروەها، دروشمــی سەرەکی ریتۆریکــی (واتــا هونــەرو تــەکنیکی قســەکردن) موسـۆلینی بریتــی بــوو لەبانگەشــە کــردن بــۆ لاوان (Giovinezza ) (٧١) کــاتێك کەنەسـیۆنال سۆسـیالیزم دەیویست ووزەی دەوڵەت بەرەو هێزێکی رەها بەرێت، هیتلەر بانگەشەی بـۆ میللــەتی ئەڵمانی دەکرد کە لەپێناو رزگارکردنی ئەو میللەتە لەلادان‌و خراپ بون، پێویست بـو رێگەیەك بدۆزرێتەوە بۆ هێشتنەوەی گیانی رۆڵــەی ئــەڵمانی کــە لەنــەوەی داهــاتودا لەدایك دەبوو (٧٢) . پێش هەموو شتێك هیتلەر ووتەی ئاڕاســتەی "هــێزی ســەربازیی" لاوان کرد، چونکە بەڕای ئەو لەســەردەمی روداوە گرنگــەکانی مێــژوو، لاوان دەبوایــە رۆژێك نوێنەرایەتی " ئەندازیاریی دەوڵەتی نوێی رەگەز پەرستیان بکردایە" (٧٣) . بەم شــێوەیە کــاتێك نەســیۆنال سۆســـیالیزم گەیشـــتە ســـەر حوکـــم، هیتلــەر داوای هەڵوەشاندنەوەی رێکخراوە کۆنەکانی لاوانی کردو ویســتی بزووتنــەوەی لاوان دروســت بکاتەوەو خستیە ناو چوار چێوەی " لاوانی هیتلەرەوە" (Hitler- Jugend). ئــەندامی ئەم رێکخراوە سوێندی دڵسۆزی دەخواردو سەروەریی خـۆی پیشـان دەدا بـۆ نەسـیۆنال سۆســـیالیزم. هــەروەك ئەوانــەی رژێمــی بەعســی، رێکخراوەکــانی لاوان بـــۆ کوڕ(Jungmadel ) بریتیی بون لەمنداڵی کوڕ لەتەمەنی ١٤-١٨ ساڵ‌و منداڵی کچ لەتەمــەنی ١٤-٢١ ســاڵ (٧٤) . ژمــارەی ئــەندامانی لاوانــی هیتلــەر بەشــێوەیەکی سەرسوڕهێنەر فراوان کرایەوە: لەســاڵی ١٩٣٣ ژمارەیــان ١٠٨,٠٠٠ بــوو و لەســاڵی

١٩٣٤ ئەم ژمارەیە گەیشتە سێ ملیۆنو شەش سەد هەزارو لەساڵی ١٩٣٩ لە ٧ ملیۆن تێپەڕ بوو[٧٥] .

گرمۆڵە کردنی لاوانی ئەڵمانی لەناو ڕێکخراوە ئایدۆلۆژییەکانی توندو تیژی، پشت گیری قەناعەتی نەسیۆنال سۆسیالیزمی دەکرد بۆ بەنازیکردنی گشت میللەتی ئەڵمانی بەدەست پێکردن لەلاوانەوە. ئامادەکردنی داهاتوی میللەتی ئەڵمانی دەبوایە لەرێگەی "بوون بەخاوەنی (خاوەندارێتی) تەواوی لاوان" [٧٦] لە سەر بنچینەی ئەم هەڵوێستەی خوارەوە مسۆگەر بکرایە:

"لەم سەردەمەدا، رێگە نادرێ بەوەی کە لاوان دوور لەمیسالیەتی نەسیۆنال سۆسیالیزم گەورە ببن. ئەڵمانیای گەنج دەبێ هەر لەمنداڵیەوە فێری بیرو باوەڕی نەسیۆنال سۆسیالیزم بکرێ[٧٧] . فاشیزمی ئیتالیش هەمان لۆژیكو میکانیزمی کارکردنی هەبوو. فاشیزمی ئیتالیش هەڵسا بەسەربازاندنی لاوان لەپێناوی مسۆگەر کردنی داهاتوی نەتەوەی ئیتالی. ئامانجی بنیادنانی L'opera Nazionale di Balilla لەئەپریلی ساڵی ١٩٢٦ بریتی بو لە " دروستکردنەوەی" لاوان لەسەر بنچینەی ئایدۆلۆژیای فاشی. ئۆپێرە بەلیللە Opera Balilla بەگوێرەی تەمەن دابەش بوبو بەچەند بەشێکەوە: منداڵانی تەمەنی ٤-٨ ساڵ لەناو رێکخراوی بەلیللەو پیککۆڵی ئیتالیانێ (Piccole Italiane ) ، مێردمناڵ لەتەمەنی ١٤-١٨ ساڵ لەناو رێکخراوی " پێشەوایو کچی گەنجی ئیتالی" (Avanguardisti Giovani Italiane) و گەنجی ١٨-٢١ ساڵ لەناو رێکخراوی "گەنجی کوڕو کچی فاشی" (Giovani Fascisti e Fasciste)[٧٨] .

لەساڵی ١٩٣٣ بەلیللە پێکهاتبو لە ٣٦٠٠٠٠ ئەندامو پێشەوا لە ٢٤٤٠٠٠و پیککۆلا ئیتالیانێ لە ٧٢٠٠٠٠و کچی گەنجی ئیتالی لە ٩٢٠٠٠ . لەساڵی ١٩٣٦ ژمارەی لاوان لەناو رێکخراوە تایبەتیەکان بو بە پێنج ملیۆنو گەیشتە شەش ملیۆن لەساڵی ١٩٣٧و نزیکەی هەشت ملیۆن لەکاتی جەنگی جیهانی دووەم[٧٩] . لاوانی ئیتالی دەبوایە سوێندیان بخواردایە بۆ خزمەتکردنی مەسەلەی شۆڕشی فاشی . یاسای

ژماره ١٨٣٩ لەساڵی ١٩٣٧ لاوانی ناچار دەکرد کە ئەم سوێندەی خوارەوە بخۆن: "سوێند دەخۆم فەرمانی دوچێ (Duce واتا موسۆلینی) جێبەجێ بکەمو خزمەتی مەسەلەی شۆڕشی فاشی بکەم بەهەموو هێزێکمەوەو ئەگەر پێویستیش بکات بەخوێنی خۆم"(٨٠).

بێ گومان، دەتوانرێ بەئاسانی پتر باس بکری لەو یەکچونەی کە بە دی دەکرێ لەنێوان پرۆژەی بەعسیو نەسیۆنال سۆسیالیزمو فاشیزمی ئیتالی سەبارەت بەناو نوسینی ئایدۆلۆژی لاوان لەبەرژەوەندی ئارەزوە تۆتالیتاریەکان. بەلاّم گرنگ ئەوەیە بزانرێ کە میکانیزمی کارکردنی بزوتنەوە تۆتالیتاریەکان هەمیشە دەچەمێنەوە بۆ فریوبردنی لاوان. چەند بێ جیاوازی نێوان ئەو ماکە ئایدۆلۆژیانەی کەدەیانبزوێنن، چەند بێ جیاوازی مۆرفۆلۆژی سیستەمەکانیان، چەند بێ جیاوازی ترادیسیۆنی کولتوریو مێژوییانو چەند بێ جیاوازی ئەو روداوانەی کە دەیانهێننە سەرحوکم، بەلاّم سروشتیان لەیەك دەکات لەلایەنی قۆزستنەوەیان بۆ جۆشو دڵ گەرمیو بەهەلپەییان لەبەرژەوەندی رژێمەکانیان کە لەسەر ناهەمواری (Intolerance)و رقو کینەو پەسەند نەکردنی ئەوی تر رەگیان داکوتیوە. ئەم بزوتنەوە تۆتالیتاریانە دەزانن کە مەیلی گەنجان بۆ پەسەند کردنی تەنها حەقیقەت کە هی خۆیانەو بۆ نەدانی ماف بەوی دیکە حەقیقەتی خۆی دەربڕێ، دەتوانرێ کریستالیزە بکری (واتا ئێلێیمێنتەکانی کۆبکرێنەوە لەناو کۆیەکی سەقامگیر) لەو چرکەیەی کە هەڵدەسن بەداکوتانی حەقیقەتی رەسمی حیزب لە ناو زەینیان ( مێشکیان) بە شێوەیەکی دۆگماتیكو بەکۆکردنەوەیان لەناو رێکخراوی ئایدۆلۆژی توندو تیژ. دەزانن کەئاسانترین رێگە بۆ زامن کردنی جۆشو دڵسۆزیان بریتییە لەفێرکردنیان بۆ ژیان لەگەڵ حەقیقەتی ناڕاست بەشێوەیەکی رەقو سەختو خۆگرو توندو تیژ. دەزانن کە بۆ بەجێهێنانی ئەم ئامانجەش پێویستیان بەوە هەیە کە هەمو ئاسۆیەکی زانیاریو هۆشیاری سەبارەت بەبونی حەقیقەتی دیکەیان لێ دابخەن. دەزانن کە لەو ساتەی جیهانێکیان پیشان دەدەن کە سەرچاوە دەگرێ لەچەند ئۆنتۆلۆژیەکی دیکۆتۆمی

(حەقیقەتی پوختی بیرۆكەی حیزب ـ ناراستی پوختی بیرو باوەڕی ئەوانی دیكە، باشی ئەم حەقیقەتە- خراپی رەفتاری نەگونجاو لەگەڵ ئەم حەقیقەتە .. هتد. )، لاوان ئامادەدەبن خۆیان تەرخان بكەن بۆ ئەو ئامانجەی كە لەپێناوی پەروەردە كراون بەشێوەیەكی وا زێدرەو كە پەسەند نەكردنی ئەوی تر و تەحەمول نەكردنی رەفتاری جیاوازی، دەبن بە پێشمەرجێك بۆ خۆتەرخان كردنی ئایینی. خۆشەویستی رەها بۆ ئەم ناراستیە (ئەم راستیە ناراستە) دەیانگۆڕێو دەیانكات بەو تاكانەی كەدڵیان دەكرێتەوە لەرێگەی كینەی رەها دژی ئەوی تر. هەستی پیرۆزیی قوربانی دان لەناو پیس كردنو بەدنیەوی كردنی هەڵوێستی ناحیزبی خۆی دەدۆزێتەوە كەدادەنرێ بەخۆپەرستیو كەم تەرخەمی. حیزبی سەركردە، مەتێریالیزە دەبی لەرێگەی ریسواكردنو بەسوك تەماشاكردنی ئەوی دیكە.

بەپاڵ ناونوسینی گەنجان لەناو رێكخراوە چونیەكیەكانی حیزبی رەسمی، نەسیۆنالیزمە تۆتالیتاریەكان بەشێكی زۆر لەووزەی خۆیان تەرخان دەكەن بۆ گۆڕینی خوێندنگەو دەزگا پەروەردەییەكانو كردنیان بەناوەندی پڕپاگەندە لەبەرژەوەندی رۆحی نەسیۆنالیزمو سەربازیو زینۆفۆبی. سروشتی فیزیۆنۆمی خوێندنگەكان دەگۆڕنو تێكی دەدەن چونكە وەزیفەی سروشتی گەشە سەندنی توانا رۆشنبیریەكانی خوێندكارانو نەقڵ كردنی زانست بەئاراستەیەكی ئایدۆلۆژی گشتگردا دەبەن. بەم شێوەیە، ئامانجی سیستەمی خوێندنگەیان بریتی نابێ لەپەروەردەكردنی هاوولاتی بەواتا تەكنیكیو گەردونیەكەی، بەڵكو پێك دێت لەهەوڵ دان بۆ فابریكەكردنی شێوەی بیركردنەوەی تۆتالیتار. ئەركی مامۆستاو پسپۆڕی پەروەردە دەبێ بەگوێزانەوەی جۆشی باوەڕ بۆ ناو حیزب كەسەرچاوە دەگرن لەشانازی نەسیۆنالو رۆحی شەڕو ئێتیكی سەربازی. سەرجەم بزووتنەوەو رژێمە توتالیتاریەكان ئەم جۆرە تێڕوانین و هەڵوێستەیان هەیە. كاتێك كەخوێندنگە دادەنێین بە رێگەیەكی تایبەتی لە پێناوی پتەوكردنی هێزی رۆحی منداڵانو گەنجان، ئەمان سیستەمی پەروەردەیان بەرەو ئاراستەی ئامانجە ئایدۆلۆژیو سیاسییەكانی حیزب دەبەن. بۆ نموونە بەلای هیتلەرو

موسولنییەوە، پێویست بوو زوو بە زوویی سیستەمی پەروەردە چاك بكرێ كـە تیـایدا ئایدۆلۆژیای نازی یان فاشی جێی كەڵەكە بوونـی كـەم و كـوڕی رابـردوو و نیشـانەی نزمبـون و رزینـی سـەردەمی حـازری بگرتایـە. هیتلـەریش بزوتنـەوەی نەسـیۆنال سۆشیالیزمی پێناسە دەكرد لەناو چوار چێوەی پەیامی پـەروەردەیی كـە بـە گوێـرەی پێویست بوو میللەتی ئەڵمانی گەورە بكرایـە: "نەسـیۆنال سۆشـیالیزم تـێروانینێكی ئاسایی نییە سەبارەت بە (كێشەی) دەوڵەت (. . .) . وەك عەقیدەیـەك، بریتییـە لـە كێشەی پەروەردەیی گشت نەتەوە" [٨١]. لە پێناوی راپەڕاندنی "ئەركی پـەروەردەیی"، دەوڵەتی نازی پێویست بوو پێش هەموو شتێك خوێندنگەكان بكات بە كۆڵەكەیـەكی پتەوی سیستەمەكەی و بە بنچینەیەكی بەهێز بۆ دابین كردنی داهـاتوو. لـە مایسـی ساڵی ١٩٣٣، واتا چەند مـانگێك پاش گرتنە دەستی دەسـەلات، لەرێگـەی فـەرمانی دادوەرییەوە، نەسیۆنال سۆشیالیزم دەستی كرد بە وێنە كێشانی هێڵە رێپیشاندەرەكانی سیستەمی پەروەردە. لەژێر ناونیشانی "ئامانجەكانی خەباتی خوێندنگە ئەڵمانییەكان" پێویست بوو سیستەمی خوێندنگە (هەروەكو وەزیـری نـاوخۆ، دكتـۆر ویلـهێم فریـك Wilhelm Frickدەیگوت) فابریكەی پیاوێكی سیاسی بكات كە بیرو كـردەوەی خـۆی تەرخان بكات بۆ خزمەت كردنو قوربانی دان لـەپێناوی میللەتەكـەی. لەبـەر ئـەوە، خوێندنگەكان دەبوایە جۆرێكی نوێیان لەپیاو پەروەردە بكردایە كـە بەلـەشو بـەرۆح رێكو پێك بوایە [٨٢]. پرۆسـەی پـەروەردە كـە لەلایـەن جۆزیـف گۆبلسـەوە Joseph Goebbels تەشبیە كرا بە "مەكینەی هەویر شێلان" [٨٣]، دەستی كـرد بـە ئاراسـتە كردنی منداڵان بەرەو ئەوەی كە "بەقوڵی تەجربەی نازی خۆیان بكەن" [٨٤]. پێویست بوو گۆڕان بۆ میستێكی نەسیۆنال سۆسیالیست جێ بەجێ بكرێ هـەر لـە بێشـكەوە تابگەیشتایەتە تەمەنی كامڵ: هیتلەر دەیگوت "لەیەكەم كتێبی وێنەوە بـۆ منداڵـی شیرخۆر پێویستە هەموو شتێك خزمەتی دەوڵەت بكات" [٨٥]. لێرە، لەسەر بنچینـەی ئەم جیهانبینییە، ئـەركی مامۆسـتا بریتـی بـوو لـەبنیادنانی داهـاتووی هـاوولاتی نەسیۆنال سۆسیالیست. بە توانایی مامۆستا دەبوایە پێش هەموو شتێك دەربكەوتایـە

له بواری "پەروەردەی نیشتمانی" له ڕێگەی فێرکردنی مێژووی رابووردووی نەتەوەی ئەڵمان، لەبواری خولقاندنی کەراکتەرو بونیەتی منداڵ لەپێناوی گەشەپێدانی رۆحی شەڕو لەبواری دابین کردنی (ئامادە کردنی) رۆحی "هەژاندنی زریاناوی ئەڵمانی بەرەو چالاکیو خەباتو سەرکەشی (سەرچڵی) (٨٦). هیتلەر زۆر بەئاشکرا کینەی خۆی نەدەشاردەوە بەرامبەر پەروەردەی مەدەنیو کولتور چونکە ئەم شێوە پەروەردەیە، بەلای ئەوەوە، دژی گرنگی بنیادنانی کەسایەتی منداڵ بوو کە دەبوایە دروست بکرایە لەناو چوارچێوەی رۆحێکی نەسیۆنالیستو رەگەزپەرستانەوە(٨٧).

هەروەها فاشیزمی ئیتالیش دەیویست ببێ بە مسۆگەرکەری "یەکێتیو کۆك کردنی لایەنە جیاوازەکانی سەرجەم بەهاکان" و ئەکتەری "هەموو ژیانی گەل" و خۆی دادەنا بە "مامۆستاو بەڵێنگری ژیانی رۆحی" میللەتی ئیتالی"(٨٨). لەپێناوی پتەو کردنی "کەرائەکتەری ئیتالییەکان" (٨٩)، هەڵسا بە دانی بەرپرسێتی بە خوێندنگەکان بۆ ئامادە کردنو پەروەردەکردنی گەنجان لەناو چوارچێوەی "کەشی رۆحی و ئەخلاقی" (٩٠) ئایدۆلۆژیای فاشی. بەم شێوەیە، بۆ ئەوەی دیدە توتالیتارییەکەی بەدی بێنێ، فاشیزمی ئیتالی هەستا بە فراوان کردنی کاریگەری خۆی لەناو هەموو سیستەمی پەروەردە، هەر له خوێندنگەی سەرەتاییەوە هەتا دەگاتە زانکۆ. بەم بۆنەیەوە لەساڵی ١٩٢٥ وەزیری پەروەردەی گشتی، پیێرۆ فیدێلێ Piero Fidele " دەیگوت: "حکومەت داوا له سەرجەم خوێندنگەکان دەکات، لەسەر هەموو ئاستێكو هەموو پرۆگرامی وانە ووتنەوە، هەڵسێت بە پەروەردە کردنی گەنجی ئیتالی بۆ ئەوەی فاشیزم تێبگاتو بژی لەناو دۆخێکی مێژوویی کە لەلایەن شۆڕشەوە خولقێنراوە" (٩١). بەم شێوەیە، خوێندنگەکان، هەرلەئاستی سەرەتاییەوە هەتا زانکۆ، بون بەو دەزگایانەی کە خۆیان گونجاون لەگەڵ داخوازیەکانیو بانگەشەی پروپاگەندەی فاشیزمو پرۆگرامی خوێندنیان گونجاون لەگەڵ ئایدۆلۆژیای رەسمی. لەژێر گوشاری حیزب، مامۆستایان داوایان لێ کرا نەوەی نوێ ئامادە بکەن بۆ "راپەڕینی رۆح" دژی نەریتی کۆنو پتەوکردنی کۆڵەکەکانی باوەڕی پڕ له هەستو سۆز. بەم شێوەیەی خوارەوە گەنجان

پەروەردە دەکران: "خوێندنگە ژیانەو ژیانی ئیتالیش بریتییە لەجۆش بۆ باوەڕو دیسیپلینی فاشی": " تۆ دەبێ بە دڵسۆزیەوە پەروەردە بکرێی بۆ فاشیزم"[٩٢].

جۆزێپیێ بۆتتایJuseppe Bottai دەیگوت "یەکێتی ئۆرگانیکی" حیزبو لاوان لەگەڵ "سەردەمی خوێندنگەی ئەگنۆستیك" [٩٣] دەبێ نەمێنێو خوێندنگەی فاشیو پێداگۆژی pedagogy فاشیو فێرکردنی فاشی"[٩٤] دەبێ جێی بگرنەوە.

ئایا هیچ جیاوازییەکی پێکهاتەیی دەبینین لەگەڵ بەعسی عێراقیدا؟ نەخێر. بەڵام با برێك زیاتر لەنزیکەوە تەماشای توتالیتاریزمی بەعسی بکەین.

هەر لەگرتنە دەستی دەسەڵات، رژێمی بەعس دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی ئامۆژگارییەکانی بۆ پسپۆرانی پەروەردە بۆ ئەوەی بتوانن پرۆگرامی خوێندنگەیی بگونجێنن لەگەڵ پێداویستییەکانی پرۆسەی "گۆڕان بەسەرکردایەتی حیزب" [٩٥].

تەکنیکی فابریکەکردنی خوێندکاران، واتا فابریکە کردنی بەعسییەکانی داهاتوو پێویستی هەبوو بە جێ بەجێ کردنی"پرۆگرامی نوێ" کە لەسەر هەر ئاستێك، لەدایەنگاوە بۆ زانکۆ، سەرچاوە بگرێ لەپرنسیپی حیزبو شۆڕش [٩٦]. بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجە، چەندین کۆمیتەی (لیژنەی) پیاچوونەوە دروستکران بۆ گۆڕینی پرۆگرامی پەروەردەیی لەپێناوی راهێنانی "نەوەی نوێو دژی ئەو ئایدۆلۆژیو کولتورانەی کە ناگونجێن لەگەڵ بەرز خوازی (طموح) نەتەوەی عەرەبو ئامانجەکانی بۆ یەکێتیو ئازادیو سۆشیالیزم"[٩٧]. لە ساڵی **١٩٧٣** سەدام حوسەین دەیگوت ئەو لیژنانەی کە بەرپرسێتی چاکسازی پرۆگرامی خوێندنگاکانیان وەرگرتووە نابێ "بیرۆکەی دەست راکێشان یۆ دوژمنە تەقلیدییەکانی" نەتەوەی عەرەبیان لە بیر بچێتەوە و دەبێ کار بکەن لەپێناوی ئەوەی کە"منداڵ و خوێندکار بەردەوام بن لە رقو کینە دژی ئیمپریالیزم" [٩٨]. لە بۆنەیەکی دیکەدا، سەدام حوسەین ئامۆژگاری پسپۆرانی پەروەردەو بەڕێوەبەرانی خوێندنگەکانی دەکرد کە بایەخ بدەن بە خوێندکارو نەهێڵن دۆگمی حیزب لەبەر بکات" وەك توتی" چونکە دڵسۆزی ناوەوە کە حیزبی بەعس دەیەوێ بیخولقێنێ لەناو گیانی خوێندکار نابێ گوزارشتی لێ بکرێ تەنها لە

ڕێگەی فێربوونێکی رووکەشیی هەندێ فۆرمەلەی بەعسی، بەڵکو "لە ڕێگەی ڕاهێنانێکی دڵسۆزو تەندروستو داهێنانی پرۆگرامی شۆڕش" (٩٩).

لە پێناوی "چاککردنی" پێکهاتەی ئەخلاقیو سایکۆلۆژی تاکی عێراقی،" پەروەردەی نیشتمانی" کە دەیویست" کارلێکێکی دوور و درێژ و دڵسۆزانە" (تفاعلا تفصيليا و صميما) زامن بکات لەنێوان هاوولاتیو ئامۆژگارییە گشتییەکانی حیزب، دەستی کرد بە جێ بەجێ کردنی ئەو یاساو ڕێنماییانەی کە دەسەلاتی سەدام حوسەین سەپاندبووی. "کەسایەتیاندنی" personification ویستی بەعس لەلایەن سەدام حوسەینەوە، دڵسۆزی ناوەوەی بۆ حیزبو کینە دژی دوژمنی میللەتی کرد بە پرۆپیدیتیکی Propaedeutic خوێندن لەعێراقدا.

بەم بۆنەیەوە، پێش هەموو شتێك ئەرکی ئەم پرۆپیدیتیکەی خستە سەرشانی مامۆستای سەرەتایی: "بەرپرسێتی مامۆستای سەرەتایی پێش ئەوەی مامۆستای ناوەندیو دواناوەندیە، ئەمیش پێش ئەوەی زانکۆیە" (١٠٠). لە بەر چ هۆیەك؟ چونکە مامۆستای سەرەتایی پەروەردەی ئەو منداڵەی کەوتۆتە سەرشان کە لەپارچەیەك مەرمەڕی خاو دەکات لەژێر دەستی پەیکەر تاش دا. لەبەر ئەوە مامۆستای سەرەتایی دەسەلاتی ئەوەی بەدەستە کە چۆنی بوێ بەو شێوەیە دەتوانێ فۆڕمێکی ئیستاتیکی بداتێ بەبێ ئەوەی بهێڵێ کە وازی لێ بهێنرێ بۆ ڕەحمەتی کاتو ناهەمواری سروشت (١٠١). ئەوانی دیکە ، بۆ نموونە مامۆستایانی زانکۆ، ئەو خوێندکارانەیان لەژێر دەستایە کەپێکهاتەی خولوقیو سایکۆلۆژیان دروست بووەو ئەگەر ئەم پێکهاتەیە چەوت بێ، زەحمەتێکی زۆر دەبینین لەچاککردنەوەی بە قولّی (١٠٢). لەبەر ئەم هۆیە، پسپۆڕانی پەروەردە دەبێ تێ بگەن کە بەرپرسێتی مامۆستای سەرەتایی زۆر ناسكو گرنگە. لەبەر ئەم هۆیەش، پەروەردەی منداڵ لە تەمەنێکی زۆر کەمەوە، پێویستی بە "فلچەی هونەرمەندێکی بە توانا" (ريشه فنان مقتدر) هەیە کە بتوانێ ڕۆحی بە "ڕەنگی گونجاو" (١٠٣) بڕازێنێتەوە.

لەپێناوی پاراستنی منداڵ لەو بیروباوەڕانەی کەباویان نەماوە، پێویستە بنەماکانی ئایدۆلۆژیای بەعسی بەهێز بکەین لەناو نەوەی نوێدا. دەکەوێتە سەر حیزب کە منداڵ بکات "بەناوەندی روناکی لەناو خێزاندا کە بریتییە لە دایكو باوكو خوشكو برای بۆ ئەوەی بتوانێ بدرەوشێتەوە (لیشع) و (.. ..) فێری شێوەی هەڵسوکەوتو رێزیان بکات کە دەوەستنەوە سەر چەمکەکانی شۆڕش "چونکە کاتێك منداڵ لە خوێندنگە پەروەردە دەکرێ، ئەو لەوێ فێری ئەوە دەبێ چۆن لە خێزانەکەیدا شێوازێکی نوێ لەژیان دەخولقێنێ لەسەر بنچینەی پارتی عەرەبی سۆسیالیست و گۆڕانی شۆڕشگێڕانە"[١٠٤]. بەلای سەدام حوسەینو بەعسەوە گواستنەوەی بەهاکانی شۆڕشی بەعسی لەرێگەی منداڵو گەنجەوە بۆ خێزان دەبوایە رێگەی بگرتایە لەرەنگدانەوەکانی نەریتی کۆن لەناو خێزاندا: "بۆ ئەوەی رێگە نەدەین بە باوكو دایك دواکەوتن بسەپێنن بەسەر خێزاندا پێویستە وا بکەین کەمنداڵ لەماڵەوە بدرەوشێتەوە لەپێناوی دەرکردنی ئەم دواکەوتنە، چونکە هەندێ چونکە هەندێ باوكو دایك لەدەستمان دەرچوون لەبەر چەندین هۆکار، بەڵام منداڵی بچووك هێشتا لەدەستمان دەرنەچووەو پێویستە بیکەین بە ناوەندی روناکی لەناو خێزاندا (.. ..) لە پێناوی گۆڕینی بۆ بارو دۆخێکی باشتر و دووری بخەینەوە لە شتی خراپ"[١٠٥].

سەدام حوسەین ئەم ووتارەی ئاڕاستەی فەرمانبەرانی پەروەردەی نیشتمانی دەکرد لەساڵی ١٩٧٧ و بەم بۆنەیەوە ناڕەزایی خۆی دەردەبڕی بەرامبەر ئەو بەرپرسیەتییەی کە وەریان گرتبوو. سەدام حوسەین دەیویست بڵێ کە ئەوەی تا ئەوسا کرابوو هێشتا زۆری مابوو. داوای لێ دەرکردن کە زیاتر قوربانی بدەنو زیاتر تێبگەن کە زۆرینەی میللەت هێشتا " بەتەواوی رزگاری نەبوە لەبیرو نەریتی کۆمەڵی رابردوو"[١٠٦]. ئەو نۆ ساڵەی پاش شۆڕش بریتی بوون لەتەنها سەرەتایەكو حیزبی بەعسیش هۆشیار بو بەرامبەر ئەوەی کەدەسکەوتی شۆڕش هێشتا لەسەر ئاستی ویستو بەرزخوازی بەعس نەبوو لەپێناوی رێپێوانێك بەرەو خولقاندنی "پەیڕەوی نوێ" و لە پێناوی ئەوەی ئەم

ڕێپێوانە ڕێگەی لێ نەگیرێ، پێویست بوو کە مامۆستایان خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەم فۆڕم و یاسایانەی خوارەوە:

١- پێویستە لەسەرتان دەورەی گەورەکان (خەڵکی کامڵ) بگرن لەڕێگەی منداڵەکانیانەوە.

٢- منداڵو خوێندکار فێربکەن کە بەرەنگاری باوكو دایکیان ببنەوە کاتێك دەبیستن باسی نهێنی دەوڵەت دەکەنو ئاگاداریان بکەنەوە کە ئەمە ڕاست نییە.

٣- فێریان بکەن کە ڕەخنە لەباوكو دایکییان بگرنو بە ڕێزەوە کاتێك دەبیستن باسی نهێنییەکانی ڕێکخراوە حیزبییەکان دەکەن .

٤- لەهەموو کونجێك دەبێ ڕۆڵەیەکی شۆڕش دابنێین (. . .) کە ئامۆژگاری لەناوەندە بەرپرسەکانی شۆڕش وەربگرێو بەززویی ئەم ئامۆژگارییانە جێ بەجێ بکات.

٥- فێری بکەن کە بەڕێزەوە ئیعتراز (اعتراض) بگرێ لە یەکێك لەخێزانەکەی کاتێك تێبینی دەکات کە زێدڕەوی دەکات لە سەرف کردنی ئەموالی دەوڵەت.

٦- پێویستە فێربن کە لەم قۆناغەدا متمانە نەکەن بە بێگانە چونکە بێگانە چاوی وولاتەکەیەتیو هەندێك ئامرازی ڕوخێنەری شۆڕشن. لەبەرئەمە ڕۆیشتن لەگەڵ بێگانەداو قسەکردن لەگەڵی بەبێ هەندێ یاسای ناسراو شتێکی جائز نییە.

٧- تۆوی ئاگاداری بچێنین لەناو گیانی منداڵدا کە نهێنییەکانی دەوڵەتو حیزب نەدات بە بێگانەو بە ڕێزەوە ئاگاداری بچووكو گەورە بکاتەوە کە لەبەردەم بێگانە قسە نەکەن بەبێ پاراستن (تحفظ) سەبارەت بە نهێنییەکانی دەوڵەت [١٠٧].

ئەمە بوو لەسەردەمی ئاشتیدا ئەرکی خوێندنگەو دەزگاکانی پەروەردە. لەروانگەی فەلسەفەی پەروەردەیی بەعسی ، پێویست بوو ئەمە بوایە ڕۆڵی خوێندکارانو مامۆستایان. لەساڵانی ئاشتی ناوخۆ، پێش جەنگ لەگەڵ ئێراندا، سەدام حوسەین بانگەشەی بۆپسپۆڕانی عەرەب لەبواری پەروەردەدا دەکرد کەکۆبوونەوە لەبەغدا لە٧-١٥ حوزیرانی ساڵی ١٩٧٥ و دەیگوت کە بەیەك گەیاندنی فەلسەفەو

رەفتار، مەرجێکی بنەرەتی "سەربازاندنی پەروەردەیە" (عسکرة التربیة) [١٠٨].
دەوڵەمەندکردنی منداڵو خوێندکار بەبەهاو فەلسەفەی بەعسی ، ڕێگە خۆش دەکات
بۆ تێگەشتنی ئامانجی "هەڵگرتنی چەك" لەخزمەتی فەلسەفەی پان عەرەبی
بەعسیو ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە سەرجەم هاووڵاتیان دەبێ بڕۆن بۆ ئەولای سنوری
عیراق لەپێناوی بەرگری کردن لەنیشتیمانی عەرەب [١٠٩]. دووساڵ پاش ئەم ووتارە،
بەعسو سەدام حوسەین تیۆروانینی خۆیان بەتەواوی خستە روو سەبارەت
بە"سەربازاندنی پەروەردە":

"(. . .) کاتێك پێویست دەکات، خوێندکار دەتوانێ بەچەکەوە بوەستێ لەژێر
خۆر شەوو ڕۆژ بەبێ ئەوەی بجولێتەوەو کاتێك داوای لێ دەکرێ بەرنگاری
دابەزینێکی(انزال) ئیمپریالی یان دژ بێتەوە لەناو ئەم ناوچە دژوارەدا ، ئەم داواکاریە
رادەپەرێنێ چونکە هەر لەمنداڵیەوە فێری کاری رێکخراەیی بووە(٠٠٠)، چونکە
ژیانی سەربازییو حیزبی بووە بەبەشێك لەژیانیو بەشێك لەپەروەردەی گشتی کاتێك
کەخوێندکارێکی بچوك بوە لەخوێندنگە" [١١٠].

لەحەفتاکاندا، بەپاڵ گۆرانو کردنی خوێندنگەکان بەگۆرەپانێکی ئایدیۆلۆژیو
گونجاندنی پرۆگرامی خوێندگەکان لەگەڵ دیدو تیۆروانینی نەسیۆنالیستو سەربازیی،
بواری پەروەردە فراوان بونەوەیەکی بێ پێشینەیی بەخۆیەوە ناسی. لەنێوان ١٩٦٨-
١٩٧٧ ژمارەی منداڵانی ساوا لەدایەنگەکان لە١٣,٤٦٢ ەوە گەیشتە ٥٦,٣٤٧ و
ئەوەی مامۆستایان لە٧٦٢ەوە گەیشە ٢,٦٠٣ مامۆستا. هەروەها ژمارەی منداڵانی
خوێندنگەی سەرەتایی لە١,٠٠٧٠٥٠ ەوە گەیشتە٥٦٦ ٢,٠٤٨ و ژمارەی
مامۆستایانی سەرەتایی لە٤٧,٠٥٨ ەوە گەیشتە ٠٧٨,٠٦٠. ژمارەی خوێندنگەی
ناوەندی و دواناوەندی لە ٩,٤٢٨ەوە گەیشتە ٢١,٢٥٦. ژمارەی خوێندنگە پیشەیەکان
لە٩,٧٥٣ ەوە گەیشتە ٣٥,١٨٨ وژمارەی مامۆستایان لە٢,١٩٣ەوە بۆ ٢,٣٣٣ لەساڵی
١٩٧٥ەوە هەتا ساڵی ١٩٧٧ ژمارەی خوێندکارانی خوێندنگەی ئامادەکردنی
مامۆستایانی سەرەتایی لە٨,٢٣٨ ەوە گەیشتە ١٧,٣٣٧و ئەوەی مامۆستایان لە

٤٠٥ ەوە بۆ٦٦٦ . لەساڵی ١٩٧٧ ژمارەی خوێندکارانی زانکۆ عیراقییەکان بریتی بوو لە ٨٥,٣٩٩و ژمارەی مامۆستایانی زانکۆ بریتی بوو لە٤٩٧ ,٤ مامۆستا [١١١].

ئەگەر چاوێك بخشێنین بەسەر ژمارەی دانیشوانی گشت عیراق لەساڵی ١٩٧٧، تێبینی دەکەین کەبریتی بوو لە ٠ ٠٢٩٠٠ ,١٢ دوانزە ملوێنو بست و نۆ هەزار[١١٢]. لەم ژمارەیەوە دەتوانین ئەوە هەڵنجێنین (استنتاج بکەین) کە٢٤,٢٪ ی عیراقیەکان پێکهاتبوو لەمنداڵانی کەمتر لەتەمەنی ٢٢ ساڵ. لەساڵی ١٩٨٤، ژمارەی خوێندکارانی خوێندنگەی سەرەتایی پێکهاتبوو لەدوملیۆنو ئەوانەی خوێندنگەی ناوەندیو دواناوەندیی ئەوانیش لەدوملیۆن و ئەوانەی زانکۆ لەیەك ملیۆنو ئەوانەی ناو خوێندنگەی ئامادەکردنی مامۆستایانو دەزگا پەروەردەییەکانی دیکە لەیەك ملیۆن [١١٣]، واتا زیاتر لەسەدا چل ٤٠٪ لەژمارەی گشتی دانیشتوانی عیراق. دەتوانرێ بوترێ کە لەکۆتایی هەشتاکاندا، نەوەیەکی تەواو لە گەنج کەتەمەنیان کەمتر بوو لە٢٦ ساڵ گەورە بوبوونو پەروەردە کرابون لەژێر سێبەری تۆتالیتاریزمی بەعسی. مامۆستای هەموو ئاستەکانو کادێری حیزبیو فەرمانبەری برۆکراسیەتی دەوڵەتو پزیشکی کەمتر لە٢٦ساڵ ، هەموویان گەورەبوون لەناو ئەو خوێندنگایانەی کە ئەرکیان بریتی بوو لەڕیشەکێش کردنی کەسایەتی تاکی عیراقیو بەمیکانیکی کردنی شێوەی بیر کردنەوەیو هەتا ئێسقان سیاسەتاندنی سایکۆلۆژیو گۆڕینی لاشعوریو بەرنگارکردنەوەی دژی هەموو کەسێك کە نەدەگونجا لەگەڵ پەیڕەوی تۆتالیتاری. ئەمانە هەموویان گەورە بوون لەناو سیستەمێکی پەروەردە کەدەیویست هاوولاتی بخاتە ناو بوتگەی باوەری بەعسیو لەسەر ئاستی رۆحی "پاکیان بکاتەوە" بۆئەوەی رێگەی فەزیلەی بەعسی بدۆزنەوە. هەمویان پەروەردە کران لەسەر پرینسیپی نەسیۆنالیستی "باووباپیرەیی" و زینۆفۆبی رۆشنبیری عەرەبی وەك میشێل عەفلەقو زکی الارسوزیو ساطع الحصری. هتد. هەمویان دووچاری هەوڵی تێکدانی (تشویە) ئایدۆلۆژی- سیاسی بونەوە بەتایبەتی لەجەنگی ئێران - عیراقەوە. لەساڵی ١٩٨٠ ەوە منداڵانو گەنجی عیراقی راهێنران لەسەر ناوەرۆکی شۆڤینیو رەگەزپەرستانەی ئەو

نامیلکەو کتێبانەی کەدەنوسران بۆیـــان: "هــەڵۆی عــەرەب"، "منــداڵو زرێپــۆش"، "سەرۆکی سەرکەوتن" ، "گۆرانی سەرکەوتن"، "گۆرانی بۆ جـەنگ"، ئەمانـە بـوون هەندێ لەناوی سەرگروشتەو چیرۆك بۆمنداڵان[١١٤].

"سێ شت کەنەدەبو یەزدان بیانهێنێتە دنیاوە: فـارسو جولەکـەو مێـش"، چونکـە "فـارس ئـاژەڵن لەسـەر شـێوەی مـرۆڤ" وجولەکـە "تێکـەڵێکن لـەزبلو پاشمــاوەی میللەتانی دیکەو " و مێشیش"مەخلوقی بێ واتانــە" "کـەس نـازانێ هـۆی هاتنـە دنیاوەی چیە"[١١٥]. ئەمە بوو ئاستی خیرواللە تفاح، زڕبـاوك‌و خـاڵو خـەزوری سـەدام حوسەین. لەسەر ئەم پرۆپدیتیکە هاووڵاتیانی عیراق پـەروەردەکران. ئـەوە نـەبێت کـە سیستەمی پەروەردەیی عیراق هـەر لەدامـەزراندنیـەوە، چوارچێوەیـەکی رێـك‌و پێکـی هەبوبێت. بەلاّ م دەبێ بوترێ کە بەتایبەتی لەسەردەمی حوکمی بەعســدا سیســتەمی پەروەردەیی عیراقی کرا بەبناغەیەك بۆ بەکۆیلە کردنی عەقڵی‌و رۆحـی‌و سـایکۆلۆژی منداڵو تێکشکانی یەکیەتی خێزانو پارچە پارچەکردنی نەسیجی(النسیج) پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئاسایی لــەنێوان ئـەندامانی کۆمــەڵی عــیراقی. لـەناو کۆمەڵگەیـەکی تەقلیدی وەك ئەوەی وڵاتی عیراقی، پەیوەندیە خێزانیــەکانو پـەیوەندی برادەرایـەتی‌و خۆشەویستی بۆدراوسێ‌و کەس‌و کار، یاساو فۆرمی پیرۆزی هەڵسوکەوتی پێکدەهێنــا. رێزی منـدڵ بۆ باوك‌و دایك‌و رێزی گەنج بــۆ خــەڵکی بەتەمــەنترو متمانـە بـەبرادەرو دراوسێ، دەردەکەوتن وەك بەها هەرە پارێزراوەکان. لـەو کاتـەی کـە ویسـتی منداڵـی خســتە جـێی دەســەڵاتی بـاوك‌و دایـك‌و خۆشەویســتی برادەرایـەتی خســتە جــێی خۆشەویستی بۆ حیزب‌و متمانە بە دراوسێی خستە جێی بێ متمانەیی‌و دوو ڕوویـی‌و ترس، تۆتالیتاریزمی بەعسی عیراقی گۆری‌و کردی بەکۆمــەڵی سیخوروجاسوسـیەت. تۆتالیتاریزمی بەعسی منداڵی دا بەگژی باوك‌و دایك‌و خوشك‌و براودراوســێ کـەس‌و کار، برادەری دا بەگژ بــرادەرو دراوســێ بــەگژ دراوســێ... هتــد. لەروانگــەی ســەدام حوســەین‌و نەسـیۆنالیزمی عەشـیرەگەری بەعسـیەوە، ئەمــە دژاو دژ نـەبوو لەگــەڵ سروشتی کۆمەڵگەی عیراقی. منداڵی خستە سەرووی دەسەڵاتی باوکەوەو بەرزی کردەوە

بۆسەر ئاستی مامۆستا لەناو خێزانداو فێری کرد کە"بەرێزەوە" بەرنگاری باوك‌و دایکی بێتەوەو شکاتیان لێ بکات کاتێك لەگەڵ بیروڕای حیزب نەدەبوون یاخود دژی حیزب دەبون، ئەمانە هەموو دژاو دژ نەبون لەگەڵ رێزگرتن بۆ باوك‌و دایك‌و پرنسیپی یەکیەتی خێزان چونکە: "نابێ یەکیەتی خێزان بوەستێەوە سەر بنچینەی تێروانینی دواکەوتن، بەڵکو دەبێ سەرچاوە بگرێ‌و پتەو بێ لەسەر بنچینەی گونجان لەگەڵ ئاراستەی ناوەندی سیاسەت‌و نەریی شۆرش لەپێناوی بنیادنانی کۆمەڵگەی نوێ. هەموو جارێك کەیەکیەتی خێزان دژاو دژ دەوەستێەوە لەگەڵ ئەم ئاراستەیە (٠٠٠) دەبێ ئەم دژاودژە چارەسەر بکرێ لەبەرژەوەندی ئارستەی نوێ"[١١٦].

چ وەڵامێك دەتوانرێ بدرێتەوە بۆ سیستەمێکی سیاسی کەیەکیەکی خێزان دەوەستێنێتەوە سەر ئاراستەو نۆرم‌ویاسای بەعسی، کەخێزان بێ بەش دەکات لەئازادی رەفتارو هەڵسوکەوتی رۆژانەو دوری دەخاتەوە لەسەربەخۆیی بۆ چارەسەرکردنی کێشە لەنێوان ئەنداماندا‌و مخالەفەی ئەو پرینسیپە گەردوونیە دەکات کەخێزان دادەنێ بەکیانێکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆ دوور لەهەموو دەستێوەردانێکی سیاسی‌و ئایدۆلۆژی . بەلای تۆتالیتاریزمی عەشیرەگەری بەعسی عیراقیەوە، خێزان کۆمەڵێکی سروشتی نییە کەسەرچاوە دەگرێ لەچەمکی ئازادی، بەڵکو کیانێکە کەدەبێ بوەستێتەوە سەر ئەو پەیوەندیە سیاسیانەی کەئەندامان ئاراستە دەکەن بەرەو ئامانجێك کە بە تەواوی بگونجێ لەگەڵ " نەریتی شۆرشگێرانە". رەفتارو هەڵسوکەوتی ئەندامانی خێزان دەبێ لەخزمەتی ئایدۆلۆژیای حیزبدا بن. پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان دەبێ رێك بخرێت لەسەر بنچینەی هەست‌و سۆزو "ئاراستەی نوێ" ی حیزبی بەعس‌و سەرۆکەکەی.

لەڕاستیدا، ئەگەر چاوێك بخشێنین بەسەر ناوەڕۆکی ئایدۆلۆژیاو هەڵسوکەوتی رژێمە تۆتالیتابیەکان، تێبینی دەکەین کەسیاسەتی بەعس سەبارەت بە"ئۆتۆمیزە" کردنی خێزان لەرێگەی "سۆزانی کردنی" prostitution کردنی سایکۆلۆژی لاوان‌و مندالان‌و نەهێشتنی متمانە لەنێوان ئەندامانی خێزاندا، هاوتەریبە لەگەڵ ئەوەی نەسیۆنال سۆشیالیزم. بالەنزیکەوە ئەم خوێندنەوەیە بکەین.

کاتێك کەبنیادنانەوەی نەریتو خولقـاندنی کۆمولگەیـەکی نوێـی هـان دەدا، نەسیۆنال سۆشیالیزمیش خێزانی ئەڵمانی کرد بەپێکەی توندوتیژی لەنێوان منداڵانو دایكو باوكو خوشكو برا. منداڵان کەدەسیاسەتێنران لـەناو خوێندنگـەو ڕێکخـراوی لاوان، هان دەدران بۆ کۆنترۆل کردنی ئەوەی کە لـەلای نازیـەت بریتـی بـوو لـەهێزی هەڵوەشاندنەوەی ئەخلاقی هەڵوێستی باوكو دایك. هیتلەر دەیگوت "ئـەوەندە گرنـگ نییە بەلامانەوە(. . .) کە لاوان بەشێوەیەکی کاتی بکەونـە ململانـێ لەگـەڵ بـاوكو دایکیان، بەمەرجێك لەڕێگەی هەڵوێستیانەوە یارمەتیمان بدەن هەیکەلی کۆمەڵگەی نوێ بنیاد بنێن بۆ چەند سەدەیەك"[١١٧]. ئۆپێرەسیۆنی" سینکرۆینیزە کردنی ڕۆحـی" ( spiritual synchronization )[١١٨] ئامانجەکـەی بریتـی بـــوو لەبـــەخێوکردنی ئایدیۆلۆژی نەوەی نوێو ڕاهێنانی لەسەر "یەك شێوەی بیرکردنەوە". هەر وەك گۆبلـز Goebbels لەساڵی ١٩٣٤ دەیگـوت" ئێمـە دەتوانـین بڵێـین، ئەوانـەی کـە لـەناو جیـهانێکی بیروبـاوەڕی جیـاواز لەئێمـە گـەورەبوون، ڕایـان دەهێنـین بەیـەك شـێوە لەبیرکردنەوە. تەنـها ئومێدمـان بـە نـەوەی داهـاتوە(چونکـە) کەراکتـەری کۆتـایی دەبەخشێ بە نەتەوەکەمان"[١١٩]. ئـەم بەرزخوازیـە، بـەلای نازیزمـەوە، بـەدی دەهات لەڕێگەی گواستنەوەی متمانەی منداڵ بەباوكو دایك بۆ متمانـە بـەحیزبو شۆڕشـی نازی. ئەو پەیوەندیە بەسۆزیەی کە منداڵ هەیبو بەباوكو دایکی پێویست بـوو ڕێگـە چۆڵ کات بۆ داخوازیەکانی خولوقیەتی نازی. لەبەر ئەم هۆیە، گۆڕینو کردنی منـداڵ بە ئەکتەرێکی کۆنترۆڵ کردن لەناو شانەی خێزانیدا دەبوایە خزمەتی پرینسیپی قوڵـی بیروباوەڕی نەسیۆنال سۆشیالیزمی بکردایە. بێ گومان، ئەنجامەکە نەیدەتوانی جیاواز بێ لەوەی ڕژێمی بەعس: شکات کردن لەباوكو دایكو برا لەپێناوی خزمـەت کـردنو هێشتنەوەی سیستەمی نازی. لەناو ڕژێمێکی وادا کە ئومێـدی بەتواندنـەوەی "منـی بچوك" هەبو لەناو " ئێمەی کۆ" دا[١٢٠]، شتێکی سروشتی بوو کە "کەنجی مـەزن" ی هیتلەری، هەروەك " گەنجی عەرەبێ سەدامی، ڕابهێنرێ "بەڕێزەوە" شـکات بکـات لەوانەی کە لەناو" جیهانێکی جیاواز لەبیروباوەڕ" گـەورەبوبون. برونـۆ بێتتێلـهایم

Bruno Bettelheim كــەخۆی شـایەتی زەبروزەنگــی نـازی بـوو بـەفراوانی شـێوازی نەسیۆنال سۆشیالیزم روون دەکاتەوە:

" منـدالآن، بەتایبـەتی ، لەخوێندنگـەو رێکخراوەکـانی لاوانـی هیتلـــەری(. . .) دەسیاسەتێنران‌و هان دەدران بۆ جاسوسیەت بەسەر باوك‌و دایکیانەوەو لەلای دەسەلآت شکاتیان لێ دەکردن "(١٢١). هەر وەك حالەتی عیراقی بەعسی، چەندین باوك‌و دایـــك‌و خوشك‌و برا هــەبون کـە فـرێ درابونـە بەندیخانــەوە بـەهۆی شـکاتی مندالآنیـان. " ژمارەیــەك لــەباوکی خـێزان خۆیـان دەدۆزنــەوە لەبەندیخانــەو ئۆردوگـای زۆرە ملـــێ، کەشکاتیان لێ کـراوە لەلایـەن کورەکانیانـەوە، لەبـەر ئـەوەی هەسـتی دژیـان هەیـە بەرامبەر دەولەتی نوێ، لەلایەن ئەو کورانــەی کـە(گـەنجی) بەپـەروش‌و لێنـەبوردون لەپێناوی مەسەلەی (نازی)" (١٢٢). شایستەی هێڵ بەژێر هێنانە کە لەناو پێکــاداندا لەگەڵ باوك‌و دایکیان، مندالآن هوشیار نەبون بەرامبەر ئەوەی "دڵسۆز بن بەرامبــەر باوك‌و دایکیان یاخود ئەرکی خۆیان راپەڕێنن بەرامبـــەر دەولـەتێك کـەفێری شـکات کردنی کردبون دژی خائنان "(١٢٣). ئەگەر لەناو خێزانێکدا، ئەندامانی نازی نەبونایـە یـان دژی نەسـیۆنال سۆسـیالیزم بونایـە، "منالـەکانیان نـارەزایی خۆیـان دەردەبـڕی بەرامبەر بیروباوەڕی باوك‌و دایکیان" یـاخود رەخنـەیان دەگـرت لـە "بـاوك‌و دایکـی خۆیان". ئەنجامی ئەم هەڵسوکەوتە بریتی بـــوو لــەوەی کـە بـاوك‌و دایـك وابەسـتەی ئــەوەبون" هــەوڵ بـدەن بـۆ شـاردنەوەی بـیروڕا راسـتەقینەکانیان" تەنانـەت لـــەناو مـالیش(١٢٤). بێ گومـان، بێ متمانــەیی بەرامبــەر منـدالآن، رەنگــی دەدایـەوە لــەناو پەیوەندی نێوان باوك‌و دایك‌و خزم‌و کەس‌وکارو بـــرادەر(١٢٥). هــەندێ جـار هـەبو کـە لەرێگەی مندالەوە پەیوەندی دروست دەبو لەنێوان ئەوخێزانانەی کە سەر بەرژێم بـون، بەلآم ئەم پەیوەندیە زۆری نەدەخایەندو منداڵ دەبو بەفاکتەری تێکچـون‌و توندوتیـژی. لەهەمان کاتدا، ئەو پەیوەندیانە تێك دەچون کەسەرچاوەیان نەدەگرت لەبەشداری بـون لەهەمان بەهای نازی. تێبینی دەکرا کە دایك‌و باوك دەســەلآتی تـەقلیدی خۆیـان وون

دەكرد لەسەر منداڵ چونكە رژێمی نازی ئازادی دەدانێ لەكۆنترۆل كردنیانو شكات كردن لێیان لەكاتی نەگونجانیان لەگەڵ یاساكانی رژێم[١٢٦].

ئەم هەڵسوكەوتەی هاوبەش لەگەڵ هەموو تۆتالیتاریزمێك لەراستیدا تەواوكەری چەوترینو خراپترین حیساباتی نەسیۆنال سۆشیالیزم بوو: ئەوەی پەیوەست بە خۆراك بەخشین بەهەستی جیاوازی ئەخلاقیو سایكۆلۆژی لەنێوان دوو نەوەدا بەشێوەیەكی سیسێماتیكو، ئەوەی پەیوەست بە هاندانی بەنزم تەماشاكردنی یەكتری لەپێناوی دەرخستنی گەورەییو مەزنی پەیامی ئایدۆلۆژی[١٢٧]. باوكو دایك دەیانتوانی چی بكەن؟ بێ گومان، لەتاو بێ دەسەلاتیو باری سیاكۆلۆژی دژوارو خەمو خەفەت، ناچار بون خۆیان بدەن بەدەستەوە. قەناعەتی سیاسیو ئەخلاقیو باوەڕ بەبەهای بەرز، نەیان دەتوانی بەرگری بكەن بەرامبەر زەبرو زەنگی رژێم. ئەوانەی كە دژ بەنازیزم بون، زۆربەی زۆریان وازیان هێنا لەخەبات كردنو تنازلیان كرد بۆ رژێم. بەبێ ئەوەی خۆیان بنوسن لەناو حیزبو بەبێ پەسەند كردنی بەهاكانی، دەستیان كرد بەكەڵك وەرگرتن لەرژێم. لەپێناوی ژیانێكی ئاسودە لەگەڵ خێزانیانو دراوسێدا(. . .)، لەپێناوی ئەوەی هەڕەشە نەكرێن لەلایەن پۆلیسی نهێنیەوە، وكاتێك كەسوودیان وەردەگرت لەو چاكەیەی كەرژێم دەی رەخساند بۆ ئەندامانی خۆی، لەم بارودۆخەدا، زۆربەی زۆریان سەرجەم بەهاكانی رژێمیان پەسەند كرد" [١٢٨].

شایستەی وەبیرهێنانەوەیە كە نەسیۆنال سۆشیالیزم لەسالآنی ١٩٣٠دا ئەزمونی خۆی تەواو كردو ئێستاش باوی نەماوە، بەلایەنی كەمەوە ئومێد دەكرێ بەهاكانی لەناو بچن. ئەو كۆمەڵگە تۆتالیتارەی كە دەیویست بنیادی بنێ وەك كۆشكی كارتۆن روخا. هەروەها بەعسی عیراقیش هەرەسی هێناو ئەو كۆمەڵگە تۆتالیتاریەی كەدەیویست بنیادی بنێ، ئەویش، وەك كۆشكی كاتۆن روخا. لەماوەی پتر لەچارەكە سەدەیەك، بەعس چوارچێوەی ئەخلاقیو سایكۆلۆژی تاكی عیراقی تێكو پێك شكاند. جگە لەوەی كەتائێستا باسمان لێوەكرد، شایەتی نوسەرێك باشتر هەڵسوكەوتی تۆتالیتاریزمی بەعسیمان تێ دەگەیەنێ: "باسی منالێكی یانزە سالیان كرد كە

لەخوێندنگە شتێکی ووتبو. پاش قسەکردن لەگەڵی، بۆ ماوەی دوو مانگ دایكو باوکی وون بوون(. . .). باوكو دایك کە بەعسی نەبون بەبەردەوامی لەبەردەم منالەکانیان خۆیان بەو کەسانە لەقەڵەم دەدا کە پشتگیری لەرژێم دەکەن یان هانیان دەدان کە لەناو رێکخراوەکانی لاوان خۆیان بنوسن. خۆ گونجان بەم شێوەیە لەگەڵ یاسادا ئەوەندە سەرنجی ئەمو ئەو راناکێشیو پتر زامنی ئاسودەیی دەکات بۆ منالان"[١٢٩]. نوسەرێکی دیکە دەڵێ کە لەساڵی ١٩٨١، واتا کەهێشتا رژێمی بەعسی نەگەیشتبوە ئەو درندەییە، زۆر لەعیراقیەکان کەتەمەنیان لەچل ساڵ زیاتر بوو دەیانگوت کەبەعسی نەبون، بەڵام زوو بەزوویی لەترسا دوپاتیان دەکردەوەکە "شانازی" دەکەن بەوەی کە کچو کوڕیان ئەندام یاخود لایەنگیری حیزب بوون[١٣٠].

گومانی تێدانییە، ئەمە هاوبەشی دەکات لەگەڵ جیهانبینی نۆرمەتیڤی ئایدۆلۆژیای بەعس کە منداڵان جیا دەکاتەوە لەخەڵکی کامڵ. منداڵان، هۆشیاریان نییە بەرامبەر خۆیان، منداڵان کەلەپوری حیزبینو دەکەوێتە سەرحیزب پەروەردەیان بکات پێش ئەوەی موڵکی باوكو دایکیان بن، موڵکی حیزبن. سەدام حوسەین دەیگوت کە منداڵو گەنج ئینتیمای کۆمەڵایەتی یان هی چینایەتیان نییەو رەهەندێکی دیاریکراوی سیاسیان نییە. لەبەر ئەم هۆیە حیزبو دەوڵەت دایكو باوکیانن[١٣١]. نەسیۆناڵ سۆشیالیزم چی دەگوت؟ گەنج مووڵکی هەموو میللەتە بەو واتایەی کەموڵکی حیزبە چونکە باوكو دایكو مامۆستا تەنها ئیدارەی پەروەردە دەکەن [١٣٢]. بۆ هەردوو ئایدۆلۆژیو رژێم ئەمە واتای ئەوە بوو کەئەوانەی ئاستەنگ دادەنێن لەبەردەم گەشە کردنی منداڵ، دەبێ تەحەمولی ئەنجامەکەی بکەن. ئەمە بوو کەوانەی نەسیۆنالیزمی تۆتالیتار لە مێژووی نوێ و هاوچەرخدا.

# پەراوێزەکان

١-بڕوانە

The 1968 Revolution in Iraq: Experience and Prospects , The Political Peport of the Eighth Congress of the Arab Bath Socialist Party , January , 1974 , Itacha
Press, London, 1979.

٢-لە رۆمانی کۆندا حەرەسی پریتۆری ئەو سەربازانە بوون کە ئیمپراتۆریان دەپاراست . لە سەدەی سێهەمدا حەرەسی پریتۆری توانیان کودەتایەك رێك بخەن دژی ئەوەی کە دەیان پاراست و یەکێك دابنێن لە جیاتی .

مەبەست لە تیۆرانینی پریتۆری، رێکخستنی کودەتایە لە ناو دەوڵەتدا . بروانە :

. Maurice Duverger, De la dictature, R. Julliard, Paris, 1961, p.ll.

3- Shafik al- Samarraie, Le parti bath arabe socialist et son role politique depuis sa creation a nos jours (these de Doctorat), Faculte de . -droit et des sciences economiques, Universite de Nice, 1976 ,pp. 73-78.

4- Christine Moss Helms, Iraq Eastern Flank of the Arab world, The Brookings Institution ,Washington ,D.c,1984 ,p.85.

5- Ibid . ,p.88.

6- Ibid. ,pp.86-87

٧- حسن العلوي ، العراق دولة المنظمة السرية ،١٩٩٠ ل ١٨ .

8- Kamel, S.Abu jaber, The Arab Bath socialist Party, History andOrganization , Syracuse University Press,1966 , p.141.

٩- بەلای حەننا بەتاتوەوە رێکخراوی حیزبی بەعس دوو جۆر لە ئەندامی دەگرتەخۆی :"ئەندامی ئەکتیڤ " "پالێوراو".

پالێوراو پاش شەش مانگ دەیتوانی ببێ بە ئەندام .بڕوانە :

Hanna Batatu ,The Old Social Classes and the Revolutionary Movement of Iraq :op.cit. , pp.742-745.

10- Ibid. P.816

11- Ibid. p 1078.

12- Samir al-Khalil, op. cit. PP.71-72.

13- Christine Moss Helms,op. cit .P.87.

١٤- الثورة و النظرة الجديدة، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١، ل ١٤٠.

١٥- سەدام حوسەین لە:

Efraim Karsh and Inari Rauts:
Saddam Husayn ,A political Biography,Bpcc
Wheaton ,London ,1990,p.177.

16- The 1968 Revolution in Iraq,op .cit .,p.111.

17- Maurice Duverger ,Les Partis Politiques ,Librairie Armand Colin (2e edition),Paris ,1976,p.44.

18- Hannah Arendt ,Le systeme totalitaire, les Origines du totalitarisme,Ed. Du Senil ,p.92.

19- Maurice Duverger ,Ibid .,p.45.

٢٠-ئەم زانیارانە وەرگیراون لە :

Jean Sigman ,Qu'est-ce qu'un nazi ?, Etude de la division de l'Education publique (sans date ),pp.23-28,p.46.

21- Hannah Arendt ,op.cit.,p.242.

22- I bid .,p.50, p.93.

23- J.Friedrich and Zhigniew K. Brzezinski ,Totalitarian Dictatorship and Autocracy ,Friedrich , A. Praeger Publishers , New York , Washington , London , 1965 , p.57 .

24- Henri Bergelin , Qui etait nazi , in , Les annees trente , De la. crise a la guerre , Ed.du Seueil , 1990 , p.21

25- I bid . , p.21

26- Hannah Arendt , op.cit ., p.49.

27- Ibid ., p63.

28- Jean Sigmann , op.cit.,p.34.

بۆ زیاتر لە زانیاری لەسەر پۆلیسی نهێنی نەسیۆنال سۆسیالیزم و کەسایەتیەکانی گێستاپۆ ، بڕوانە :

Louis Saurel , La Gestapo , Ed . Rouff, Paris, 1967.

هەروەها:

Heinz Hohne , Lordre noir , histoire de la S.S., Casterman , 1968 , p.19

29- Hannah Areudt , op.cit., p.269.

هەروەك Heinz Hohne دەڵێ ، مێژوی یەکەکانی S.S. لە بەهاری ١٩١٩ دەستی پێکرد لەکاتی بارو دۆخە ناخۆشەکەی پاش جەنگی جیهانی یەکەم و تێکەڵ بوو بە ئەزمونی بزوتنەوەی نەسیۆنال سۆسیالیزم ، بڕوانە :

Heinz Hohne , Ibid . p.19.

30- Pierre Aycobery , La question nazie , les interpretation du national-socialisme, Ed.du seuil , p.274.

31- Francois Bayle , philosophie et ethiqne du national-socialisme , Etude anthropologique des dirigeants S.S. ( These de doctorat ) , PUF , Paris , 1952,p.379.

32- Carl J.Friedrich , op.cit., p.178.

بڕوانە هەروەها :

Pierre Angel , Hitler et les Allemands , Editions sociales , Paris , 1982 , pp.337-340.

٣٣- ئەم زانیاریانە لەم لێکۆڵینەوانەی خوارەوە وەرگیراون :

Samir al-khahil , op . cit., pp.40-45، Judith Miller and Laure Mylroie , Saddam Husayn and the Crises in the Gulf , Random House , Inc., New York , 1990 , pp.48-49 ،Richard F.Nyrop, Iraq , A country Study , Washington , D.C., 1979 , pp.249-250، Efraim Karsch , op. cit., pp.180-181 ، Pierre Salinger et Eric Laurent , Guerre du Golfe , le dossier secret , Olivier Orban , 1991 , p.25.

34- Paul Battata, Iran Irak, une guerre de 5000 ans, Editions Anthropos, Paris, 1987, p.73.

35- Ibid.,p.73

٣٦- حسن العلوى ،العراق دولة المنظمة السرية ، ١٩٩٠ ، ل٤٢ .

37- Morroe Berger, Les regimes du militaires du Moyen orient, in Orient, 3e trimestre, M. 15, p. 23, ١٩٦٠.

38- Ibid.,p.24.

٣٩ –بڕوانه:

ڕاپۆرتی کۆنگرەی شەشەمی حیزبی بەعس عەرەبی سۆسیالسیت لەناوکتێبەکەی:

Kamel S.Aba Jaber, The Arab Bath Socialist Party, History and Organization, Syracuse University Press, 1966,P.162.

40- Richard R.Nyrop, Iraq, A Country Study,Washington, D.C., 1979, 252.

بۆزانیاری لەسەر ڕۆڵی سەدام حوسەین لەناو" ناسەربازاندنی" دەسەلاتی بەعس، بڕوانە:

Amazia Baram, The Ruling Political Elite in Bathi Iraq, 1968- 1986, The Changing Features of a Collective Profile, in, International Journal of Middle- East studies, vol. 2, Fosc. IV, 1989, pp.447-493.

41- The 1968 Revolution in Iraq, Experience and Prospects, The Political Report of the Eighth Congress of the Arab Bath Socialist Party, 1974, Itacha Press, London ، 1979 ،PP.103-105.

42- Ibid., P105.

43- Richard R. Nyrop, op. cit., P. 238.

44- Samir al- Khalil, La machine infernale, politique de l'Iraq moderne, Ed. Jean-Claude Lattes, 1991, P.99.

45- Le monde, 3/8/1990, n. 14157.

46- Richard R.Nyrop, Ibid., P.242.

47- Ibid P.239, PP.242- 243.

48- The 1968 Revolution in Iraq, Experience and Prospects, op.cit.,p.175

Anthony H. Cordesman, Iraq and the Conventional Military Balance, 28 June 2002.

49- Rechard R. Nyrop, Iraq, A Couutry Study ،op.cit.,248,

بڕوانە:

The Guardian, November, 2002 .

50- Ibid .,249.

51- I bid. , p.248.

52- I bid. , p.248.

بۆ زیاتر لە زانیاری فراوان، بڕوانە:

International Institute for Stratetegic Studies, The Military Balance, 1987-1988, London, p. 100. International Peace Research Institute, World Armament and Disarmament, SIPRI, Oxford University, 1987, pp. 250-253.International Herald Tribune, November 18, 2002. International Herald Tribune, March 26, 2003.

53- Pierre Angel, Hitter et les Allemands, Editions Sociales, Paris, 1982, p.321,p.337.

54- Recueil des actes du Grand Conseil Fasciste, in, Alberto Acquarone, Organizazione dello stato totalitario, Studi e documeuti del tempo fascista, Giuliono Einaudi editore, Torino, 1965,p.20.

55- Francesco Luigi Ferrari, Il regime fascista Italiano, Edizioni di storia e letteratura, Roma, 1983,p.218.

56- I bid.,pp.219-220.

57- Pierre Milza et Serge Berstein, Le fascisme italien, 1919-1945, Editions du Seuil, Paris, 1980,p.197.

بۆ زانیاری زیاتر لەسەر میلیشیای ئیتالی و پەرەسەندنی، بڕوانە:

Alberto Acquarone,op.cit.,pp.15-24

Alberto Acquarone, La Milizia

هەروەها:

Volontaria nello stuto fascista, in, La Cultura, II,n.3, 1964, pp.259-271, n.4,1 964, pp.360-374.

* بۆ زیاتر لە زانیاری سەبارەت بەم ڕێکخراوانەو پەرەسەندنیان لەم ساڵانەی دواییدا، بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

Helen Chapin Metz, A Country Study, Federal Research Division, Library of Congress,1988.Sarah Graham-Brown, Sanctioning Saddam: The Politis Intervention in Iraq, London and New York: IB Taurus, 1999. Human Rights Watch, Forced Expulsion, Sept. 2002

٥٨-میشل عفلق، الجيل العربى الجديد، في سبيل البعث، دار الحرية للطباعه، الطبعه الرابعة عشر، ١٩٧٥، ل١٥٠-١٥٧.

٥٩-ئەم زانیاریانە لەم سەرچاوانەی خوارەوە کۆکراونەتەوە:

Charles Saint –Prost, Saddam Husayn,un gaullisme Arabe? Edition Albins Michel, Paris 1987- p.89. Christine Moss Helms, Iraq Eastern flank of the Arab world, Washington, D.c., 1984, pp.96-98.
Samir al-khalil, La machine infernale, Politique de l'Irak moderane, ed. Jean-Claude Latte's, 1991,p.249.

60- Charles Saint Prost, Ibid.,p.87.

61- The 1968 Revoliton,op.cit., p.p117-118.

62- Ibid.,118.

63- Ibid.,p.174.

٦٤- بڕوانە صدام حسين، الثورة والنظرة الجديدة، دار الحرية للطباعه، بغداد، ١٩٧٨، ل ١٣٧.

٦٥- هـ. س، ل ١٣٨.

٦٦-هـ. س، ل ١٣٩.

٦٧- هـ. س، ل ١٣٩.

٦٨- هـ. س، ل ١٤٠و١٤١.

٦٩- هـ. س، ل ١٤٥.

70- Jean Sigman,Qu'est-ce qu'un nazie? op.cit.,p.38.

71- Carl J.Friedrch and Zbigniew K.Brzezinski, Totalilarian Dictatorship and Autocracy,New York,1966,p.61.

72- Adolf Hiller, Mein Kampf , Nouvelles Editions lalines, Paris, P.401.

73- Ibid.,p.404.

74- Bernard Otto, Le Livre Pour la jeunesse et le troisieme Reich, in, Nazisme et les jeunes, actes du Collque Franco – Allemands, 18-19 November, 1983, Prresse Universitaire de Nancy, p.p39-40.

: بڕوانە هەروەها:

Jean Sigman,op.cit.,p.58.

٧٥- بۆ زانیاری زیاتر لەزانیاری، بڕوانە:

Henri Bergeling ,Qui etait Nazi?op.cit.,p.19.

Martin Brozat,L'etat Hitlerien, L'origine et l'evolution des structures du troisieme Reich, Fayard, Paris, 1985, p.395. Carl J.Friedrich and zbigniew K.Brzezinski, op.cit., p.62.

76- Henri Berr, Le mal de la jeunesse allemande, Problemes d'avenir, Ed. Albin Michel, Paris, 1946,p. 23.

77- Baldur Von Schirach, in, Henri Berr,Ibid, p,34.

78- Carl J. Friedirch, op.cit., p.396.

٧٩- بڕوانە هەردوو سەرچاوە:

Pierre Milza et Serge Berstein, Le fascisme italien 1919-1945, Editions du Seuil,Paris, 1980,p.203,p.212.

Carl J. Friedricl,Ibid.,p.62.

)80- Alberto Acquarone,L'organizzazione dello stato totalitario, op.cit., pp. 61-62.

81- Louis Cavare،

La notion d'etat dans le regime hitleien, Travaux Juridiques de l'Universite de Rennes, Tome XIV, Librairie Plihon,Rennes, 1935,p.30.

82- Gelmer W. Blackburn, Education in the Third Reich, Race and Hitistory in Nazi Textbooks, State University of NewYork Press, NewYork, 1985,p.97.

٨٣- بڕوانە هـ. س، ل٢.

84- Edmond Vermeil, Hitler et le christianisme, Gallimard, Paris, 1939, p.66.

85- Claudia Koontz, Les meres–Patrie du lllem reich, Les femmes et le nazisme, Lieu commun, 1986, p.478.

86- Gilmer W.Blackburn, op.cit., p.95.

٨٧- بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە:

Hitler, Mein Kampf, op. cit., pp.24-25, p.413-427

88- Benito Mussolini, La doctrine du fascisme, Wallecchi Editore, Firenze, 1935, p.15,p.18.

89- Ibid., p.69.

90- Pierre Milza et Serge Berstein, Le fascisme italien ،op.cit., p.207.

91- Ibid.,p.205.

92- Carl J.Friedrich, op.cit.,p.157.

٩٣- ئەگنۆستیك agnostic ئەو کەسەیە کەتەنها باوەڕی هەیە بەوەی کە ناتوانرێ هیچ شـــتێك بزانرێ سەبارەت بەیەزدان. سەرچاوەی زانین بریتیە تەنها لەشتی مـــادیو هـەموو شـتێك لەرێگـەی تەجریبەوە دەناسرێ. بەشێوەیەکی گشتی ئەگنۆستیك ئەو کەسەیەکە بیرو رای نییە سەبارەت بەئایین.

94- Ibid., p. 158.

95- The 1968 Revolution, Experience and Prospects, op. cit., p.113, p.171.

96- Ibid., p. 170.

97- Ibid., p. 171.

٩٨- صدام حسين، الموازنة بين الحقوق و الواجبـات، الثـورة والنـظرة الجديـدة، دار الحريـة للطباعـة، بغداد، ١٩٨٧، ل٥٢.

٩٩- صدام حسين، الديمقراطية مصـدر قوة الفـرد والمجتمـع، الثـورة و النظـرة الجديـدة، ه ـ س. ، ل ٢٣ـ ٢٤.

١٠٠- هـ ـ س. ل ٢٥.

١٠١- ل، ٣٢

١٠٢- ل، ٢٥

١٠٣- ل، ٢٨

١٠٤- ل ، ٢٤

١٠٥- ل٢٨.

١٠٦- ل.٢٩ـ ٣٠

١٠٧- ل٣١ـ ٣٢

١٠٨- صدام حسين، حول أفاق التربية واستراتيجيتها، الثورة والنظرة الجديد، ه ـ س، ل٩٣.

١٠٩- هـ ـ س، ل ٩٣ـ ٩٤

١١٠- سەدام حوسەین، هـ ـ س.، ل ٢٧ـ٢٨

١١١- ئەم زانیاریانە وەرگیراون لە:

Statitical Pocket Book, 1977, Republic of Iraq, Ministry of Planning, Publication and Pulic Relations Department, Baghdad, 1977, table, n. 27, 28 49, 50, 52, pp. 46- 50.

بۆ زیاتر لەزانیاری بڕوانە:

Annual Abstract of Statistics ،Republic of Iraq, Ministry of Planning, Central Statistical Organization, Publication and Public Relations Department, 1977, pp. 205- 208, pp. 341- 366 .

١١٢- هـ - س، ل١٣

١١٣- ئەم زانیاریانە وەرگیراون لە:

HeLms. Iraq Eastern Flank of the Arab World . Christine Moss .washington .D.C., 1984, P.87

114- zubaier, Dhaoudi, petrole, guerre et culture, in, Irak et la guerre, Peuples .mediterraneens, n.40, 1987, pp.82-83

115- Samir al-khalil, La machine infernal, politique de l'Irak moderne, Editions Jean-Claude Lattes , 1991,p.45

١١٦- سەدام حوسەین، هـ. س. ل٢٨ .

117- Edmond Vermeil, Hitler et le christianisme, op. cit., p.66

118- Edmond Vermeil , Doctrinaires de le revolution allemande (1918-1938)، .Fernand Sarlot, Paris, 1939, p.238

119- Henri Berr, Le mal de la jeunesse allemande, Editions Albin Michel, Paris ، 1946 ،P. 25

120- Claudia Koontz, op. cit. p. 252

121- Bruno Bettelheim, Survivre, collection pluriel, Editions Robert Laffont, Paris, 1979, P398.

122- Henri Berr, Le mal de la jeunesse allemande ،op. cit., P. 38

بۆ زیاتر لە زانیاری، بڕوانە هەروەها:

Claudia Koontz, Les meres patries du troisieme Reich, op. cit., P. 48.

123- Ibid. p.398

124- Ibid. p.399

125- Ibid. p. 399

126- Ibid.p. 404

127- Henri Berr, Le mal de al jeunesse allemande, op. cit., P. 48.

128- Bruno Bettelheim, Survivre, op. cit., P. 402.

129- Samir al-khalil, op. cit., P. 119.

130- Christine Mosse Helms, op. cit., P. 96.

١٣١- صدام حسين، الشباب الصحيح طريق الثورة الصحيحة، ه. س. ل. ١٤٩.

132- Edmond Vermeil, Hitter et le christianisme, op. cit., P.65 .

# بەشی سێهەم
# ئایدیۆلۆژیای بەعسی

**بەعس چییە؟**

ئەگەر بمانەوێ بەشێوەیەکی سکێماتێك پێناسەی بەعس بکەین، دەتوانین بڵێـــین کـە بەعس پێك هاتوە لەسیستێمێك لەبیرو باوەڕ کە لەسەر بنچینەی ئەم تێمەی(بابەتەی) خوارەوە خۆی ڕێك دەخات: بەرزڕاگرتن‌و پیرۆزاندنی هەستی ناسیۆنالیزم کـــەبۆ بـەعس دەژمێردرێ بەبەرزترین بەهای پەیڕەوی سیاسـی. لـەم هەڵوێسـتەوە بـەعس بانگەشـە دەکات بۆ کیلیازمێکی* شۆڕشگێرانە کەئامانجەکەی بریتیە لەدروستکردنی جۆرێکـی نوێ لەئادەمیزادو بنیادنانی پەیڕەوێکی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی نوێ، یاخود وەك سـەدام حوسەین دەڵێ بەعس ئەوەیە کەدەیـــەوێت " کۆمــەڵ‌و دەوڵـەتێکی بەعسـی دروسـت بکـات"[1]. لەسـەر بناغـەی ئـەم ئیدێیالـە بـەعس دوو قـەوارەی سیاسـی پێکـەوە کۆدەکاتەوە: ناسیۆنالیزم‌و سۆشیالیزم. بەواتایـەکی دیکـە، دەتوانـین بڵێـین کەئەگـەر ناسیۆنالیزمی بەعسی سۆسیالیستە (القومية الاشتراكية)و بیری "میللەتی پرۆلیتار" دەردەبڕێ، سۆشیالیزمەکەشـی ناسیۆنالیسـتە (الاشـتراكية القوميـة)، واتـا دەیـەوێ کەدەوڵەت دەسەڵاتی مەرکەزی هەبێت بۆ خزمەت کردنی یەکێتی ناسیۆنال. لەم جـۆرە هەڵوێستەوە بەعس تیشك دەخاتە سـەر پـان عەرەبیـەت‌و داوای شۆڕشـگێڕی دەکـات

---

* لەتیۆلۆژیدا ئەو عەقیدەیە دەگرێتەوە کە باس لەگەڕانەوەی عیسا دەکات بۆ سەر زەوی لەهەزارساڵی داهاتوودا. لەتیۆری سیاسیدا واتای گەڕانەوە بۆ دواوە دەگرێتەوە

لەجەماوەر بۆ بەدیهێنانی "پەیامی نەمر" (الرسالة الخالدة) کەپێکهاتوە لەم سێ کوچکەیەی خوارەوە:

یەکێتی، ئازادی، سۆشیالیزم (وحدة،حریة، اشتراکیة). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەبەعس خەبات دەکات بۆ یەکگرتنەوەی نیشتمانی عەرەب لەژێر دەسەلاتی دەولەتێك کە لەلایەن پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستەوە ببرێت بەرێوە.

## سێ کۆچکەی بەعس

١-یەکێتی (الوحدة): یەکەم ئامانجی بەعس بریتیە لەمەسەلەی یەکێتی. بەلام بۆ ئەوەی بەرِوونی قەوارەی ئیدیالی بەعس سەبارەت بەیەکێتی تێبگەین ، پێویستە پێش هەموو شتێك دوو خالّ بخەینە بەر چاو: یەکەمیان دەبێ بزانین کەبەشێوەیەکی سەرەکی تیۆریزەکردنی مەسەلەی یەکێتی(هەروەك دوو ماکەکەی تری سێ کۆچکەی بەعسی: ئازادی سۆسیالیزم) کاری دامەزرێنەری پارتی بەعس، میشێل عەفلەقە. لەبەر ئەم هۆیە، پێوسیتە پێش هەموو شتێك بیروباوەرِو جیهانبینی میشێل عەفلەق بەشێوەیەکی سیستێماتیكو دوورودرێژ شیبکەینەوە. دوەمیان ئەوەیە کە ناتوانین بە تەواوی پرۆژەی سیاسی بەعس سەبارەت بەیەکێتی تێ بگەین ئەگەر پەنجە بۆ پرینسیپو بنچینە فەلسەفیەکانی ئەم پرۆژەیە رانەکێشین. بەم بۆنەیەوە پێویستە بوترێ کەزۆر لەنوسەران ئەم لایەنەیان پشت گوێ خستوەو تەنها باسی یەکێتیان کردوە لەروانگەی سیاسیەوە، واتا لەروانگەی خەباتی بەعس بۆ سەربەخۆیی و بنیادنانی سیاسیی نیشتمانی عەرەب . ئەم شیکردنەوە ساکارو یەکلایەنیە یارمەتی ئەوەی نەداوە کەتائێستا بەتەواوی لە " جەوهەرو سروشتی" بەعس تیبگەین.

لەپێشدا دەمانەوێ هەلوێستی بەعس روون بکەینەوە سەبارەت بەیەکێتی لەسەر بنچینەی بیری میشێل عەفلەق.

لەروانگەی عەفلەقەوە یەکێتی عەرەب پێش هەموو شتێك دەبێ یەکێتی رۆحی بێت. عەفلەق دەلێ هەر لەو کاتەی یەکێتی خۆی وون کردووە، گەلی عەرەب نەیتوانیوە

پەیامە نەمرەکەی (الرسالة الخالدة) جێ بەجێ بکات. جگە لەوەش، بۆچەند سەدەیەك کە لەنێوان چەند کیانێکی دەوڵەتیی بچوك بچوکدا دابەش بووە، میللەتی عەرەب زۆر لەبەهرەو توانای دروستکەری خۆی وون کردوە[٢]. ئەنجامی ئەم دابەش بوونە وای لێکردوە ئەو تەوژمو چالاکییەی کەهەیبوە لەمێژووی دوورو درێژیدا، وورده وورده کاڵ ببنەوەو رۆحی بەرەو هەرەسهێنان و ڕوخاندن بڕوات. هەروەها، هەرچەندە عەرەب هەست دەکەن کەجاران یەك میللەت بونو لەژێر فەرمانڕەوایی یەك دەوڵەت ژیاونو ئێستاش بەیەك زمان دەدوێنو یەك خوو ڕەوشتیان هەیە (ئەمانە چەند فاکتەرێکی پۆزەتیڤو دروستکەرو پتەوکردنی هەستن)[٣]، بەلام ئێستا ناتوانن لەچەند فاکتەرێکی نێگەتیڤ رزگار بن. ئەم فاکتەرە نێگەتیڤانەش پێکهاتوون لەخۆپەرستنو سەپاندنی بەرژەوەندی خۆیی بەسەر بەرژەوەندیە پێشوییەکانی میللەتدا. عەفلەق دەڵێ هەر ئەم فاکتەرانە بوون کەنەیان هێشتوە عەرەب یەکتری بگرنو هەر لەبەر ئەوەشە کەعەرەب پێش ئەوەی لەسەر ئاستی سیاسی یەکتری بگرن پێویستە یەکێتی رۆحی دروست بکەن. ئەم یەکێتییە بە چ شێوەیەك دێتە دی؟ عەفلەق دەڵێ، ناتوانین باسی یەکێتی سیاسی بکەین بەبێ ئەوەی بتوانین لەسەر ئاستی رۆحی یەك بگرین. ئەمرۆ پێوستە لەسەر ئاستی رۆحی یەك بگرین (کە بنچینەی بوونی میللەتە) بۆ ئەوەی بگەینە یەکێتی ناسیۆنالو سیاسی[٤]. بەم شێوەیە، یەکێتی دەبێ بەشێوەیەکی زۆرەکیو پێش هەموو شتێك یەکێتییەکی رۆحی بێت، چونکە تەنها ئەم جۆرە یەکێتیەیە کەدەتوانێ لاوازیی میللەت بگۆڕێو بیکات بەهێزێکی گەورەو عەرەب بژێنێتەوە.

یەکێتی عەرەب ناتوانێ بەڕاستی بێتە دیو بەرگری لەناڕەوایی بکات ئەگەر لەدایك بونەوەیەکی رۆحی لەناو کۆمەڵگای عەرەب ڕوونەدات بۆئەوەی بتوانێ دیسانەوە میللەت دروست بکاتەوەو لاوازیەکانی بگۆڕێو بیکات بە ووزەیەکی پاڵپێوەنەر[٥]. کەواتە خەبات کردن بۆ یەکێتی، نابێ ساکارانە بێتو تەنها لەقەوارەیەکی سیاسی دا خۆی بگرێتەوەو ئامانجەکەی تەنها لابردنی سنوربێت بەشێوەیەکی ڕوکەش[٦]. ڕاستە

ئەمە خۆی لەخۆیدا ئامانجێکی بەرز و ستراتیژییە، بەلاّم پێش هەمووشتێك دەبێ بەشوێن "پرۆسەیەکی ژیاو" دا بگەڕێین بەشێوەیەك کە ئەم پرۆسەیە بتوانێ "دەوڵەمەندیی چالاکییەکی شاراوە" بخاتە ڕوو کەپێکهاتوە لەڕۆح. ڕۆح خۆی لەخۆیدا هێزێکی مێژوویی‌و شۆڕشگێڕانەی بێ هاوتایە[٧]. بەلای عەفلەقەوە، ڕۆح هەموو توانا پۆزیتیڤەکان لەخۆیا کۆدەکاتەوەو ڕێگا پاك دەکاتەوە بۆ ئەو ناسیۆنالیزمەی کەلەبنەمای مێژووەوە شان بەشانی عەرەب ڕۆیشتوەو گوزارشتێکی ڕاستەوخۆی لەویست‌و خواست‌و پێداویستەکانی میللەتی عەرەب کردوە. لەم ڕوانگەیەوە، یەکێتی عەرەب دەبێ کۆیەکی جۆریی بێنێتە کایەوە کەتوانای ئەوەی هەبێت جەوهەری ڕۆحیی بەدیبهێنێت. یەکێتی، بەتەنها، هیچ واتایەك نابەخشێ‌و تەنها گوزارشت لە" کۆیەکی ساکاری مەتماتیکی یان لەکۆیەکی ژمارەیی دەکات" واتا لەسەرخستنەسەریەکی چەند شتێکی بێ جووڵەو پچڕاو لە "خواست‌و ویستی ڕۆحیی" کەپێویستن بۆ ژیاننەوەی میللەتی عەرەب.

عەفلەق دەڵێ پیاوە سیاسیەکان وادەزانن یەکێتی پێکهاتوە لەکۆیەکی ساکاری مەتماتیکی یان لەکۆیەکی ژمارەیی(. . .) بەلاّم شتی بێ جووڵە ناتوانێ ژیان دروست بکات(. . .) لەبەر ئەوە ئەم کۆمەڵە پێوستی بەژیاننەوەیەکی ڕۆحی هەیە. لەسەر ئەم ئاستە ئۆپێرەسیۆنی ڕێکخراوەیی شتێکی بەکەڵکو پێویستە(. . .).

لەجیهانێکی دواکەوتوو لاوازدا یەکێتی دروست نابێ. هیچ یەکێتیەك لەنێوان دوو بەشدا دروست نابێ ئەگەر تۆوی خواستوویستی ڕۆحیی تێدا پەرەی نەسەندبێ، پێویستە ئەم شتانە پێکەوە بەیەکەوە ببەسترێنەوە بۆ خزمەتی ئامانجێکی گشتی زۆر بەرزتر لەخۆپەرستنی کەسیی(شەخسی)[٨]. باشە، چۆن دەتوانرێ دیسانەوە ئەندامانی میللەت ببەسترێنەوە بە کۆی نەتەوایەتی‌و کامانەن ئەو ئامرازانەی کەکاری ئەنجامدانی یەکێتی نەتەوەی عەرەب ئاسان دەکەن؟

وەلاّمی ئەم پرسیارە لەناو دروشمی پارتی بەعسدا خۆی دەدۆزێتەوەو، بە گوێرەی دیدی بەعسی، ئەوەی کە پێویستە عەرەب باوەڕی پێ بکات، بریتیە لە دروشمی:

"تەنهایەك نەتەوەی عەرەب، خاوەنی پەیامێکی هەتاهەتایی" (امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة). پێش ئەوەی عەرەب بیر لەئامرازە گرنگەکان بکەنەوە بۆ ئەنجامدانی ئەم دروشمەو کاری بۆبکەن، پێویستە تێبگەن کە ئەم دروشمە خواستو ویستی ئایدیۆلۆژیای بەعسی دەخاتەڕوو کە لەهەمان کاتدا بۆ یەکێتی ڕۆحیو سیاسی نەتەوەی عەرەب خەبات دەکات. نابێ ئەوە لەبیر بچێتەوە کە ئەم "پەیامە نەمرە" نابێ ملکەچی حوکمو دەمەتەقێی ئەمو ئەوبێت. نابێ ئەمو ئەو دەمەتەقێ لەسەر ڕاستیی یان ناڕاستیی یان توانای ئەنجامدان یاخود ئەنجامنەدانی بکەن" ئەم پەیامە دەبێ گوزارشت لەباوەڕێك بکات کە لەجەوهەریدا لەسەرووی هەموو " زانینێکی ڕاستەوخۆیە". عەفلەق دەڵێ: "پەیامی عەرەب پێش هەموو شتێك پێکهاتوە لەباوەڕ، باوەڕ لەسەرووی هەموو زانینێکی ئاشکرایە"(. . .). لەبەر ئەم هۆیە، باوەڕ ئەکسیۆماتیکە( ڕاستیەکی ڕەهای ڕوونە) [٩] (. . .) کە دەچێتە ناودڵەوەو زاڵ دەبێ بەسەر توانای عەقلدا"[١٠]. ناوەڕۆکی ئەم "پەیامە نەمرە" چیە ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لە ووتارێکی عەفلەقدا دەدۆزرێتەوە کە لەساڵی١٩٤٦ بەناوی" الرسالة العربية الخالدة" بڵاو کراوەتەوە: "ئەم نەتەوەیە کە ئەمڕۆ هەڵدەسێتەوەو خۆی بۆ ڕابون ئامادە دەکات، نەوەی ئەمڕۆ نییە، بەڵکو هەمان ئەو نەتەوەیەیە کە بەر لە هەزار ساڵ بوونی هەبووە. خەسڵەتەکەی بریتیە لەیەکێتی ڕەچەڵەكو ڕەگەز لەرۆژێگارێکدا کەیەکێتی ئەو یەکگرتنە پەنهانە بوو کەتاکەکانی کۆدەکردەوەو یەك مۆرکی پێ دەبەخشینو یەك هەوێنی تیا دەچاندن. دواتریش یەکێتی زمانو ڕۆحو مێژو و کولتور بەهێزی کردنو خۆراکی پێ بەخشین. کاتێکیش ئەم ڕەگەزە پێگەی سەرەکی خۆی لەنێوان فاکتەرە پێکهێنەرەکانی نەتەوەدا لەدەستدا، نەتەوەش شتێك لەهاوڕەگەزی( تجانسها) بەرتەسکی خۆی لەدەستدا. بەڵام ئەو کێشەیەی بەهەمو جۆرێ لەبەهرەو لێهاتوییو سەرچاوەگرتن لەفیکرو باڵابوون لەواتای مرۆیی قەرەبووکردن. ئەم نەتەوەیەی کەگوزارشتێکی هەمە جۆرە لە ترادیسیۆنی حامورابیو شیعری جاهلیەو ئاینی محمەدو کولتوری سەردەمی مەئمون،

تەنها هەستێکی تێدایە کە لەهەموو کاتێکدا دەی هەژێنێ‌و تاقە ئامانجێکی هەیە سەرەڕای ئەو لەیەکدابڕان و لەڕێ دەرچوونەی دێتە ڕێ"[١١].

باشە، ئەگەر عەرەب هەست بکەن بەوەی کەجاران یەك ڕەچەڵەك‌و یەك ڕەگەز بوون لەبەر ئەوەی خاوەنی یەك بیروباوەڕ بوون هەر لە بنەمای مێژووەوە بگرە لەکاتی ئیمپراتوریەتی بابلی‌و جاهلیەت‌و چەرخی پەیامبەرو هەتا ئیمپراتۆریەتی عەباسی، ئەوا پێوستە لەسەر یەکتری بکەن‌و خۆیان بتوێننەوە لەناو "یەکێتیەکی هەتاهەتایی"و دووربکەونەوە لەبەگژداچونی یەکترو دابەش بوون‌و دووبەرەکی، ئەی چۆن عەرەب دەتوانن ئەم ئامانجە بپێکن؟

لەڕێگەی بەرپەت دانەوەی هەمان فاکتەرو هەمان هێز بۆئەوەی شۆڕشێکی گشتی(تەواو) بەرپا بکەن کە توانای زاڵبونی هەبێت بەسەر "هێزی خراپ‌و بەدکار" (وەك ئیمپریالیزم‌و کۆلۆنیالیزم‌و زایۆنیزم) کە لەدەرەوە خۆی سەپاندوە بەسەر میللەتی عەرەبداو بتوانێ دوژمنی ناوەوە (وەك هێزی کۆنەپەرست‌و دواکەوتنخواز) لەناوبەرێ کەدەیەوێ بەردەوام بێت لەلاوازکردن‌و نەهێشتنی نەتەوەی عەرەب. پاش ئەوە، نەتەوەی عەرەب دەتوانێ هێزی دروستکەری عەرەب بژیێنێتەوە. لەڕوانگەی عەفلەقەوە، سیاسەتی شۆڕشگێریی تەنها چارەسەرە بۆ پاراستنی ژیانی ناسیۆنالی نەتەوەی عەرەب‌و تەنها ئامرازە بۆ خستنەڕووی هێزە ساغەکان‌و دروستکەرەکانی نەتەوەی عەرەب‌و تەنها سیاسەتی شۆڕشگێریی بەعسی دەتوانێ سەرکەوتێنێکی بێ پایان بەسەر دوژمندا بەدیبهێنێ. ئەم سیاسەتە توانای ئەوەی هەیە کە لەلایەکەوە هوشیاری میللەت بخاتەکارو هەستی بەرپرسێتی بەرزبکاتەوەو بیهێنێتە سەر ڕێگەی هاوکاری لەنێوان ئەندامان‌و، لەلایەکی تریشەوە پەردە لەسەر ڕووی ماکە(ئیلێمێنتە) لاوازو پارچەپارچە کراوەکان لاببات‌و فریویان بدات. بەم شێوەیە هیچ دوژمنێك ناتوانێ لەناو ڕیزی میللەتدا ئاژاوە بنێتەوە" ئەو میللەتە لەکۆتایدا دەبێ بەسەر سەرجەم کەندو کۆسپەکاندا سەرکەوێ، چونکە دەتوانێ پەنجە بۆ دوژمن رابکێشێ‌و هێزو ووزەی خۆی دەدۆزێتەوە[١٢].

بەم شێوەیە، سیاسەتی شۆڕشگێڕانە دوو قۆناغ لەژیانی نەتەوەی عەرەب جیادەکاتەوە: یەکەمیان پێکهاتوە لەبێ هەستیی‌و بێ جوڵەیی، دوەمیان پێکهاتوە لەتەجاوزکردنی ئەم نەخۆشیانەو دروست کردنی نەتەوەیەکی نوێ. عەفلەق لای وایە سیاسەتی شۆڕشگێڕانە ئەو واقعە بۆگەنەی کەخەسڵەتەکەی سایکۆلۆژیەکی هەڵچوو و ئەخلاقیێکی نەفعی وشیوۆ بیرکردنەوەیەکی کۆنەپەرستانەیە دادەمرکێنێ‌و دەیگۆڕێ بۆبزوتنەوەیەکی شۆڕشگێرانە بەسەرۆکایەتی نەوەی نوێ‌و ڕزگاربووی عەرەب[١٣].

عەفلەق، تایبەتمەندیەکی گەورە دەدات بە بەعس کەوەك پارتێکی شۆڕشگێرانە نەك تەنها جیاوازە لەڕێکخراوو پارتە کۆنەپەرستەکان کەبەرگری دەکەن لەدروست بوونی دەوڵەتێکی عەرەبی یەکگرتوی سۆسیالیستی پێشکەوتنخواز، بەڵکو جیاوازیشە لەپارتە بەروکەش پێشکەوتنخوازەکان کە لایان وایە دەتوانن یەکێتی‌و ئازادی‌و سۆسیالیزم بەدیبهێنن[١٤]. بەم شێوەیە، شۆڕشی گشتگیرو یەکگرتنی ڕۆحی دوو پێوانەن کە کردەوەی سیاسی دەژیێننەوەو بەردەوامیی پێدەدەن. کردەوەی سیاسی بەتێکهەڵچونیا لەگەڵ شۆڕشی گشتگیرو ژیاننەوەی ڕۆحیی، ڕێگە پاك دەکاتەوە بۆ ناسیۆنالیزمێك کەبەگوێرەی تیروانینی بەعس، جاران تۆوی یەکێتی عەرەبی پێکدەهێنا. ئەم پەیوەندیە دیالێکتیکیە لەنێوان فاکتەری ڕۆحی (هەستی ناسیۆنالیزم) ویەکێتی سیاسی، بنچینەی بوونی نەتەوەی عەرەب پێکدێنێ. بەعس ئەم پەیوەندیە دەگەڕێنێتەوە سەرئەوەی کە "عەرەب هەر لەبنەمای مێژووەوە نەتەوە بوون"[١٥] و هەر وەکو عەفلەق دەڵێ "لەژێر دەسەلاتی یەك دەوڵەت" بوون‌و بناغەی بوونیان هەمیشە ناسیۆنالیزم بوە. بەم بۆنەوە بەعس ئەرکی "پیرۆز" دەخاتە سەر شانی خۆی کە لەسەر وێنەی رابوردوی مەزنی عەرەب، نەتەوەی عەرەب کۆ بکاتەوە لەناو چوارچێوەی دەوڵەتێك کە ناسیۆنالیزم بێ بەپرینسیپی ڕێگە پاککەرەوەی. لەم هەڵوێستەوە بەعس خۆی دژی هەموو پەرەسەندن‌و پێشکەوتنێکی خاو و چاکسازیەکی ڕوکەش‌و پارچەیی " کە بیانەوێ ڕێگە بگرن لە "پەیامی نەمری" پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست قوت دەکاتەوە.

هەر لەسەر بنچینەی ئەم قەناعەتەوە، مادەی یەکی دەستوری پارتی بەعس کە لەسالیٚ ١٩٤٧ دارێژراوە دەلیٚ: "پارتی بەعسی عەرەب پارتێکی شۆڕشگێڕە، باوەڕی بەوەیە کەئامانجە سەرەکیەکانی ژیانەوەی نەتەوەی عەرەبو بنیادنانی سۆسیالیزم، نایەتەدی لە ڕێگەی شۆڕش و خەباتەوە نەبێت. پشت بەستن بە پرۆسەی گەشەسەندنی خاو و ریفۆرمی پارچەیی‌و ڕووکەشیی، ئەم ئامانجانە بەرەو سەرنەکەوتن‌و وون بوون دەبەن"[١٦]. پێشەکی پرینسیپە بنەڕەتیەکانی دەستورەکە دەلیٚ: "عەرەب یەك نەتەوە پێکدێنن‌و مافی سروشتی خۆیان هەیە کە لەدەولەتێکدا بژین‌و ئازادبن لەبەڕێوە بردنی داهاتویان" [١٧]. مادەی یەك دەلێت:" نیشتمانی عەرەب یەکێتیەکی سیاسی ئابوری نادابەشکراو پێکدێنێت‌و هیچ ولاتێکی تر ناتوانیٚ بەجیا لەوانی دیکە بژی. مادەی دوو لەدەستورەکە دەلیٚ: "نەتەوەی عەرەب پێکهاتوە لەیەکێتیەکی کولتوری‌و ئەو جیاوازیانەی کە هەن لەنێوان ڕۆلەکانیدا گرنگ نین‌و ڕوالەتین. ئەوجیاوازیانە لەگەل ڕاپەڕینی هۆشی عەرەبی نامێنن ".

ئێستا، دەمانەویٚ بزانین سنووری جوغرافی ئەم وولاتە عەرەبیە کامەیە کەدەبیٚ لەژێر دەسەلاتی پارتی بەعسدا بێت؟ دەبیٚ لەسەر بنچینەی چ پێوانەیەکی جوگرافی و مێژویی ئەم نیشتمانە حسابی بۆ بکریٚ؟ مادەی حەوتی دەستوری بەعس دەلیٚ:"نیشتمانی عەرەبی ئەو پارچە زەویەیە کە دانیشتوانی لەنەتەوەی عەرەب پێکهاتون و دەکەوێتە نێوان شاخەکانی تۆرۆس‌و پشتکێو و روباری بەسرە و دەریای عەرەبی‌و شاخەکانی حەبەشەو بیابانی ئۆقیانوسی ئەتلەسی‌و دەریای سپی ناوەند"(**

ئەگەر تەماشایەکی نەخشەی جوگرافی بکەین، ئایا زۆر بەزویی یەك شت سەرنجی تایبەتیمان ڕاناکێشیٚ؟ ئایا ئەم داخوازیەی بەعس شتێکی خەیالی‌و یوتۆپی نییە؟ واتا

---

** ئەوەی راستی بێت، ئەم داخوزیە نویٚ نیە لەمێژووی میللەتی عەرەبداو بەعسیدا نییە هێناوە. لەبڕگەی چواری داخوازییەکانی ناوی ((المثنی)ی نەسیۆنالیستی عیراقی، ئەم هەلوێستە بەدی دەکریٚ. بڕوانە بۆ ئەم مەبەستە: حازم المفتي، العراق بين عهدين، ياسين الهاشمي وبكر صدقي، مكتبة اليقظة العربية، ١٩٩٠، ل ١٤٨.

ئایا ئەمە ئیدێیالێك یان تێڕوانینێکی سیاسی یان کۆمەڵایەتی نییە کەهیچ نرخێك بۆ واقیع دانانیێ؟) چۆن دەکرێ ئەم هەموو پارچە لێکپچڕاوانە لەیەك بدەین‌و بیکەین بەیەك دەوڵەت‌و بیخەینە ژێر دەسەڵاتی پارتی بەعس؟ ئەو وڵاتەی کەبەم شێوەیە پێناسە کراوە لەلایەن دەستوری بەعسەوە ئەمڕۆ پێکهاتوە لە ٢٢ دەوڵەت کە هەر یەکە لەم دەوڵەتانە سیستمێکی سیاسی تایبەتی خۆی هەیە کەکۆیەکی دادوەری وئابوری‌و کولتوری‌و کۆمەڵایەتی دەنوێنێ لەناو چوار چێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆدا کەئەندامی کۆمەڵگەی جیهانیە. چۆن‌و بەچ ڕێگەیەك دەتوانرێ ئەو هەموو سنوورە سیاسیانە لابرێن کە لەنێوان ئەم دەوڵەتانەدا هەن؟ پاش ئەوە، کامەیە شەرعیەتی پارتێتك کە دەیەوێ ئەم دەوڵەتە بەڕێوە بەرێ؟ تەنانەت هەر بۆ لێکدانەوەیەکی نالۆژیکی، گریمانە بکەین کە ئەم تواندنەوەیە لەتوانادا بێت، چۆن دەتوانین ئەو وێنەیە بخەینە پێش چاومان کە دەوڵەتێکی بەم قەوارە بتوانێ لەلایەن تەنها یەك ڕێکخراوی سیاسی ببرێ بەڕێوە بەبێ ئەوەی نەبێت بەدەوڵەتێکی "بۆناپارتی" یان "سێزاری" تۆقێنەر؟ ئایا ئەم دەوڵەتە نابێ بەئیمبراتۆریەتێك کەبیەوێ هەموو ئێلێمێنتە ئێتنیکی‌و ئاینیەکان لەناو ئەو ناسیۆنالیزمەدا کە بنچینەکەی باوەڕ بتوێنێتەوە، وەك ئەوەی کە عەفلەق دەڵێ؟ ئەی کامەیە پاساوی مێژوویی ئەم "دەوڵەت ئیمبراتۆریەتە"؟ دەزانرێ کەجگە لەنیمچە دورگەی عەرەب، ئەو میللەتانەی کە ئەمڕۆ لەناو ئەو وڵاتە عەرەبیەی کە بەعس باسی لێدەکات هیچ کامیان پێش ساڵی٦٦٣ز هەرگیز بەعەرەبی نەدواون. ملیۆنەها بەربەرو سۆدانی کەزمانی زکماکیان عەرەبی نیەو ملیۆنەها کوردو زۆر گروپی ئێتنیکی دیکە کەعەرەب نین لەناو سنوری ئەم وڵاتە عەرەبیەی کەبەعس باسی لێدەکات دەژین. باشە، ئەی هەڵوێستی بەعس بەرامبەر بەم میللەتانە چییە؟

پرینسیپی پێنجەمی پارتی بەعس بەڕوونی هەڵوێستی خۆی دەردەبڕێ: "ئەو کەمایەتیانەی کەعەرەب نین‌و ناتوانن لەناو عەرەبدا بتوێنەوە یاخود ناتوانن بەتەواوی بین بەعەرەب، دەبێ سەر شۆڕبن بۆ ئەو یاسا تایبەتیانەی کەسنور بۆ ئەرك‌و مافیان دادەنێن بۆ ئەوەی نەتوانن زیان بە بەرژەوەندیەکانی میللەتی عەرەب بگەیەنن "[١٨].

زیاتر لەوەش، ئەم وولاّتە عەرەبیانە، سنورەکانیان ڕوون نین‌و خراپ دەستنیشان کـراون. بۆ نمونە، جگە لەدەریای بەسرەو زەریای ئەتلەسـی‌و دەریـای غـەزال، سـنورەکانی ئـەم وولاّتە عەرەبیانە کە لەلایەن دەستوری بەعسەوە پێناسە کراون زۆر تەواونین. بۆ نمونـە، ڕووبەری شاخەکانی تورۆس یاخود شاخەکانی ئەسیوپی یاخود سـەحرا کامەیـە؟ هـەر یەکێ لەم زنجیرە شاخانە پێکهاتوە لەهـەزارەها کیلـۆ مـەتر. زۆر ناوچـەی ئـەم وولاّتـە عەرەبیانە بەتەنها جێنشینی عەرەب نین. کوردستانی عـیراق‌و دەریـای غـەزال‌و نیلـی سەرو و ناوچەکانی ئێکواتۆری سۆدان بە بەشێك لەنیشـتیمانی عـەرەب دانـراون [١٩]. جگە لەوەش، بەعس ئیسـرائیل بـە بەشـێك لەنیشـتیمانی عـەرەب دەژمـێرێ [٢٠] و هەروەها ئەسکەندەرۆنە لەتورکیاو ناوچـەی خوزسـتان (ئـەهواز) لـەئیران کەزۆربـەی دانیشـتوانی عـەرەبن‌و جـاران لەلایـەن هـەندێ خـێزانی عەرەبیـەوە حوکـم کـراون، بەنیشتیمانی عەرەب لەقەڵـەم دەدا. پرۆگرامـی وانـەی جوگرافـی کـە لەخوێندنگـە سـەرەتاییەکان دەخوێـنرا لـەعیراق کەراکتـەری ئـیرێدێنتیزم (irredentism )* دەردەخات واتا ئەوە دەردەخات کە ئەو ناوچانەی ئەمڕۆ دەکەونە ئێرانەوە دەبێ هاوبـەش بن لەو نیشمانە عەرەبیەی کەبەعس دەیەوێ بنیادی بنێ. بۆ نمونە خوزستان کەئێسـتا ناوچەیەکە لەناوچـەکانی ئـێران، بـەعس بـە بەشـێك لەنیشـمانی عـەرەبی دادەنـێ. لەپەرتوکی پێنجی سەرەتایدا نووسراوە:" ناوچەیـەك لـەئێران کەدەکەوێتـە خـواروی وولاّتی ئێمەو پێی دەوترێ ئەهواز. ئەم ناوچەیە عەرەبستانەو بەلاّم ئێران وەری گرتوە بۆ خۆی. خاکی ئەهواز دەکەوێتە سنوری دەشتی خوارو وئاوو هەواکەشی هەرلەوەی ئێمـە دەکات. دانیشتوانەکەی بەهۆی زمان‌و ئاین‌و نزیکی‌و پەیوەندی خێزان بەسراونەتەوە بە دانیشتوانی دەشتی خواروو. خوونـەریت‌و ڕەوشـت لەیـەك دەکـەن(..). ئـەم ناوچەیـە

---

* ئیردێنتیزم عەقیدەیەکی سیاسیی ناسیۆنالیزمی ئیتاڵییە کە پاش بەجێهێنانی یەکێتیی، داوای بەیەکەوەلکاندنی ئەو زەوییانەی دەکرد کە لەژێر دەستی بێگانەدا بوون. لەئەدەبیاتی سیاسیدا، ئەمڕۆ هەموو بزووتنەوەیەکی ناسیۆنالیست دەگرێتەوە کە لەهەمان پرنسیپ سەرچاوە دەگرێت.

دەوڵەمەندە بەنەوت‌و برنج. شارە هەرەگرنگەکانی پێیـان دەوتـرێ ئـەهوازو عـەبادان‌و محەمەرە"[٢١].

٢- ئازادی(حرية):

دووەم کوچکەی ئایدیۆلۆژیای بەعسی پێکهاتوە لەئازادی. بەڵام واتـای ئـازادی لای بەعس چییە؟ دەبێ بوترێ کەپێش هەموو شـتێك بـەعس، یـەکێتی ڕۆحـی‌و سیاسـی دەکات بەپرینسیپی یەکـەم‌و مـەرجی بنچینـەیی ئـازادی مـرۆڤ. هـەموو تـێڕوانین‌و جیهانبینی بەعس سەبارەت بەئازادی لەسەر ئەم پریسنیپەی خوارەوە دەوەستێتەوە:

لەبەر ئەوەی نەتەوەی عەرەب لـەبارودۆخێکی دژوار دەژی، نـابێ ئـازادی شەخسـی‌و تاکە کەسیی جیاوازبێت لەئازادی نەتەوەیی، واتا دەبـێ لێکچونێـك هـەبێت لـەنێوان ئازادی شەخسی‌و ئازادی نەتەوە. ئەمە چ واتایەك دەبەخشێ؟

لەڕوانگەی بەعسەوە ئازادی نەتەوەیی دەبێ شـان بەشـانی ڕزگـارکردنی نیشـتمانی عـەرەب بڕوات. ئەگەر وابێت، واتـا ئەگـەر ئـازادی نەتـەوەیی‌و ڕزگـارکردنی نەتـەوەو نیشتمان شان بەشانی یەکتری بڕۆن، ئەوا دەبێ ئازادی شەخسی کەم بێتەوەو ملکـەچی بکات بۆ "ئیمپـێرەتیڤی بـەرژەوەندی نەتـەوەیی"[٢٢]. لەخـەبات کردنـدا بـۆ ئـازادی نیشتمان‌و نەتەوە، بەعس کێشـەی یـەکێتی دێنێتـە پێشـەوە وەك هـێزێك کـە دەبـێ بەرنگاری هەموو دابەشبونێکی نەتەوە بکات. بەم واتایـە، هەسـتی نەتـەوەیی تەنـها سەرچاوەی ئازادی پێکدێنێ: هەستی نەتەوەیی وەك تەنها گوزارشتێك لـەخۆچاککردن‌و خۆسـەپاندنی هاونیشـتمانی عـەرەب. لەبەرئـەم هۆیـە، بوونـی تاکـە کـەس دەبـێ سەرفروبێنێ بۆ هێزی کۆکەرەوەو لەخۆباوەشـگرو عصـیری ڕۆحـی نەتـەوە کەهەسـتی ناسیۆنالیزمە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بۆ نمونـە مـرۆڤ دەتوانـێ ئـازاد بێـت ئەگـەر ناسیۆنالیست بێـت چونکـە ناسـیۆنالیزم وەکـو عەفلـەق دەڵـێ "بەئامانجگەیشـتنی ڕابوردومانە، لەناو فەزیلەو چەوتیمانـە، لـەمێژوی نوسـراومانەو لـەمێژەوە لـەقوڵایی

ناوخۆییماندا ڕەگی داکوتیوە"[٢٣]. بەم شێوەیە، لەگەڵ ڕزگارکردنی گشت نیشتمانی عەرەب، بەعس ناسیۆنالیزم بەو میستیسیزمەوە دەلکێنێ[٢٤] کە دەیەوێ ئادەمیزاد لەناو باوەشی کۆی نەتەوەیی بتوێنێتەوە. خۆی لەخۆیدا، ناسیۆنالیزم گوزارشتە لە "باوەڕێکی هوشیار کەمرۆڤ لەناو نەتەوەدا دەتوێنێتەوەو دەیکات بەناوکێکی ڕاستەقینە بۆ یەکێتی"[٢٥]. بەلای عەفلەقەوە، ئازادی تاکەکەسیی عەرەب دەبێ تەسك بێتەوە لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی، چونکە تاکە کەس ئەو کیانەیە کەبەتەواوی بەسراوەتەوە بەڕۆحی نەتەوەوە"[٢٦]. هەرچەندە عەفلەق دەڵێ کە تاکە کەس" بنچینەیەو" "شتێکی زۆر گرنگە"، بەڵام دووپاتی دەکاتەوە کە تاکە کەس وەکو ئەندامی میللەت دەبێ "ئەو مەرجانە" جێبەجێ بکات کەپەیوەندی نەتەوەیی بەسەریا دەسەپێنێ[٢٧]. بەڵام لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێو هەر وەکو حەننا بەتاتو دەڵێ، کامەیە ئەو دەسەڵاتەی کە ئەم" مەرجانە" دەکات بە "بەرزترین بەرژەوەندی نەتەوەی عەرەب"؟[٢٨]. باهەوڵ بدەین ئەم کێشەیە بەشێوەیەکی دیکە لێك بدەینەوە. عەفلەق دەڵێ هیچ شتێك نییە کەبەرزتر بێت لەعروبە" (عروبە بەواتای ناسیۆنالیزمی عەرەبی)، چونکە عروبە خۆپەرستنو بەرژەوەندی کەسایەتی ڕەتدەکاتەوەو تەنها "ڕاستی" دەتوانێ لەپلەیەکی بەرزتر دابنرێ. "هەندێك دەڵێن کەعروبە لەسەروی هەموو کەسێکەوەیەو مەبەستیان لەعروبە ئەوەیە کەگروپێك بڕیار دەدا لەسەر شتێك . ئەم باسە هەندێ خەتەری تێدا هەیە. بەلای ئێمەوە، باوەڕمان بەوە هەیە کەعروبە لەسەروی هەموو کەسێکەوەیە بەو واتایەی کە لەسەروری هەموو بەرژەوەندیەکی "تەسك" و خۆپەرستنو بۆچونێکی بێ بناغەو بێ کەڵکە. بەڵام باوەڕیشمان بەوە هەیە کەتەنها شتێك لەسەروی عروبەوەیە، ئەویش ڕاستیە (..) .لەبەر ئەوە، دروشمی ئێمە ئەوەیە کەڕاستی دەبێ لەسەرووی عروبەوە بێت هەتا ئەو سنوورەی کەعروبە بتوانێ لەناو ڕاستیدا بتوێتەوە"[٢٩]. هەرچەندە ئەم وشانە زۆر تێکەڵو پێکەڵن، بەڵام لەوە دەکات کەعەفلەق ئەم مەبەستەی خوارەوەی هەبێت: هەرچەندە عروبە شان بەشانی ڕاستی ناڕواتو ناگاتە ئەو ئاستە، بەڵام ئەگەر دابنرێ بەهێزێك لەسەروی هەموو

بەرژەوەندی کەسایەتیو خۆپەرستنێك، ئەوا زۆر جیاوازی نییە لەگەڵ ڕاستیدا چونکە بەم شێوەیە پەیوەندیەکی زۆر تەسك هەیە لەنێوانیاندا چونکە عروبەو ڕاستی فۆڕمێکی ئیزۆمۆرفی (isomorphic) دروستدەکەنو بابڵێین هەر یەکن.

بێ گومان، دەبێ بوترێ کەعەفلەق بەبێ پێشنەیەکی پتەو زۆر حەزی لەفەلسەفە کردوەو کاریگەریی بیری ئەورووپی (ناسیۆنالیزمی ئەورووپی) وای لێ کردوە کە لەوتارەکانیدا دیالێکتێکی فەلسەفە بەکار بهێنێ بە بەبێ ئەوەی بەقوڵی لێی تێبگاتو زۆر بەشێوەیەکی ڕووکەش بیری فەلسەفەی سیاسی بەعسی دەخاتە ڕوو. لەچوار چێوەی لۆژیکە ناسیۆنالیستەکەیدا، عەفلەق دەیەوێ بڵێ هەر وەکو عروبە گوزارشتێکی "پوختی" نەتەوەییە، کەواتە هاواتای (سینۆنیم) ڕاستیە چونکە لەناویدا دەتوێتەوە. لەڕێگەی ئەم شێوە لێدوانە فەلسەفیە، عەفلەق بەعس دەکاتە ئەوەی کەخۆی بەمایکرۆکۆزمی (جیهانی بچوکی) نەتەوەی عەرەب دابنێ، واتا "وێنەی بچوکی"(صورة مصغرة) نەتەوەیەکی پاكو پوختو پێشکەوتوو"[٣٠]. بەم شێوەیە، دەرئەنجامی ئەم جیهانبینیە ئەوە دەگەێنێ کە "ڕاستی" پێك هاتوە لە"ئارکێ"ی بەعسی، واتا لە"پرینسیپی یەکەمی" ("arkhe" بە یۆنانی کۆن) بەعسی( ئەگەر بمانەوێ زارەوەیەکی کۆنی فیزیۆلۆژیستو کیمیاویەکانی چەرخی ناوەڕاست بەکار بهێین). بەزاراوەی سیلۆژیزمی( syllogism ) فەلسەفی دەتوانین بڵێین کەئەگەر ڕاستی بەرزتر بێت لەعروبە، هیچ کۆسپێك نییە کەعروبە بتوێنێتەوە لەناو ڕاستیدا بۆ ئەوەی هەردوکیان پێکەوە یەکێتیەکی نەتواوە پێکبهێنین . بەلاّم هەر لەبەر ئەوەی بەعس گوزارشتی "پوختی" عروبەیە ، ئەم توانەوەیە لەڕاستیدا توانەوەی بەعسیەتە لەناو عروبەدا ( ئەمە لەلایەکەوە)، لەلایەکی تریشەوە توانەوەی بەعسیەت لەگەڵ ڕاستیدا هەتا ئەو سنورەی کەبەعسو عروبەو ڕاستی دەبن بەیەكو ئەم یەکێتیەش هیچ شتێکی کەنییە بەعس خۆی نەبێ.

بەم شێوەیە، تەسك کردنەوەی ئازادی تاکە کەس لەپێناوی خزمەتی نەتەوەو ڕۆڵی لاوەکی تاکەکەس بەرامبەر نەتەوەو پەیوەندی ڕۆحی تاکە کەسی عەرەب

کەبەسراوەتەوە بەنەتەوەی عەرەبەوە، دەمان باتە سەر ڕێگەی لۆژیکێکی تایبەتی: ملکەچبون بۆ بەعس کەدەبێ بەپێناسەی(identity ) نەتەوەی عەرەب، واتا بەتەنها نوێنەری "پوختی" یان تەنها نوێنەری نەتەوەی عەرەب. ئازادی بەو شێوەیەی کەبەعس حسابی بۆ دەکات، دەبێ بە بەرهەمی بەرپرسێتی مۆڕاڵی هاونیشتمانی عەرەب کەبریتیە لەملکەچبونێکی بێ مەرجو تەواو و بێهاوتا بۆ هەستو ویستی پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست، تەنها خاوەنی "باشی گشتی".

٣- سۆسیالیزم :

سۆسیالیزم (الاشتراکیة) سیهەم ئامانجی سێ فاقەی بەعسیە. ئایدیۆلۆژیای بەعسی دەڵێ: "سۆسیالیزم پێویستیەکە کە لەناخی ناسیۆنالیزمی عەرەبیەوە هەڵدەقوڵێ"[٣١]. ئەم ئۆنتۆتێلیێۆلۆژیە مۆراڵیە (moral onto-teleology) واتا پێویستی سۆسیالیزم وەك ڕەنگدانەوەی قوڵایی ناسۆنالیزمی عەرەب لەڕێگەی بەیەکداچونی ( بە پێکەوە لکاندنی) یان بە "هاوسەری پێکردنی" ناسیۆنالیزمو سۆسیالیزم پاساو دەکرێ. ئەگەر ناسۆنالیزمی عەرەبی لەجەوهەردا ناسیۆنالیزمێکی سۆسالیستە، سۆسیالیزمەکەشی ناتوانێ بێتەدی ئەگەر بەهاوکاری ناسیۆنالیزم نەبێ. دەبێ بوترێ کە لەنێوان هەردوکیان هاو واتاییەك یان تێکەڵ بۆنێك یان کارلێکێك هەیە، بەو واتایەی کەهەردوکیان لەیەکتری جیا ناکرێنەوەو هیچ هێزێکیش ناتوانێ لەیەکتریان بکات [٣٢]. بەڵام دەبێ ئاگاداربین کە بەیەکداچونو تێکهەڵکێشی، واتای ئەوە ناگەیێنێ کەناسیۆنالیزمو سۆسیالیزم هەمان بەهایان هەیەو کەهەردوکیان لەسەر یەك تەرازوو دادەنرێنو بەیەك چاو تەماشا دەکرێن. سۆسیالیزم کەمتر گرنگە لەناسیۆنالیزم. سۆسیالیزم شتێکە کە بەشێوەیەکی زۆرەکی دەژمێردرێ بەهێزی دوەم لەبەردەم ناسیۆنالیزم، کەناسیۆنالیزم "سەرچاوەی سەرەکی" پێکدێنێ: عەفلەق دەڵێ " سۆسیالیزم بەلای ئێمەوە لقەو ئەنجامی دۆخی نەتەوایەتیو پێداویستی نەتەوایەتیمانە. سۆسیالیزم ناتوانێ ببێ بەفەلسەفەی یەکەم یان بەجیهانبینیەکی

گشتگیری ژیان(. . .). سۆسیالیزم لقێکە کە لەسەرچاوەیەکی ڕەسەن دێتە کایەوەو ئەم سەرچاوەیەش بریتییە لەبیری ناسیۆنالیزم"[٣٣]. لەبەرئەوەی کە لەبنەڕەتدا ناسیۆنالیستە، سۆسیالیزمی بەعسی نابێ ببێ بە "فاکتەری پێکداچوون‌و دابەش بوونی ناوخۆیی"[٣٤]، " چونکە ئەم فاکتەرە دەبێتە هۆی تێکچوونی ڕەنگدانەوەی کۆیەکی مرۆڤایەتی کە هەر لەکۆنەوە دەقی گرتوە لەناو قالبی ناسۆنالیزمدا. ئەم "هاوسەریە میستیکیە" [٣٥] لەنێوان ناسیۆنالیزم‌و سۆسیالیزم، ئاماجنەکەی هیچ شتێکی دیکە نییە ئەوە نەبێت کەهێزێکی سینێرژێتیك (synergetic) پێکبێنێ لەناو بیری ناسیۆنالیزم‌و لەهەمان کاتدا ڕێگە لەسۆسیالیزم بگرێ کە نەبێ یان نەگۆڕێ بۆ کۆمۆنیزمی مارکسی‌و لەئەنجامدا ببێ بەگۆڕەپانی هەستی دژایەتی لەکۆمەڵدا. ئەگەر ناسیۆنالیزم گوزارشتێکی ڕاستەقینەی یەکێتی ڕۆحی‌و سیاسی بێ، زۆر سروشتیە کەهەموو فاکتەرێکی دابەش بوون بەرپەرت بداتەوە. ئەمەش زیاتر لەبەر ئەوەی کەناسیۆنالیزمی بەعسی پێوستی بەیەکسانیەکی مەتماتیکی هۆش‌وبیر هەیە بۆ خزمەتی ئیمپێرەتیڤی مەسەلەی نەتەوایەتی‌و لەو ڕێگایەوە داوا دەکات کەهاوبەشیەکی ئەکتیڤ هەبێت بۆ بنیادنانی یەکێتی بەبێ جیاوازی لەنێوان چینە کۆمەڵایەتیەکان‌و ئینتمای ئاینی دیانی‌و ئاینزاو سێکتەکان، لەئیسلامدا: شیعە، سنە..) و ئێتنیکی (ئەوکەمایەتی‌و گەلانەی کە لەناو نیشتمانی عەرەبدا دەژین). بەم شێوەیە، ژیاندنەوەی ڕۆحی عەرەب بەپێوسیتی دەزانێ هاوتایی یان بەلانس لەناو کۆمەڵگەی نوێدا لەڕێگەی "ستانداردیزەکردنی" سەرجەم هوشیارە تایبەتیەکان‌و بەیەکسانیکردنی یان "بەئۆمۆژێن" کردنی[٣٦] سەرجەم هەستە تایبەتیەکان‌و بەکۆمەڵاندنی سەرجەم هەڵسوکەوتە کەسایەتیەکان بەدی بێت. کاتێك کەئایدیۆژیای بەعسی دەڵێ "سۆسالیزم شێوەیەکی ژیانە" و" هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە: باری ئابوری، سیاسەت، پەروەردە، بەکۆمەڵایەتی بوون، تەندروستی، خووڕەوشت، ئەدەب، زانست، مێژوو و هەموو شتێکی دیکە، جازۆر گرنگ بێ یان کەم"[٣٧]، مەبەستی لەوەزیفەیەکی کۆکەرەوەی ژیانی مادی نییە ( ئەگەر بمانەوێ زاراوەیەکی

مارکسی بەکار بهێنین) ، بەڵکو ئایدیۆژیای بەعسی دەیەوێ بڵێ کە کار بۆ "بە ڕۆحی کردنی" ئەو ژیانە دەکات کە لەناو جەرگەی هەستی ناسیۆنالیزمدا هەڵدەقوڵێ. ئەم هاوکێشەیە ڕوانگەی ئایدیۆلۆژی بەعسی ڕوونتر دەکاتەوە کەدەیەوێ هەموو دەرکەوتەکانی ژیان ملکەچی یاسایەکی ناسیۆنالیست بن کەبەعس خۆی دروستکەرو خوڵقێنەریەتی. بەم واتایە سۆسیالیزمی بەعسی زیاتر ڕۆحیە وەك لەوەی لەئیدێیالێکی مەتریالسیتەوە سەری هەڵدابێ‌و زیاتر سەرخانەیە وەك لەوەی ستروکتوریی بێت. لەبەر ئەوە هەڵەیە سۆسیالیزمی بەعسی دابنرێ بەسۆسیالیزمێکی مارکسی‌و هەروەها ڕاست نییە تیۆریزەکردنی بەعسی بەسۆسیالیزمێکی نزیك بەمارکسیزم دابنرێ. لەجەوهەریدا، ئایدیۆلۆژیای بەعسی هەڵوێستێکی دژ بەکۆمونیزمی هەیەو مارکسیش دادەنێ بەڕۆشنبیرێك کە لەبنیادنانی " ئایدیۆلۆژی کۆمونیزم، کاریگەریی ڕۆحی جولەکەی تۆڵەسێنەری بەسەرەوەیە". سۆسیالیزمی بەعسی، ناسیۆنالیست‌و ڕۆحی‌و "نێوچینیە" کەبەسراوەتەوە بەڕابوردوەو ئینتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاریی ڕەفز دەکات. سۆسیالیزمی بەعسی هیچ خاڵی هاوبەشی نییە لەگەڵ کۆمۆنیزمی ئینتەرناسیۆلیسدا کەخەباتی چینایەتی‌و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتارو مەتێریالیزمی دیالێکتیکی‌و مێژوویی پەسەند دەکات.

بۆ بەعس "کۆمونیزم بەرهەمی بیری ئەوروپیە" نەك بیری عەرەب‌و "نامۆیە بۆ هەموو عەرەبێك". بەم بۆنەیەوە عەفلەق دەڵێ " هیچ نەتەوەیەك یان ئاینزانیەکی ئەوروپی، پێگەی کۆمەلایەتی‌و سیاسیشی هەرچیەك بێ، هەرگیز رق‌و کینەی ناگاتە رق‌و کینەی عەرەبێك بەرامبەر بەکۆمونیزم"[٣٨] . بابزانین بۆچی.

یەکەم، نەتەوەی عەرەب میراتی رابوردویەکی مەزنە، "نەتەوەیەکی بچوك نییەو گرنگیەکی لاوەکی نییە". لەبەر ئەوە نابێ "جگە لەپەیامەکەی خۆی پەیامێکی دیکە هەڵبگرێ‌و بەدوای نەتەوەیەکی دیکەوە بێت‌و چڵکاوی بخواتەوە"[٣٩] . لەبەر ئەوەی نەتەوەی عەرەب پێگەی سەرجەم شارستانیەکانی دیکە بوە، دەبێ لەمێژوی خۆی‌و بیری خۆی مۆدێلی سۆسیالیزم دروست بکات نەوەك لەمارکسیزمی خۆرئاوایی.

نەتەوەی عەرەب تایبەتمەندی خۆی هەیەو لاسایی کردنەوەی مارکسیزمی ئەورووپی ئەم تایبەتمەندیەی لەناو دەبات. سەدام حوسەین دەڵێ ئەگەر ئەفریقەکان و ئاسیاویەکان مارکیسزم وەك ڕێگایەك بۆ گۆڕانکاری شورشگێڕیی وەربگرن، گلەییان لێناکرێ چونکە هیچ ترادیسیۆنێکی مێژوییی و میراتی فکریان نییە کەبەراورد بکرێ بەمێژووی نەتەوەی عەرەب.

بۆ نمونە ئەفریقی ڕۆدیسیا هیچی لەدەست ناچێت ئەگەر مارکسیزم پەسەند بکات چونکە هیچ قەوارەیەکی مێژوویی وەك نەتەوەی عەرەبی نییەو هیچ میراتێکی کولتوری نییە کەبتوانێ ڕێبدات بەدروست بونی تیسۆری ڕێکوپێکی ژیان. نەتەوەی عەرەب پێگەیەکە کەپێشوازی لەپەیامبەران کردوەو شارستانیەتی زۆر کۆنە. هیچ کەسێك ئەوە ناخاتە گومانەوە کە کۆنترین شارستانیەتی جیهان لەمێزۆپۆتامیا لەدایك بوە[٤٠]. بیرۆکەی مارکسی کەئەم ئەزمونە مێژوورییەی نەتەوەی عەرەب پشتگوێ دەخات، "دان بەبنچینە ڕۆحیەکانی میللەتدا نانێ". کاتێك کۆمونیزم ڕێ دەگرێ لەهێزی جوڵێنەری نەتەوەی عەرەب بۆ ئەوەی بیر بکاتەوە لەمێژووی خۆی، دوو ڕەهەند لەرابووردوی عەرەب رەتدەکاتەوە: یەکەمیان ئاینەو دوهەمیان ناسیۆنالیزمە.

ئاین "هێزێکی جوڵێنەری سەرەکیە" کەجاران توانیویەتی هێزە شاراوەکانی عەرەب بخاتە بەرچاوو یەکێتیی و هاوکاریان بێنێتە دی و دڵیان خرۆش بکاتو توانایان فراوان بکاتەوەو بیانژێنێتەوە". دوهەمیان، واتا ناسیۆنالیزم ،یەکەم هێزی جوڵێنەری نەتەوەی عەرەبە... کەدەتوانێ دەماری دڵی عەرەب بلەرێنێتەوەو بگاتە ناخیان و پێداویستیە سەرەکیەکان جێبەجێ بکات.

دووهەم لەبەر ئەوەی کاتێك کەناسیۆنالیزم بەقۆناغێکی کاتیی دادەنێ، کۆمونیزم دەبێ بەهەڕەشەیەك بۆ وون کردنی کەسایەتی نەتەوەیی عەرەبو لەوێوە دەبێتە هۆی "نەهی کردنی پەیامی نەمری عەرەب".

سێهەم: کۆمونیزم نەهی لەقەوارەی ڕۆحی دەکاتو ئەیخاتە ژێر زەبری مەتێریالیزمی دیالێکتیکیەوە. عەفلەق دەڵێ "پێویست ناکات فەلسەفەی مادی پەسەند بکەین بۆ

ئەوەی سۆسیالیست بین چونکە بۆ ئێمە ڕۆح ئامانجێکی گەورەیەو جوڵێنەرێکی قوڵی ژیاننەوەمانە... بەلای ئێمەوە سۆسیالیزم لقەو ئەنجامی دۆخی نەتەوایەتیو پێداویستەکانی نەتەوەکەمانە. ( لەبەر ئەمە سۆسیالیزم) ناتوانێ ببێ بەفەلسەفەی یەکەمو تێڕوانین بەرامبەر ژیان.( سۆسیالیزم) لقەو سەر بۆ ڕەسەن دادەنوێنێ کەبریتییە لەبیری نەسیۆنالیزم".

چوارهەم: کۆمونیزم وێنایەکی(تصور) نێگەتیف دەدات بەکۆمەڵ چونکە کۆمەڵ بەش بەش دەکاتو دەیکات بەدوو چینی دژبەیەك. "ئەو ژینگە کۆمەڵایەتیەی کەمارکس ئاماژەی پێ دەکات کەبریتیە لە(کیانێکی) بێ بنەچەو بێ ڕۆحیەت"، بەپێچەوانەی "سۆسیالیزمی پۆزەتیڤی" بەعسیەو لەگەڵ ئیدێیالی بەعسی ناگونجێ کەنەتەوەی عەرەب وەك "هوشیاری پەیوەندیەکانی ڕابوردو لەگەڵ هەستی یەکێتی کۆمەڵ دەبینێ ". کۆمونیزم، کەخەباتی چینایەتی دەکاتە بەیداغێك لەژێر ئاڵای خۆیدا، کۆمەڵ پارچە پارچە دەکات، ئەندامانی نەتەوە لەیەکتری دوور دەخاتەوەو دەیانکات بەنێچیری شەڕی ناوخۆو خۆپەرستنو دڵبردنی (شهیه) مەتێریال . بەم شێوەیە عەرەب لەخەبات کردن دژی نەخۆشیە ڕاستەقینەکانی دوور دەخاتەوە [٤١]. بەلاّم سۆسیالیزمی پۆزەتیڤ لەپێناوی ئەوەی خۆی لەگەڵ پێداویستەکانی نەتەوەی عەرەبو و خەباتە سیاسیەکەی بلوینێ، ناتوانێ ببێت بەئامرازێك کە بۆ پیلان دانان دژی نیشتمانی عەرەب بەکاربهێنرێو بیێ بەفاکتەری پارچە پارچەکردنی کۆمەڵو کێبڕکێی ناوخۆو پێشەوای بزوتنەوەی شعوبیە "[٤٢]. بەپێچەوانەی کۆمونیزمەوە، سۆسیالیزمی پۆزتیڤ ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی نەتەوەییو مێژویی ژیانی عەرەبو گوزارشتی جەوهەری مرۆڤی ناسیۆنالیستە. لەبەر ئەوە دەبێ بکرێ بەئامرازێك لەپێناوی هوشیار کردنەوەی عەرەبو پاڵیان پێوە بنێ بۆ خەبات کردن، هەموو پێکەوە، بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان چینو کەتێگۆریە کۆمەڵایەتیەکان یاخود باشتر هەڵسەنگاندنی بەشێك بەسەر بەشێکی تردا. عەفلەق دەڵێ : " ناسیۆنالیستە عەرەبەکان، تێ دەگەن کەسۆسیالیزم ڕێگەیەکی دڵنیایە بۆ ژیاننەوەی نەتەوەو ناسیۆنالیزم چونکە دەزانن

کەخەباتی عەرەب لەم قۆناغەدا ئەرکی هەموو عەرەبێکەو عەرەبیش ناتوانن هاوبەشی بکەن لەم خەباتەدا ئەگەر لەنێوان خاوەنو کۆیلەدا استغلالو دابەش بکرێن [٤٣].

ڕۆڵی چینی کرێکار چیە کەمارکسیزم بەئەکتەرێکی مێژوویی دایدەنێ؟ چینی کرێکار بۆ بەعس، ڕۆڵێکی سەرەکی (مەرکەزی) لەشۆڕشی بەعسیدا هەیە، بەڵام ئەم ڕۆڵە ڕەنگدانەوەی دۆخی مەتێریالی نییە، واتا دۆخی مەتێریالی ڕۆڵی سەرەکی بەچینی کرێکار نابەخشێ. شۆڕشگێڕیی چینی کرێکار بەو شێوەیەی کەمارکسیزم لێکی دەداتەوە ڕەنگدانەوەی ستەکتوری بابەتیی نییە. شۆڕشگێڕی چینی کرێکار، بۆ بەعس، دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی کەچینی کرێکار پێش هەموو کەتێگوریەکی کۆمەڵایەتی دیکە، ئامادەیە خۆی ڕزگار بکات لەبەرژەوەندی تایبەتی خۆیو ئەو ئاکارانەی پێیەوە بەسراونەتەوە، ئامادەیە کەخەباتی بخاتە ناو چوار چێوەیەکی ناسیۆنالیستی. بەڵام شایانی باسە کەهەرچەندە ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە، چینی کرێکار ناتوانێ مۆنۆپۆلی شۆڕشی عەرەبی بکات چونکە شۆڕشی بەعسی شۆڕشی سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵو توێژو چینەکانە. هەموو کەتیگۆریەکی کۆمەڵایەتیو هەموو چینێك بەمەرجێك شۆڕشگێڕ بێت دەتوانێ لەشۆڕشی بەعسیدا* هاوبەشی بکات. شۆڕشی بەعسی گوزارشت لەمۆنۆپۆلی چینێکی تایبەتی ناکات چونکە شۆڕشی گشت نەتەوەیە، شۆڕشێکی ئینتێگراله. لەنووسراوێکی وەزارەتی ڕاگەیاندن بەناوی" الفكرالاشتراكي" لەساڵی ١٩٧٣، بەعس بەم شێوەیەی خوارەوە تێڕوانینی خۆی سەبارەت بەشۆڕش ڕوون دەکاتەوە: "ئایا شۆڕشی عەرەبی ئەم چەرخە شۆڕشی چینێکی تایبەتیە یاخود شۆڕشی هەموو میللەتی عەرەبە بەبێ جیاوازی لەنێوان چینەکانیدا؟ ئایا دەیەوێ هەندێ لەچینەکانی بخاتە دەرەوەی ئەم چوار چێوەیە؟ ئایا دەبێ بۆ نمونە بەرەو دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا بمانبات ؟ لە چوار چێوەی مێژوویی ئەمڕۆماندا، واتا لەچەرخی دابەش بوونی نەتەوایەتیو داگیرکردنی زایۆنیزمو خۆسەپاندنی ئیمپێریالیزم، شۆڕشی عەرەب ناتوانێ ببێ بەشۆڕشی چینێك، بەڵکو پێکهاتوە لەشۆڕشی نەتەوەیەك دژی واقعێکی دواکەوتو و دابەشبوو و ئیستیغلال

کراو....لەڕوانگەی بەعسەوە، چەمکی نەتەوە لەقۆناغی شۆڕشگێڕیدا، ئەو تاکەکەس و توێژو چینە شۆڕشگێڕانە دەگرێتەوە کەکەرەستەی شۆڕشن و مەبەستیشمان لەمیللەت ئەو جەماوەرە گشتی و ڕێکخراوەیە کەبنچینەی شۆڕش پێکدێنن. کاتێك کە لەناو ئەم چوار چێوەیەدا، چینی کرێکار بەچینێکی سەرەکی دەژمێردرێ، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی کە بەهەر شێوەیەك بێ، ڕۆڵێکی مەرکەزی هەیە....لەناو شۆڕشی عەرەبدا کەپێکهاتوە لەیەکێتی ئەو چین و توێژو خەڵکانەی کەکاردەکەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی "[٤٤].

ئەم شێوە بیرکردنەوەیە بیروباوەڕی بەعس ڕوون دەکاتەوە کەدەیەوێ نازناوی سۆسیۆلۆژی و سیاسی جەماوەری چەوساوە بەکێشەی نەتەوەوە بلکێنێ. بۆ بەعس جەماوەری چەوساوەی عەرەب بەم شێوەیە دەردەکەوێ چونکە کیانێکە کە لەناسیۆنالیزمی عەرەبی جیاناکرێتەوە. بەواتایەکی دیکە، خەباتی ئەم جەماوەرە دژی بورژاو سەرمایەداری، لەڕاستیدا خەباتی نەتەوەیە بۆ یەکێتی و دژی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم. بەعس کە خۆی دادەنێ بەنوێنەری "جەماوەری چەوساوەی عەرەب کە بریتییە لەڕاستی (حەقیقەتی) نەتەوە لەدۆخە پوختە کەیدا"[٤٥]، وەك ناوك و جەوهەری ئەم خەباتە تەماشای خۆیشی دەکات. لێرەدا خەبات بۆ یەکێتی دەبێ پێش هەموو شتێك خۆی بسەپێنێ بەسەر "سەرجەم فۆرمەکانی پێناسە" و دەبێ "نەتەوەی ئینتێگرال" ئەو نەتەوەیە بێت کەسەرجەم ئێلێمێنتە پێکهێنەرەکانی ملکەچ بن بۆ ئەم پێوسیتیە بێ هاوتایە. ئەگەر نا، چۆن دەتوانرێ تەحەمولی هەڵوێستی کەسێك یان چینێك بکرێ کە نایەوێ سەر دابنەوێنێ بۆ یاساکانی ئەم پێداویستیە. کەواتە سۆسیالیزمی بەعسی، سۆسیالیزمی "گشتە"( بە واتا هێگلیەکەی) کەخۆی بەسەر "بەشەکاندا" دەسەپێنێ و بەدەسەڵاتەوە ڕەفتار دەکات بۆ نەهێشتنی هەموو سنورێکی ئابوری و ئاینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئێتنیکی لەخزمەتی یەکێتی نەتەوەی عەرەب.

**شۆڕشی بەعسی:**

ناوەڕۆك‌و پوختەی "پەیامی هەمیشەیی عەرەب" کەبریتیە لەبنیادنانی "کۆمەڵگای بەعسی" و بنچینەکەی پێك هاتوە لەسێ کوچکەی یەکێتی‌و ئازادی‌و سۆسیالیزم، دەتوانێ لەڕێگەی کرداری شۆڕشگێڕانەوە بێتە دی. بەعس کەدەیەوێ بۆ بەدیهێنانی ئەم پەیامە کاربکات، دەبێ ئامرازێك یان ڕێگایەك بدۆزێنەوە بۆ مسۆگەر کردنی. بیرکردنەوە لەئامانجێك، هەمیشە فەرزی هەڵبژاردنی گونجاوترین ڕێگادەکات بۆ گەیشتن بەم ئامانجە. بەواتایەکی دیکە، بەدیهێنانی "پەیامی نەمر" دوو شێوە ئایدیۆلۆژیای پێویستە، واتا دوو ئایدیۆلۆژیای بەیەکەوە بەستراو کە لەنێوانیاندا پەیوەندیەکی هاوبەش هەبێ: "ئایدیۆلۆژیای ئامانجەکان"( یەکێتی، ئازادی سۆسیالیزم) و"ئایدیۆلۆژیای ئامراز" ( ئەو ئامرازانەی کەدەبێ بەکار بهێنرێن بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجانە)[٤٦]. بەلاّم بۆ ئەوەی ئەم دوو جۆرە ئایدیۆلۆژیایە بخەینە کارو پاساوی بکەین ، پێویستە ماف بدەین بەخۆمان بۆ نوێنەرایەتیەکی بێ هاوتا، واتا دەبێ بەگوێرەی "ئیمپێرەتیڤی کە تێگۆریکی" نۆرم ویاسای ئەخلاقی‌و کۆمەلاّیەتیەکانی نەتەوە ئەرکی بەرپرسێتی‌و شەرعیەتی ئەم نوێنەرایەتیە هەڵ بگرین. ئایدیۆلۆژیای بەعس بۆ پاساوی ئەمە پێش هەموو شتێك دەستدەکات بەپێناسە کردنی خۆی:

یەکەم، پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست پارتێکی شۆڕشگێڕەو " دەیەوێ جۆرێکی نوێ لەکۆمەڵ دروست بکات" [٤٧]. دوهەم ،پارتی بەعس "باوەڕ دادەنێ بەمەرجێکی سەرەکی شۆرش"[٤٨]. سێهەم، پارتی بەعس تەنها دیدگایەکی ئێتیکی نییە بۆکۆمەڵ، بەڵکو خاوەن تێڕوانینێکی فەلسەفی گشتیشە، واتا سنوور دادەنێ بۆ شێوەی بینینی هۆی ژیان‌و دیاردەکانی‌و واتای ژیان‌و ئەخلاقی مرۆڤ[٤٩]. چوارهەم ،بەعس پێك هاتوە لە "بزووتنەوەیەك کە لەدڵ‌و ناخی عروبەو قولاّیی خاکی عەرەبەوە سەری هەڵداوە"[٥٠]. پێنجەم، "پوختیی جەوهەر" ڕێگا دەدات بە بەعس نەك تەنها

نوێنەرایەتی نەتەوەی عەرەب بکات، بەڵکو ڕەفزی گشت هەوڵ و تەقەللایەکی لۆکاڵ یان لاوەکی یان شەخسی دەکات کە ئەم نوێنەرایەتیە پەسەند نەکات[٥١].

ئەم پرۆپیدیتیکە (propaedeutic) عەفلەقیە هاوبەشی دەکات لەدروست کردنی چوارچێوەی ئەخلاقی و سنوور بۆ ئەو پەروەردە بنچینەییە دادەنێ کەسەدام حوسەین بەپەرۆشەوە کەڵکی لێ وەردەگرێ. بەم بۆنەیەوە سەدام دەڵێ: "هەر چۆنێک بێت، وابزانم بەعس ڕۆحی پوختی نەتەوەیەو نابێ عەرەبێک، هەرکەسێک بێت، بەبێ باوەڕ بەڕۆحی ئەم نەتەوەیە ژیاندەوەی نەتەوەیی و پێشکەوتنی شارستانی بێنێتە دی "[٥٢]. بەم شێوەیە، بەعسی عەفلەقی کە ئایدیۆلۆژیای بەعس بە"مایکرۆکۆزمی" یان "وێنە بچوکی"(صورة مصغرة) ئەو نەتەوە "پاک و پوختە" دادەنێ [٥٣] و ئەوەی سەدامیش کە دایدەنێ بە "ڕۆحی پوختی نەتەوە" دەڕژێنە هەمان دەریا کە لەخۆشەرعی کردندا، دەبێ بە خۆ شەرعی کردن خۆی لەخۆیداو بۆ خۆی ئەگەر بمانەوێ شێوە زاراوەیەکی هێگل بەکار بهێنین. لەڕاستیدا، لەم ڕوانگەیەوە بەعس خۆی دادەنێ بەنوێنەری خولوقی و سیاسی نەتەوەی عەرەب و بەبێ پرس خۆی هەڵدەبژێرێ بۆ نوێنەرایەتی و خۆی دەکات بە"پارتێکی گەردونی"[٥٤] (. . .) و بەرپرسێتی بەخۆی دەدا بۆ خستنەکاری "ئایدیۆلۆژیەی ئامرازەکان لەپێناوی بەدیهێنانی ئایدۆلۆژی ئامانجەکان"

ئێستا بابزانین بەعس چۆن ئایدیۆلۆژیای ئامرەزەکان دەخاتە کار بەواتایەکی دیکە بەعس چۆن ئایدیۆلۆژیای شۆرش دەخاتە کار؟. پێش هەموو شتێک نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کەهیچ چەمکێک بەئەندازەی چەمکی "شۆڕش" بەشێوەیەکی وا تیکەڵ و پێکەڵ لەلایەن ئایدیۆلۆژیە سیاسیەکانەوە بەکار نەهێراوە. نامانەوێ لێرەدا حوکمێکی لایەنگیری یان پێناسەیەکی زاراوەیی بدەین بەوشەی" شۆرش". ئەمە، بێ گومان، لەسنووری بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە نییەو دەچێتە دەرەوەی ئەم سنورە. بەلام دەمانەوێ تەنها ئەوە شیبکەینەوە کە لەسەر ڕێژەی ئایدیۆلۆژی بەعس مەبەستی لەشۆڕش چیە؟

لەسەر ئاستی سیاسیو پراکتیکدا، هەر وەك یاسا ناسو پسپۆڕی زانستی سیاسی مۆریس دیوڤیرژێ Maurice Duverger ئاماژەی پێ دەکات، دەتوانرێ دوو جۆر لەشۆڕش جیا بکرێتەوە: " ئەو شۆڕشەی کە سوود لەهێزی میللی وەردەگرێ" و ئەو "کودەتایانەی کەهەوڵ دەدەن خۆیان بەشۆڕش لەقەڵەم بدەن"(٥٥). یەکەمیان بریتییە لەکردەوەی جەماوەر لەپلەی خواروی کۆمەڵەوە: ئەم جەماوەرە کە لەلایەن باوەڕێکی تایبەتیەوە دەهێژێنرێو لەبارو دۆخێکی دژوار یان لەقەیرانێکی ئابووری فرسەت دەهێنێ و دەڕژێتە ناو شەقامەکانو شوێنی کارگێڕیو سیاسی حەساس داگیر دەکاتو لەئەنجامدا دەبێتە هۆی هەرەس هێنانی دەزگاکانی دەوڵەت. نوێنەری ئەم جەماوەرە پێکهاتوە لەچینێکی هەڵبژاردەی سیاسی( ئێلیت) کەپاش ئەوەی دەسەڵات دەگرێتە دەست، هەوڵ دەدات ویستو خواستی جەماوەرەکە بێنێتە دی. ئەمەیە بۆ نمونە حاڵەتی شۆرشی فەرەنسی، ئینگلیزی، روسی .. هتد.

دوهەم جۆر، بەرهەمو ئەنجامی کرداری گروپێکی بچوکە کە بەبێ پشتگیری جەماوەر هەوڵ دەدات لەسەرەوە خۆی بەسەر دەزگاکانی دەوڵەتدا بسەپێنێ. هەر لەسەرەتاوە ئەم گروپە بەهۆی رێکخراوی نهێنیەوە چەند ئۆپێرەسیۆنێکی سەربازیی دەکاتو لغاوی دەسەڵات دەگرێتە دەست. ئەم گروپە کەپێك هاتوە لەکەمایەتیەك، دەتوانێ پارتێکی سیاسی خاوەن ئایدیۆلۆژیایەك، یاخود گروپێکی بچوکی سەربازیی بێت. پاش ئەوەی دەسەڵات دەگرێتە دەست، ئەم گروپە هەوڵ دەدات ئایدیۆلۆژیای خۆی بەسەر کۆمەڵدا بسەپێنێ. لەمێژووی کۆمەڵاندا نمونەی ئەم گروپانە لەجیهاندا زۆرنو تەنانەت ئەمڕۆش زۆربەی زۆری ڕژێمە سەربازیو پارتە خاوەن ئایدیۆلۆژیە توندڕەو و توندوتیژەکان دەگرێتەوە.

دەتوانین دەربارەی مەبەستی ئایدیۆلۆژیای بەعس لەباس کردنی زاراوەو پراکتیکی شۆرشدا چی بڵێین؟

پێش هەموو شتێك مەبەستی بەعس کەتێگۆری دوەم دەگرێتەوە. یاخود دەتوانین شۆڕشی بەعسی بەگوێرەی لۆژیکی شۆڕش بەلای نازیزیەتی ئەڵمانیەوە پێناسە بکەین.

دەتوانین واتای شۆڕشی بەعسی بگوێزینەوە ( ترانسپۆزە بکەین) بۆ ئەوەی هەروەك پییێر ئایسۆبێری (Pierre Aycoberry ) مێژوونیاسی فەرەنسیو پسۆڕی نازیزم دەڵێ بەبۆنەی نازیزمی ئەڵمانیەوە، واتا دەتوانین ئەم مەبەستەی شۆڕش لەلایەن بەعس بدۆزینەوە لەناو ئەو گوزارشتانەی کەئایسۆبێری بەکاری دێنێ بەبۆنەی شیکردنەوەی لۆژیکی شۆڕش لەلای ناسیۆنال سۆسیالیزمی ئەڵمانیەوە: پییێرئایسۆبێری دەڵێ "بە پێچەوانەی سکێمە کلاسیکیەکانەوە، شۆرش ( لەلای نازیەکان) نەك پێش گرتنەدەستی دەسەلأت بەڵکو پاش ئەوە دێتە کایەوە "(٥٦). بەعس دەیەوێت لەپێشدا "ئیلیمێنتەکانی پەیڕەو لەڕێگەی کودەتاوە هەرەس پێ بێنێ " و دواییش کار بکات بۆ بەرپاکردنی"شۆڕشێکێ بەردەوام" :"شۆڕشێك لەسەرەوە"، دواییش دەستکردن بە "شۆڕش لەخوارەوە". زیاتر لەوەش، "شۆڕش لەتەنها یەك وولأتدا، خۆی لەخۆیدا ئامانجێك نییە، بەڵکو ڕێگەیەکی خەباتە بۆ گرتنە دەستی دەسەلأت لەهەموو وولأتە عەرەبیەکاندا. بەم شێوەیە "شۆڕش لەتەنها ولأتێکدا" دەبێ بەبنچینەیەکی "شۆڕشی بەردەوام" کە ئامانجەکەی یەکگرتنەوەی بەشەکەکانی تری نیشتمانو نەتەوەی عەرەبە. ئەم لۆژیکە، لەڕاستیدا، ئەوە دەردەخات کەپارتی بەعس لەسەر ڕێژەی ئایدیۆلۆژیدا دان بەبوونی ولأتە عەرەبیەکاندا نانێو وەکو کیانێکی سیاسی سەربەخۆیان لەقەڵەم نادات، بەڵکو بەچەند ناوچەیەکی جوگرافییان دادەنێ کەگشت پێکەوە یەکێتییەکی نادابەشکراوی نیشتمانی عەرەب پێکدێنن . ئەنجامی ئەم لۆژیکە، بەشێوەیەکی ئیمپێرەتیف ئەم جیهانبینیەی خوارەوە دروست دەکات: کاتێك کە لەولأتێك ( یان وەك بەعس ناویان دەبا بە"هەرێمێك" یان "ناوچەیەك" ) دەسەلأت دەگرێتە دەست، "شۆڕشەکەی" بەبێ مەرجو بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەبێ بەناوەندی ولأتە عەرەبیەکانی ( هەرێمە عەرەبیەکانی، ناوچە عەرەبیەکانی) دیکە. ئەرکی بەعس ئەوە دەبێ کەسەرجەم ولأتە عەرەبیەکانی دیکە ڕزگار بکات یان ئازادیان بکاتو بیان کات بەیەك چونکە هەر وەکو ئاماژەمان پێکرد ئامانجی بەعس بنیادنانی تەنها دەوڵەتێکی عەرەبیە لەژێر کاریگەریی یان لەڕێگەی تەوژمی شۆڕشەوە.

دەتوانرێ ئاکاری پراکتیکی ئەم هەڵوێستە تیۆریە لەهەڵسوکەوتی ڕژێمی بەعسی عیراقی دا تێبینی بکرێ. یەکسەر پاش هاتنی بۆسەر حوکم لەساڵی ١٩٦٨، حکومەتی بەعسی عیراقی، لەرێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنو پڕوپاگەندە، دەستی کرد بەباس کردنو داواکردنی یەکێتی عەرەبو بەرز کردنەوەی بەیداغی "شۆرشی بەردەوام" ( الثورة المستمرة). هەرخێرا خۆی دانا بەپێشڕەوی "شۆرشی عەرەب" لەپێناوی یەکێتیداو بەم بۆنەیەوە داوای لەجەماوەری عەرەب کرد کەخۆیان لەرژێمەکانیان رزگار بکەنو کاربکەن بۆ گۆرێنی کۆمەڵگەی عەرەبیو گرتنە رێی کۆمەڵێکی سۆسیالیستو دیمۆکراتیکی ڕاستەقینە[٥٧]. بەم شێوەیە ڕژێمە عەرەبیەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ، بەئاشکرا یاخود بەشێوەیەکی شاراوە ناوەناتۆرەی "کۆنەپەرست" ، "ریفۆرمسیت"، "ناوچەگەر" یاخود "ئێلیتیست" یان لێنرا. بۆنمونە، عەرەبی سعودی وەکو "سەرکردەی کۆنەپەرستە عەرەبەکان" لەقەڵەم دراو وڵاتەکانی کەنداو وەك قەڵای ئیمپیریالیزمی ئەمریکیو حکومەتی ناسر وەك رژێمێکی " ئێلیتیست"،" بیرۆکراتیك"،" بەزەبرو زەنگ" و دوور لە جەماوەری گەلو حکومەتی سوری وەك "گەورەترین دوژمن" کەدەبێ سەرکردایەتیەکی ڕاستەقینە جێگەی بگرێتەوە، هتد. . .[٥٨]. لەکۆنگرەی هەشتەمی ساڵی ١٩٧٤ کە لەبەغدا بەسترا، پارتی بەعس رایدەگەیاند کە "ستراتیژیەتی پراکتیکی" رێکخراو ئەوەیە کە"ڕاپەرینێك لەبەشێك لەبەشەکانی نیشتمانی عەرەب بەرپا بکات " بۆ ئەوەی "سنوری ناوچەیی" نەهێڵێو دواییش تەشەنە بسێنێ "تا رزگار کردنی تەواوو بەدیهێنانی یەکێتی"[٥٩]. ناردنی شۆڕشی بەعسی بۆ دەرەوە دەبوایە بەگوێرەی ئەم پرینسیپەی خوارەوە کاری بکردایە: "پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست، پارتی شۆڕشی عەرەبە. لەو شوێنەی کەبوونی هەیە، خەبات دەکات لەچوار چێوەی ئەم شۆڕشە...( پارتی بەعس) تەنها پارتێکەو تەنها یەك سەرکردایەتی هەیە: سەرکردایەتی پان عەرەب... لەوشوێنەی کەبوونی هەیە، واتا لەفۆرمی ئۆپۆزیسیۆنێکی نهێنی بێت یاخود لەسەر حوکم بێت ، ئامانجی سەرەکی چالاکیەکەی

ئەوەیە کەسەرکردایەتی شۆڕشـی عـەرەب بـەگوێرەی ئامانجـە مێژووییـەکانی بکـات کەپێکهاتون لەیەکێتی، ئازادی، سۆسیالیزم"(٦٠).

لەساڵی ١٩٨٠ سەدام حوسین جاڕی ئەوەی دەدا کەشۆڕشی بەعس "پرۆسەیەکی بـێ کۆتاییە" و تاکی بەعسی دەبێ بزانێ کەئەرکەکەی ناوەستێتە سـەر تەنـها پاراسـتنی شۆڕش‌و دانانی ئەم شۆڕشە تەنها لەچوارچێوەی دەوڵەتی عـێراقدا: ئـەرکی نەتـەوەیی عەرەب چاوەڕوانی دەکات لەهەموو شوێنێکی نیشتمانی عەرەب. نابێ هـەرگیز لـەبیر بچێتەوە کە ئێمە شۆڕشگێڕی عیراقی ساکار نـین "ئێمـە شۆڕشـگێڕی تـەواوی گشـت نەتەوەین"(٦١). وەك "شۆڕشگێڕو سەرکردەی میللەت(. . .) ئێمە بەشێکین لەو نەتـەوە گەورەیەی کەشۆڕشەکەمان دەبێ بۆی ببـێ بـەمۆدێلێك کەهـەموو کـەس بەدوایـەوە بڕوات".

نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە وەك ڕەنگدانەوەی ئەم جیهانبینیە حکومەتی بەعسـی عیراقی هەر لەوکاتەی دەسەڵاتی گرتە دەست، خۆی بەڕزگارکـەری نیشـتمانی عـەرەب داناو لەخەوی بیری گـەورەیی ئیمپراتۆریـەتدا دەیوسـت عـیراق بکـات بەقـەڵای ئـەم ئیمپراتۆریەتە. بۆ ئەوەی عیراقیەکان ڕازی بکات سەبارەت بەو ڕۆڵە مێژوویەی بەعس‌و دەوڵەتی عـێراقی دەیـانبینی لەبەدیـهێنانی یـەکێتی عـەرەبدا، هـەولێ دەدا هـەموو سنورێکی ئێتنیکـی‌و ئـاینی نـەهێڵێ لـەنێوان نەتـەوەو کەمایـەتی‌و ئـاینزان‌و ئـەو میللەتانەی کـە کۆمـەڵی عـیراقی پێـك دێنـن‌و لـەناو بۆتەقـەی نەتـەوەی عـەرەبدا بیانتوێنێتەوە. هەر لەساڵانی یەکەمـــەوە پێناسـەی سیاسـەتی خـۆی کـرد بەرامبـەر نەتەوەو ئاینن‌و کەمایەتیە عیراقیەکان (بەتایبەتی بەرامبەر نەتەوەی کورد). بـۆ ئـەم مەبەستە پشتی بەمادەی حەوتەمی دەستوری بەعسی ساڵی ١٩٤٧ بەسـت: "تیـۆری ناسیۆنالیزم دەڵێ سنوری ژووررووی عەرەب لـەزنجیرە شـاخەکانی تۆرسـەوە دەسـت پـێ دەکات‌و ئەو زەویەی کەکەوتۆتە خواروی ئـەم زنجیرەیـەوە، خـاکی عەرەبـەو (ئێسـتا) چەند میللەتێك تیایدا دەژین کە کەمایەتین لەنیشتیمانی عـەرەبداو هیـچ دوور نییـە کەئەمانە دوور بخرێنەوەو رابگوێزرێنەوە بـۆ پشـتی ئـەم سنورە ئەگـەر هـاتو بوونـە

سەرچاوەی دروست کردنی کێشە بۆ نەتەوەی عەرەب"[٦٢]. لەهەوڵ دانیا بۆ "بەهارمۆنی کردنی" کورد لەگەڵ پان عەرەبیەتی بەعسیدا، میشێل عەفلەق لەساڵی ١٩٦٩ لەبەغدا هەوڵو تەقەللای ئەوەی دەدا کە نەك تەنها شەرعیەتی داخوازیە کولتوری‌و سیاسیەکانی میللەتی کورد حاشا لێبکات، بەڵکو لەڕێگەی چەند باسو دوانێکی ساکار، دەیویست ڕەگەزی کوردیش بکات بەعەرەب‌و ئۆباڵی هەڵگێرانەوەی کورد لەعەرەب‌و جیاوازیان لەعەرەب بگەڕێنێتەوە سەر کۆلۆنیالیزم. بەم بۆنەیەوە عەفلەق دەیگوت: "بۆچەند سەدەیەك، لەکاتێکدا کەوڵاتە عەرەبیەکان تەنها یەك دەوڵەت بوون یاخود چەند دەوڵەتێکی عەرەبی ئیسلامییان پێك دەهێنا، کوردەکان هاونیشتمانی عەرەبی موسوڵمان بوون‌و بەبێ جیاوازی وەکو ئەوان بوون. (بەڵام) ئەمڕۆ وولاتە کۆلۆنیالیستەکان دەستیان کردوە بەدروست کردنی جیاوازی لەنێوان عەرەب‌و کوردو دەستیانکردووە بە لێکۆڵینەوە سەبارەت بەتایبەتمەندی مێژوویی‌و زمانی‌و ئێتنیکیان"[٦٣].

سەدام حوسەین کاتێك کە "چەمکی مۆدێرنی نەتەوە" پێناسە دەکات بەگوێرەی " تێڕوانینی شۆڕشی تەموزی ١٩٦٨"، دووپاتی دەکاتەوە کە "کوردە عیراقیەکان بەشێکی تەواوی نەتەوەی عەرەبن" [٦٤] و بۆ ئەوەی پێناسەی فرەنەتەوەیی عیراقیەکان بتوێنێتەوە لەناو ناسیۆنالیزمی پان عەرەبیدا دەڵێ: " عیراقیە نوێکانی (ئەمڕۆ) بریتین لەعەرەبی نوێ)[٦٥].

ئەم هەڵویستە تەنها یەك لایەنی سیاسەتی تواندنەوەی حکومەتی بەعسی پیشان دەدا. لایەنەکەی تریشی دەستی رادەکێشا بۆ سەر تێکدان‌و گۆڕینی مێژووی کۆنی میزۆپۆتامیاو هەوڵی دەدا لەگەڵ زەوقی پان عەرەبیەتی پارتی بەعسدا بیگونجێنێ. لەساڵی ١٩٧٨ بەبۆنەی ئامۆژگاریەکانی بۆ مێژوو نووسان، سەدام حوسەین دەی گووت: " لە دیدەو شێوەی نووسینەوەی مێژوو، پێویستدەکات کە (...) مێتۆدێکی بەعسی بەکار بهێنین"[٦٦]. هەر لە ساڵی ١٩٧٥ پاڵی بەسەرجەم مێژوونووس‌و نووسەرو هونەرمەندو هۆنراوەبێژو، هتد.. دەنا کە نەك تەنها دانیشتوە کۆنەکانی

میزۆپۆتامیا بکەن بەعەرەب، بـەڵکو بەرهەمەکانیشیان بلکێنـن بـە وێنـەی(. . .) شۆڕشـی بەعسـیەوە. بـەم شـێوەیە تـەموزی (خـوای بـەپیتی تـەموز) میتۆلــۆژی میزۆپۆتامیا، بۆ نمونە، دەلکێـنرا بـە شۆڕشـی تـەموزی ١٩٦٨ەوە. "ئەگـەر چـاوێك بخشێنین بەڕووداوەکانی مانگی تەموز لەوڵاتەکەماندا، تێبینـی دەکـەین کەچـەندەها شۆڕش بەدوای یـەکدا هـاتوون بۆخۆشـی میللەتـە خۆشەویستەکەمان(. . .). ئەمـە یەکەم بزووتنــەوەی ئـازادی خـواز دەگرێتـەوە دژی خۆسـەپاندنی بێگانـە لـەعیراقدا، لەکاتێکدا یەکەم پاشای سۆمەری (ئەلوەرکا ئوتو هێگال)(. . .) دەستی دایە ڕاپەڕین لەساڵی ٢١١٦ ی پێش زاینی دژی داگیرکەرە بێگانەگان(. . .). لەوەدەکات کەتــەموز مانگێکی بەختەوەرە بۆ داهاتوی عیراقیەکان چونکە (هەروەها) مانگی تەموز مانگی خوای تەموزیشە"[٦٧]. لەهەوڵ دانیدا بۆ دروست کردنی پردێـك لـەنێوان سـۆمەری و ئەکەدی و بابلی و ئاسـوریەکان..هتـد. و "عیراقیـە نوێکـان" لەلایەکـەوە و لـەپێناوی لکاندنی ئەم "عیراقیە نوێیانە" بەمێژووی نەتەوەی عەرەبی پێش ئیسلامدا لەلایەکی ترەوە، سەدام حوسەین دەی گوت:" مێژووی نەتەوەی عـەرەب لەئیسلامـەوە دەسـت پـێ ناکات، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی کۆن. سـەرجەم ئـەو شارسـتانیەتە سـەرەکیانەی لەنیشتمانی عـەرەب سەریان هەڵداوە، هەموویان گوزارشتیان لەکەسایەتی ڕۆڵەی ئـەم نەتەوەیە کردوە کە لەیەك سەرچاوەوە پەیدا بووە"[٦٨]. بۆ ئەوەی نازناوی عیراقیش مـل کەچ پێ بکات بۆ مەیلی پان عەرەبیەتی ئایدیۆلۆژیای بەعسـی، سـەدام سڵی لـەوە نەدەکردەوە کەبڵێ: تەنانەت "ئەگەر ئەم شارستانیەتە کۆنانە تایبەتمەندی دانیشـتوانی ڕەسەنی خۆشیان هەبوو بێ، بەڵام دەبێ بوترێ کەکەسایەتی نیشتمان هیچ بەهایـەکی نییە ئەگەر بەراوردبکرێ بەکەراکتەری بەگشتگرترو تـەواوتری پـان عـەرەبیـەت"[٦٩]. لەڕێگەی لێشێواندنی مێژوو و ڕوداوە مێژووییەکان، ئەم هەڵوێستە گوزارشتی دەکـرد لە "عـەرەباندنی دانیشتوە کۆنەکانی ئەوەی کەبەعس پێی دەڵـێ نیشـتمانی عـەرەب. هەوڵ دەدرا عـەرەبایـەتی ئـەم دانیشـتوانە پاسـاوی ئـەوەبێت کەئەمانـە لەبنچینـەدا لەڕەگەزی سامیی بوون یاخود بابڵێین عـەرەب بوون[٧٠].

پاش ئەوەی کێشەی ڕەسەنی سامیی، واتا( بە گوێرەی دیدەی بەعسی) عەرەبی ئەم میللەتانەی میزۆپۆتامیای حەل دەکرد، حکومەتی بەعسی عیراقی هەوڵی دەدا گشت کەمایەتیو میللەتانی دانیشتوانی عیراق بەرەو ڕێگەی ناسیۆنالیزمی خۆی (عەرەب) بەرێو عیراق وەك پێگەی پێشکەوتنو شارستانیەت نیشان بدات، لەبەرئەوە مافی ئەوەی هەیە کەببێتە پێشەوای گشت نەتەوەی عەرەب[٧١]. بەم شێوەیە، میزۆپۆتامیا، دەبوو بە سەنتەری "شارستانیەتی نەتەوەی عەرەبو دایکی شارستانیەتە کۆنەکان"[٧٢] دەبوایە بەشێوەیەکی پێویست جارێکی تر ئاوەدان بێتەوەو تیشکی پێشکەوتنو شارستانیەت بەسەر باقی نیشتمانی عەرەبدا پەخش بکاتەوە. قەناعەتی بەعسی سەبارەت بەوەی کە بەرپرسێتی باوکانەی هەیە بۆ داکۆکی کردن لەنەتەوەی عەرەب، لەڕاپۆرتێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا بەهەمان شێوە دەردەکەوێ کە لەساڵی ١٩٧٨ دا پاش ڕێککەوتنامەی کامپ دەیفید بڵاوکرایەوە: لەو ڕاپۆرتەدا، دەوترا "ئەوە ڕوونە کەگۆڕەپانی عەرەب چاوەڕوانی سوارێکی خەباتگێڕ دەکات کە بتوانێ بەرپەرچی هەموو بەرهەڵستکاریەك بداتەوەو تاریکی ڕووناك بکاتەوەو و ناخۆشی کەم بکاتەوە(...). لەهەموو شوێنێك چاوەکانی میللەتی عەرەب تەماشای ئەو شۆڕشە گەورەیەت دەکەن لەم ناوچەیەدا (عیراق)(...). پێویستە کەپارتو شۆڕشەکەت پێشکەون بۆ ئەوەی بەرپرسێتی مێژوویی بگرنە سەرشانی خۆیانو قورسایی مێژووی عیراقی کۆنو نوێ هەڵبگرن بۆ بەرگری کردن لەشەرەفی نەتەوەی (عەرەب)(...). هەر لەکۆنەوە عیراق بایەخی داوە بەخەبات دژی زایۆنیزمو ئازادکردنی فەلەستین، ئەمە هەر لەسەردەمی ئاسووریو بابیلیەکانەوە، هەرلەسەردەمی سەلاحەدینو شەڕی ١٩٤٨ و ئۆکتۆبەری ١٩٧٣ ەوە تا دەگاتە ئەمڕۆ"[٧٣].

بێ گومان دەتوانرێ ئەمە وەك بەرپەرچدانەوەیەك بەرامبەر کێشەی فەلەستین تەماشابکرێ، بەڵام ئەگەر بەتێکڕایی هەڵسوکەوتی بەعس هەڵبسەنگێنین، تێبینی دەکەین کەجگە لەهەندێ ئیعتباراتی سیاسی کە پەیوەندیان بەکۆنتێکستی ئێستاوە

هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا جیهانبینیی بەعس مەرجی یەکەمی هەڵسوکەوتی عیراقیە.
ئەگەر ئەوە ڕاست بێت کە ئەمە بەرپەرچ دانەوەی هەڵوێستی هەندێ وڵاتی عەرەبە بۆ مەسەلەی فەلەستین لەوکاتانەداو ڕژێمی عیراقی هەڵوێستێکی زۆر ڕەقی هەبێت دژی ئیسرائیل، ئەوەش ڕاستە کە حکومەتی بەعسی عیراقی هەمیشە هەڵویستی نەرمی وولاتە عەرەبیەکانو کێشەی فەلەستینی لەبەرژەوەندی پان عەرەبیەتی خۆی بەکارهێناوە. لەزۆر بۆنەداو پاش دەسەڵات گرتنە دەست، بەعسی عیراقی ئازادکردنی تەواوی فەلەستینی بەئازاد کردنی هەموو نیشتمانی عەرەبەوە بەستەوە. لەزۆر بۆنەداو پاش گرتنە دەستی جڵەوی دەسەڵات، بەعس بەشێوەیەکی سیستێماتیك ئازاد کردنی تەواوی خاکی فەلەستینی دەبەستەوە بەسەرجەم نیشتیمانی عەرەب. ئەوە زانراوە کەهەر لەساڵی ١٩٦٩ وە ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر لەسەر زمانی بەعسەوە جاڕی دەدا: "(ئەرکمان ئەوەیە) میللەتی عەرەب لەهەموو شوێنێك ئازاد بکەین. کۆلۆنیالیزم نابێ بمێنێ نەك تەنها لەفەلەستین بەڵکو(. . .) لەگشت وڵاتە عەرەبیەکان. بەم شێوەیە دەبێ ئاگری شۆڕشی عەرەب بەربەینە هەموو نیشتمانی عەرەب"[٧٤]. کاتێك کەنەبوخوژنەسر دەکرا بەوێنەیەکی مێژوویی کەتوانی زاڵ بێت بەسەر "ئەو ئیلیمێنتانەی کەهەوڵیان دەدا خاکی عەرەب وێران بکەنو ( توانی) بە کەلەبچەیی بیانهێنێ بۆ بابل" ، سەدام حوسەین لەساڵی ١٩٧٩ دەی گوت: "ئێوە نابێ هیواتان تەنانەت ئەوەبێت کەعیراقێکی بەهێزو دەوڵەمەند دروست بکەن، بەڵکو دەبێ هەروەها ڕۆڵێکی سەرکردەیی پان عەرەبی بێهاوتاتان هەبێ بۆ ئازاد کردنی نەتەوەی عەرەب"[٧٥]. لەوتەیەکیشدا بۆ ئەفسەرانی هێزی سەربازیی لەساڵی ١٩٨٠ دەیگوت: " لەعیراقدا زۆر توانا هەیە کەوامان لێ دەکات ببین بەسەنتەری ڕووناکی بۆ نیشتمانی عەرەب(..). زۆر پێویستە کەفرسەتی مێژوویی بقۆزینەوە بۆ ئەوەی ئەو ڕۆڵە مێژووییە ببینین کە باوباپیرانمان بۆ خزمەتی نەتەوەو مرۆڤایەتی کردویانە"[٧٦].

پاش ئەم شیکردنەوەیە لەسەر واتای شۆڕش بەگوێرەی دیدەی بەعسی، نابێ بەراستی چاو پۆشی لەوە بکرێ کە بانگەشە کردن بۆ جەنگ بەناوی "شۆڕشی جەماوەری

عەرەب" یەکێکە لەپێکهاتــە بنچینیـەکانی ئـەم ئایدیۆلۆژیایـە. دەبـێ بوتـری کـە لەجەوهەریدا، ڕژێمی بەعسی باوەڕ ناکات نە بەئاشتی نەبەو هەلومەرجو بارودۆخانەی کە دەیڕەخسێنن. چۆن دەتوانرێ ،بۆ نمونــە، هـێرش بـۆ سـەر کوەیـت لەسـاڵی ١٩٩٠ شیبکرێتەوە. جگە لەزۆر هۆکاری ستراتیژیو ئابوریو سیاسیو مێژوویی..هتد.، داگیر کردنی کوەیت لەناو چوارچێوەی لۆژیکی هێرشبەری ناوەرۆکی فەلسـەفەی بەعسـەوە دەخوێنرێتەوە. دەتوانرێ پرسیار بکرێـت: ڕژێمـی عـیراقی چـۆن داگـیرکرنی دەوڵـەتی کوەیتــی ناونــا؟ نــاوی نــا "شۆڕشــی کوەیتــی"، "شۆڕشــی جـەماوەری عـەرەب دژی ئیمپێریالیزم"، یاخود " یەکێتی پێکـەوەنان" ( الوحـدة الاندماجیـة). ئـەم زاراوانـە، لەبنچینەدا، ڕەنگدانەوەی هەڵویستی بەعسن بەرامبەر "یەکێتی عەرەب"، "شۆڕشـی بەردەوام"، " شۆڕشی بەعسی" و فۆرمولەی بەعس ڕوون دەکەنەوە: "من المحيـط الى الخليج". حکومەتی بەعسی عیراقی ئەگەر وازی لـێ بهێنرایـە چـۆن هەڵسـوکەوتی دەکـرد ؟ لەبـەجێ هێنـانی پرینسـیپی "پـەیامی نــەمر" بــەردەوام نــەدەبوو ؟ بەسەراسەپێنەرەکانی تۆتالیتاری هەمیشە هەوڵیان داوە بـارو دۆخ بگـۆڕن لـەپێناوی گەیشتنە ئامانجە یوتۆپیەکانیان. بەڵام ئەگەر توانیبێتیان بـارودۆخ بگـۆڕن، هـەرگیز لەبەدیهێنانی ئامانجەکانیان سەرکەوتو نەبوون.

هەوڵدان بۆ "پێکەوەنانی" کوەیت جیاناکرێتەوە لـەبیرو سیاسـەتی "پێکـەوەنانی" بەعسیو ئەم هەڵوێستانە لەمێژووی دەوڵەتاندا نوێ نین.

**ئۆکیسمۆرۆنی oxymoron بەعســی: ناسـیۆنالیزمی ئیسلامی یـان ئیسـلامی ناسیۆنالیست.**

بەعس کە "ئایدیۆلۆژیایەکی نەسیۆنالیستی ئینتێگرال (تێکـڕا)و گشـتگیرە"[٧٧]، ئیسـلام لەسـەر ئاسـتی ئۆنتۆلـۆژیو ئـایدیۆلۆژی دەبیــنێ وەك "بزووتنەوەیــەکی" سیاسیو ناسیۆنالیست کەئامانجەکەی یەکێتی نەتەوەی عەرەبەو لەهەمان کاتدا زیاتر وەك دیاردەیـەکی داگـیرکردنو شارسـتانیەت تەماشـای دەکـات نـەك وەك وەحیـەکی خودایيو چەند پراکتیکێکی پیرۆز. ئەم هەڵویسـتە خـۆی لـەخۆیدا لـەوەوە دێـت کـە

لەڕاستیدا بەعس هەوڵ دەدات خواستو ئـاواتی پـان عـەرەبی پارتەکـەی کەدەیـەوێ هەموو عەرەب لەتەنها دەوڵەتێك کۆبکاتەوە، بگونجێنێ لەگەڵ مۆزایکیی ئەو هـەموو ئیلێمێنتە ئاینیو بیرو باوەڕانەی کە نیشتمانی عەرەب پێکدێنن.

چۆن ئیسلامو پان عەرەبیەت پێکەوە بگونجێنێ؟ چۆن کێشەی زەویو ئاسمان یـاخود کێشەی سیاسەتو ئاین حەل بکات؟ بەچ شێوەیەك موحەمـەد پەیامبـەری خـودا کـە هیچ جیاوازیەك ناکات لەنێوان هەموو بەشەکانی مرۆڤایەتی، لەگـەڵ ناسـیۆنالیزمی عـەرەبی هـارمۆنیزە بکـات ( بـەهارمۆنی بکـات)، واتـا لەگـەڵ پـەیامی بـەعس؟ کەپەیامبەر عەرەب بوو بێت، ئەوە شتێکە کـە نـاتوانرێ بـەدرۆ بخرێتـەوە، بـەڵام ئـەو ئاینەی کەبڵاوی کردەوە ئایا پەیامێکی ناسیۆنالیست بـوو و گوزارشـتی لەپـەیوەندی ئادەمیزادی عەرەب لەگەڵ "کۆی نەتەوایەتی" دەکرد بەوشێوەیەی کەبەعس باسی لـێ دەکات؟ یاخود کۆمـەڵێك بـوو لـەباوەڕو هەڵسـوکەوتی ئـاینیی کەئـەو پەیوەندیـەی لـەنێوان ئـادەمیزادو خـوداو شـتی پـیرۆزدا دەردەخسـت؟ ئایـا پەیامبـەر خـۆی ناسیۆنالیستێکی عەرەب بوو بەو واتایـەی کەپێشـەوایەکی ناسـیۆنالیزمی بەعسـی بوو؟

باهەوڵ بدەین وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە. لەڕوانگەی بەعسەوە، ئیسـلام پێش هەموو شتێك بزووتنەوەیەکە کە ڕۆحی عەرەب دەنوێنێ، واتـا کەرەنگدانـەوەی ڕۆحـی عەرەبە بزووتنـەوەی ئیسلام کـە خـۆی لـەژیانی پەیامبـەری پـیرۆز دەنوێنـێ، تەنـها ڕودراوێکی مێژوویی نییە بۆ عـەرەب کەباسی کاتو شوێن بکـات لـەناو چوارچێـوەی هۆکارو ئاکامەکانی، بەڵکو پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی هەیە بـەژیانی گشـت عـەرەب لەقوڵاییو توندوتیژیو بڵاوبوونەوەیدا ، واتا وێنەیەکی ڕاستەقینەو سومبولێکی تەواو و نـەمری سروشـتی سـایکۆلۆژی عـەرەبـە[٨٧]. ئەگـەر بزووتنـەوەی ئیسـلام "پاڵـە پەستۆیەکە" کەهەوڵی داوە بۆ گۆڕینی ژیانی عەرەب، باشە دژی چی یاخود دژی کێ کاری دەکرد؟ دژی بارودۆخی میللەتی عەرەبو دژی سیستێمێ جیهانبینیان؟ باشە ئەم بارو دۆخە چۆن بوو؟ ئایا بارودۆخیك بوو کەگوزارشتی لەژیانی بـت پەرسـتی دەکـرد

یاخود واقعێك بوو كه پێك هـاتبو لەپێشـبڕكێو ململانـێو نـاكۆكی لـەنێوان هـۆزە عەرەبەكاندا؟ لەو ماوانەی كە دوا بەدوای فتوحاتی پەیامبـەردا هـاتن، ئیسـلام چـی بوو؟ ڕاپەڕینێك بوو دژی ناعەدالـەتیو زەبـرو زەنـگ؟ ئـەی چـی بوتـرێ سـەبارات بەفتوحاتی چوار خەلیفەی ڕاشدین، ئیمپراتۆریەتی ئەمەویو عەباسی؟ ئەوەی سـەیرە، بەعس ئیسلام شی ناكاتـەوەو تەنـها وەك وێنەیـەكی ئیحتیحـاج پێكەشـی دەكـاتو دەیكاتـە ئـامرازێك یـان داردەسـتێك لـەپێناوی راگـەیاندنی پـان عەرەبیـەتو ناسیۆنالیزمی خۆی. بەم شێوەیە، ئیسلام، بۆ بەعس، دەبێ بەدیاردەیەك كە پـەیوەندی راستەوخۆی بە"ژیانی ڕەهای عەرەبەوە هەیە " و "وێنەیەكی راستەقینەو سومبولێكی تەواو و نەمرە بۆ سروشتی سـایكۆلۆژییەتی عـەرەبو توانـای دەوڵەمـەندو ڕەهـەندی ڕەسەنی". "ئیسلام جوڵەیەكی ژیاوە كەسەرجەم هـێزە شـاراوەكانی نەتـەوەی عـەرەب دەجوڵێنێتەوە"و " ئەزمونێكی ئیتیكی مەزنـە"(العبقریـة الاخلاقیـة العصبیـة) كـە لەڕێگایەوە عەرەب زانیان چۆن ڕاپەڕن دژی دۆخەكەیانو بەرەنگاری خۆیـان ببنـەوە بۆ ئەوەی بگەنە یەكێتیەكی بەرزتر[٧٩] لەم هەڵوێستەی كەئیسلام پێشكەش دەكـات وەك ویستێكی عـەرەب بۆ "یەكێتیـەكی بـەرزتر" و بەرپەرچدانەوەیـەك دژی واقیـع ، ئایدیۆلۆژیای بەعسی فتوحاتی ئیسـلامی دەكـات بـە بیانویـەك بـۆ شـانازی كـردن بەڕابوردوەو عەرەب دەكات بەهەڵگری ئاڵای شارسـتانیەتو پێشـكەوتن كـە بەوتـەی عەفلـەق هەرچـەندە زۆر دەوامـی نـەكردو ئـەو شارسـتانیەتەی كـەبڵاویان كـردەوە بەدیهێنانێكی مادیو جوزئیو تەسك بوو ئەگەر بەراورد بكرێ بەوخەوە مەزنـەی كـە دەیان ویست بەدی بهێنین.

"هە موو ئەو شتانەی كەئیسلام لەبیست ساڵی یەكەمی پەیامبەریدا بەرهـەمی هێنا لەداگیركاریو شارستانیەت لەدۆخی تۆوی سەرەتاییدا بوو. بـەر لـەوەی عـەرەب زەوی داگیر بكەن ناخی خۆیان ئازاد كردو ڕۆچوون بەقوڵایی ناخیانداو شارەزایی كرۆكو ناخی خۆیان بوون، بەرلەوەی دەسەڵات بەسەر میللەتانی تردا بگرن دەسەڵاتیان بەسـەر خۆیاندا گرتو ئارەزوەكانی خۆیان كۆنترۆڵ كردوو بوونە خاوەنی شوناسی خۆیـان. ئـەو

زانستانەی کە بنیادیان ناو ئەو هونەرانەی دایان هێناو ئەو تەلارسازیەی کـە بـەرزیان کردەوە شتێك نەبوو جگە لەبەدیهێنانێکی مادیو جزئی کەتوانای بەسەر بەدیـهێنانی خەونێکی بەهێزو گشتگیر نەدەشکا کە لەو سالآنەدا بەهەموو هەستیانەوە ئاواتیان پێ دەخواست، دەنگ دانەوەیەکی کزی ئەو دەنگە ئاسمانیە بوو کەبیستبویانو سـێبەرێکی لێڵی ئەو خەونە جادوگەرە بوو کە لەڕۆژگارێکدا بینیبویان فریشتەکان لەڕیزی ئەواندا بوونو بەهەشتیش لەسەر نووکی شمشێرەکانیان دەدرەوشایەوە"[٨٠].

نەتەوەی عەرەب لەڕێگەی پەیامبەرەکەیەوە لەلایەن خوداوە هەڵبژێردراوە بـۆ ئـەوەی پایامەکەی جێ بەجێ بکات. پیاوێك لەنێوان عەرەبەکاندا پەیامی ئاسمانیی خـۆی داو بەهۆیەوە بانگەشەی بۆ مرۆڤایەتی کردو ئەو پیاوانەی کە بەدەورو پشتیەوە بوون تەنها عەرەب بوونو ئەو خاکەی کەپـەیامی خـۆی تیـا بلاوکـردەوە خـاکێکی عـەرەب بـوو "داستانی ئیسلامیی جیا ناکرێتـەوە لـە پێگـە سروشـتیەکەی کـە بریتیـە لـەخاکی عەرەبو پاڵەوانو ئەکتەرەکانی کەهەموویان عــەرەب بـوون"[٨١]. خـودا لـەتوانایدا هەبوو کە چەند سەدەیەك لەوەوبەر ئیسلام بلاوبکاتەوە لــەنێوان نەتەوەیـەکی دیکـە، بەڵام نەیویستوە لەنێوان میللەتانی تردا بلاوی بکاتەوە. بۆ ئـەم مەبەسـتە "نەتـەوەی عەرەبو پاڵەوانە عەرەبیەکەی هەڵبژارد". خودا عەرەبی هەڵبژارد بـۆ بلاوکردنـەوەی پەیامی ئیسلام چونکە خاوەنی سیفاتو چاکەی سەرەکی بوونو هەروەها سـەردەمێکی هەڵبژارد بۆ دەرکەوتنی ئیسلام کەعەرەب تیایدا گەیشتبوونە رادەیەك لەپێگەیشـتنو کامڵ بوون بۆ وەرگرتنی ئەو پەیامەو بلاوکردنەوەی لــەنێوان خـەڵکیدا[٨٢]. هـەروەها ئیسلام نەك تەنــها بزووتنەوەیـەکی عـەرەبی بـوو بـەڵکو نوێنەرایـەتی نوێکردنــەوەو تەواوکردنی عروبە بوو. ئەو زمانەی کە لەڕێگەیەوە هاتە خوارەوە بریتی بوو لــەزمانی عەرەبیو ڕەنگدانەوەی عەقڵی عەرەبی بوو و ئەو فەزیلانەی (هێژایی) کە پتەوی کردن پێکهاتبوون لەفەزیلە شــاراوەو دەرکـەوتوەکانی عــەرەب، هـەروەها ئەوانـەی کـەدژی جولآنەوە بریتی بوون لەکەموکوڕی عەرەب کەبەرەو نــەمان دەڕۆیشـتن. لـەو کاتانـەدا موسڵمان عەرەب بوو بەڵام عەرەبێکی نوێو پێشکەوتوو و تەواو.

شایستەی ئاماژە پێکردنە کە ئـەم جیهانبینییـەی عەفلـەق و بەعسـی سـاڵانی چـل دەنگدانەوەو سەدای خۆی لەناو بەعسی عیراقیدا دەدۆزێتەوەو ئاو دەبات بۆ ئاشـەکەی بیرۆکەی سەدام حوسەین.

لە ساڵی ١٩٨٣دا سەدام حوسەین لەبـەغدا پرسـیاری لـەپیاوانی ئـاینی دەکـردو دەیگوت بۆچی خودا قورئانی بەزمانی عەرەبی وەك پەیامێك بۆ مرۆڤایەتی دەرخسـت [٨٣]. هەر وەکو تێبینیمان کرد کەچل ساڵ لەوەوبـەر میشـێل عەفلـەق وەڵامـی ئـەم پرسیارەی دابووەوە: لەو کاتانەدا تەنها عەرەب موسـڵمان بـوو، بـەڵام جۆرێکـی نـوێ لەعەرەب کەگەیشتبوە ئاسـتێکی تـەواو و پێشـکەوتو. ئیسـلام وەك "بزوتنەوەیـەکی عەرەبی" واتای تازە کردنەوەی عروبەو تەواوکردنی عروبە بوو [٨٤].

نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە ئەگەر عەفلەق نەختێك ووریـاتربوو لـەدەربڕینی بـیرو باوەڕە توندڕەوو شۆڤێنیەکەی، سەدام حوسـەین زۆر راسـتەوخۆتر بـوو. بـەلای سـەدام حوسەینەوە ئەگەر قورئانی پـیرۆز چـەند ئایـەتێکی دارشـتوە کـە پـەیوەندیدار بـووە بەنیشتمانی عەرەبەوەو قورئان لەناو میللەتانی تردا دەرنەکەوتوە چونکە خودای (. .) گـەورە ویسـتویەتی (. . .) عەرەبـەکان سـەبارەت بەپەیامەکـەی ڕازی بکـاتو بەشێوەیەکی باش ئەوە بچەسپێنێت لـەناو دەرونیـاندا ڕاپـەڕن [٨٥]. قورئـان بـەزمانی عەرەبی هاتۆتە خوارەوە چونکە تەنها عەرەب توانای ئەوەی هەبووە ئەو ڕۆڵە ببینێ کـە خودا پێیانی سپاردوە. بەم شێوەیە، خودا بانگەشەی نەتەوەی عەرەبی کـرد بـۆ ئـەوەی پێی رابگەیێنێ کەعەرەب لەنێوان میللەتانی سەرزەویدا توانـای ئـەوەیان هەیـە ئـەم ڕۆڵە ببینن [٨٦].

مەبەستی سەدام حوسەین چیە؟ کەنەتەوەی عەرەب هەڵبژێردراوە بۆ سـەرکردایەتی ئەو هەموو میللەتە بێگانانەی کەجاران لەژێر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی ئیسـلامیدا بوون؟ بێ گومان، ئەوکاتانە شارستانیەتی ئیسلامی بریتی بـوو لەئیمپراتۆریـەتێکی گەورەو کاستی (caste) عەرەبیش کە ئیسـلام بـوو ڕۆڵـی سـەرەکیو تایبـەتی خـۆی هەبوو [٨٧]. لەساڵانی یەکەمدا عەرەبەکان بەبلاوکردنەوەی ڕێنمایی و بەهای ئیسلامیی

تەنها "بلاۆکەرەوەی" ئیسلام بوون، بەڵام نکوڵی لەوە ناکرێت کەسەرکەوتنی عەرەبو تەشەنەسەندنیان تەنها لەساڵانی فتوحاتی پەیامبەرو ئیمپراتۆریەتی ئەمەوی بوو. پێکهێنەرەکانی سروشتی دەوڵەت لەژێر دەسەڵاتی عەباسیەکاندا گۆڕانکاری بەسەردا هات. ئیمپراتۆریەتی عەرەبیی ئیسلامیی گۆڕاو بوو بەئیمپراتۆریەتی ئیسلامیی عەرەبیی ، بەو واتایەی کەدەزگای دەوڵەت تەنها لەعەرەب پێکنەهاتبوو بەڵکو پێکهاتبوو لەموسڵمان [٨٨]. بەو شێوەیە شارستانیەتی ئیسلامیی هەموو جۆرە ئاین و ئێتنیەکی دەگرتەوە (فارس، کورد، تورك، بەربەر، ئەسپانی، دیانی، جولەکە. . . هتد). ئەگەر شارستانیەتی "عەرەبیی ئیسلامیی" پێش عەباسیەکان عەرەبایەتی بەستبووەوە بەئیسلامەوە، شارستانیەتی ئیسلامیی ئەم پەیوەندیەی بەشێوەیەکی توند پچڕاندبوو. ئیدی هوشیاری "خۆناسەیی" یان شوناسی عەرەب، کەپان عەرەبیەت (پێش هەموویان پان عەرەبیەتی بەعسی) کردوییەتی بەئایدیۆلۆژیای خۆی تەنها لەوەوە دێت کە لەسەر ئاستی مێژوویی، ئەو میللەتانەی کەبەزمانی عەرەبی ئەدوان، لەسەر ئاستی سیاسیدا، تەنها یەك میللەت بوون و بەهۆی ئاینەکەیان کەزۆرینەی خەڵکەکەی دەگرتەوە هەمیشە یادگاری ئەم یەکێتیەیان هەڵگرتبو [٨٩]. بەڵام هەرچەندە شارستانیەتی ئیسلامی چەند میللەتێکی جیا جیای گرتبوە خۆی ، لەوە دەچێت کە ئەو میللەتانەی عەرەب نەبوون خزمەتی کێشەی عەرەبیان کردبێ (عروبەیان کردبێ ). لەوانەیە بەواتای ئەو خزمەتەی کەناعەرەبەکان پێشکەشیان کردوە بەکێشەی عەرەب، وا لەبەعس و سەدام حوسەین بکات بڵێ کە خودا "عەرەبی هەڵبژاردوە بۆ ئەوەی بتوانن سەرکردایەتی مرۆڤایەتی بکەن چونکە لۆژیکین [٩٠]. بەلای سەدام حوسەینەوە ئەو گەلە بێگانانەی کە دژی هێرشی ئیسلام بەرگریان دەکرد ، بوون بەموسڵمان چونکە پێویستیان بەوە هەبوو لەژێر دەسەڵاتی سەرۆکێك کە نوێنەری عروبە یاخود ناسیۆنالیزمی عەرەب بوو یەکبگرن. ئەوەشمان لەبیر نەچێتەوە ، سەدام حوسەین کەباس لە "ڕۆڵی سەرکردایەتی" (الدور القیادی) دەکات مەبەستی لەو ڕۆڵە نییە کە زەبروزەنگ بەکار بهێنێ. ڕۆڵی تایبەتی عەرەب

ڕۆڵی خۆبەختکردن و خزمەتە. لەڕاستیدا ئەم ووتارە کە لەدژی ئێرانی خومەینی خوێنراوەتەوە ئامانجەکەی ئەوەیە کەدەری بخات کە لەسەر نەتەوەی عەرەبە پەیامی ئیسلام بلاوبکاتەوە نەوەک فارس چونکە پەیامبەر عەرەب بوەو قورئانیش بەعەرەبی هاتۆتە خوارەوە. ئیدی کە خومەینی دەیەوێ موسڵمان بێ (بەقسەی سەدام) تەنانەت پرینسیپە ساکارەکانی ئیسلامیش بەرپەرچ دەکاتەوە چونکە "ڕۆڵی سەرکردایەتی" عەرەب پەسەند ناکات. ئەم دیدەیە ڕەنگدانەوەی هەڵوێستێکی کاتی نییە کەپەیوەندی بەجەنگ یان قەوارەیەکی تەکتیکیەوە هەبێت، بەڵکو فەلسەفەو هەڵوێستی جێگیری بەعسە. بەعس ئیسلام بەرز دەنرخێنێ بۆ ئەوەی لایەنە ناسیۆنالیستەکەی دەربخات، واتا وەک تێبینیمان کرد دەیەوێ دەری بخات کە ئیسلام بۆ خزمەتی نەتەوەی عەرەب هاتۆتە کایەوەو عەرەب سەرۆکایەتی کردوەو عەرەب دەبێ سەرکردایەتی بکات و میللەتانی موسڵمانیش دەبێ هەموویان لە خزمەتی عەرەبدا بن. دەبێ بوترێ کەکاتێک بەعس خۆی بە"مایکرۆکۆزمی"( وێنەی بچوکی) نەتەوەی عەرەب دادەنێ و کاتێک "ڕۆڵی سەرکردایەتی" دەبەخشێ بەنەتەوەی عەرەب، ئایا مەبەستی لەخۆی نییە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەندە ڕوونە کەبەڕاستی پێویستی بەدرێژکردنەوەو ڕوونکردنەوەی زیاتر نییە.

بەبەرزڕاگرتنی" ئیسلامی ناسیۆنالیست"، بەعس بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەیەوێ تیۆریەکی مێژوویی نوێ بهێنینە کایەوە: تیۆری مێژوویی ئیمپریالیزمی عەرەبی بۆ سەپاندنی جۆرێک لەجۆرەکانی مۆنۆپۆلی سیاسی. بەم شێوەیە، بەعس تەنها دان بەمەزنیی ڕابوردووی ئیسلامدا نانێ وەک شارستانیەت و دیاردەیەکی مێژوویی، بەڵکو وەک دیاردەیەکی ئایدیۆلۆژیش سەیری دەکات: جەوهەری ئیسلام "ئایدیۆلۆژیزە" دەکات و لەگەڵ ناسیۆنالیزمی پان عەرەبدا دەیگونجێنێ. بەئایدیۆلۆژیزەکردنی ئیسلام، بەعس پەیامی پەیامبەر لەلایەنە ئاینیەکەی بەتاڵ دەکاتەوە. ئیدی، دەست ڕاکێشان بۆ ناسیۆنالیزمی عەرەب و دانانی بەمەرجێکی مێژوویی ژیانی عەرەب دەبێتە پاساوێک بۆبەرزڕاگرتنی ڕۆحی عەرەب و دەرخستنی ئیسلام وەک کولتورێک بەواتاهێگلیەکەی.

ئەم لایەنە رۆحیەیە کەعەرەب دەکات بەنەتەوەیەکی باش نرخێنراو لەنێوان گەلانی جیهاندا. بەگوێرەی لۆژیکی بەعس، پەیامبەرو چوار خەلیفەی راشدین‌و ئەمەویەکان‌و عەباسیەکان دەبێ وەك ئەو پیاوە سیاسیانە دەرکەون کەنوێنەرایەتی ئەم رۆحەیان کردوە. وەك دەرئەنجام، ئەم "بەداردەستکردنە" ئەم واتایەی خوارەوە دەگەیێنێ: ژیاننەوەی (بعث) ئەم رۆحە. میشێل عەفلەق کاتێك کەهەوڵی دەدا ئیسلام‌و ناسیۆنالیزمی عەرەب پێکەوە بلکێنێ (بەوشێوەیەی کەبەعس دەیەوێ دەری بخات) دەیگوت. " وەك ئەمڕۆ بەهەندێك دەڵێین نیشتمانپەروەر( وطني) یاخود ناسیۆنالیست (قومي)( هەرچەندە دەبێ هەموو نەتەوە ناسیۆنالیست بێ) مەبەستمان لەوکەسانەیە کە باوەڕیان بەکێشەی ولاتەکەیان هێناوە چونکە گشت مەرج‌و چاکەی پێویستیان لەخۆیاندا کۆکردوە بۆ ئەوەی هوشیاربن بەرامبەر پەیوەندی قوڵیان لەگەڵ نەتەوەکەیان‌و باری بەرپرسێتی ئەم ئینتمائە هەڵدەگرن. لەڕابوردوشدا موسڵمان ئەو عەرەبە بوو کە باوەڕی بەئاینی نوێ هێنابوو چونکە هەموو مەرج‌و چاکەی پێویستی لەخۆیدا کۆکردبوەوە بۆ ئەوەی تێبگات کەئەم ئاینە نوێنەرایەتی هەڵ بەزینی عروبە بۆ یەکیەتی‌و هێزو پەرەسەندن دەکات "[٩١]. عەفلەق لێرەدا دەیویست بڵێ ئەگەر لەڕابوردودا پیاوی موسڵمان پێش هەموو شتێك عەرەب بوو، باوەڕی هەبوو بە ئیسلام چونکە نوێنەرایەتی " بزووتنەوەی عروبەی دەکرد"، ئەمڕۆ عەرەب دەبێ پێش هەموو شتێك ناسیۆنالیست بێ‌و باوەڕی هەبێت بەکێشەی نیشتمانیی. لەم تێڕوانینەوە، مەبەستەکە زۆر ئاشکرایە: عەرەبی ڕابوردوو دەگورێ‌و (مێتامۆرفۆزە دەکات metamorphosis): ئەمجارەیان لەسەر شێوەی ناسیۆنالیزمی بەعسی دەردەکەوێ. بەگوێرەی ئەم لۆژیکە، بەعس کێشەی ئیسلام وەك ئاین‌و، عەرەب وەك نەتەوەو، بەعس وەك پارتی سیاسی، بەم دوو ڕێگایەی خوارەوە چارەسەر دەکات: یەکەمیان "هێڵی" باوەڕ بەئیسلام دەگوێزێتەوە بەرەو باوەڕ بە ناسیۆنالیزم. دوهەم، ئیسلام لەناو ناسیۆنالیزمی بەعسی دا دەتوێنێتەوە. بەم شێوەیە بەعس هەوڵ دەدات ئەو

ناچونیەکیەی، ئەو دژاودژیەی کەهەیە لەنێوان شوناسی (هویەی) ناسیۆنالو شوناسی ئاینی، چارەسەر بکات:

لەڕابوردودا موسڵمان ئەو کەسە بوو کەباوەڕی بەئاینی نوێ هێنابوو چونکە ئەم ئاینە نوێنەرایەتی عروبەی دەکرد ئەمڕۆ، هەمان شت، موسڵمان دەبێ ئەو کەسەبێ کەپێش هەموو شتێك باوەڕ بەناسیۆنالیزم بهێنێ چونکە ناسیۆنالیزم نوێنەرایەتی بەردەوامی هەمان بیروباوەڕ دەکات کە پەیامبەرو عەرەبەکان هەڵگری بوون. بەلابردنی سنوور لەنێوان پێناسەی ناسیۆنالو پێناسەی ئاینی، بەعس ناسیۆنالیزم دەکات بەباوەڕ (ئیمان)، هەروەکو لەبەشی داهاتوو روونی دەکەینەوە.

شایانی ئاماژەپێکردنە لەمێژووی بیری سیاسی عەرەبدا، زۆر لەپان عەرەبەکانی پێش عەفلەق ئیسلامیان لکاندوە بەناسیۆنالیزمی عەرەبییەوە، بەڵام هیچ بیرمەندێك ئەو ئەندێشەیەی نەبوە کە "باوەڕ" بکات بەمەرجێکی بێهاوتاو بنەڕەتیی ناسیۆنالیزم. دەبێ بوترێ کەعەفلەق تەنها بیرمەندی پان عەرەبی ئەو سەردەمە بوو کەتوانی چەمکی کۆمەڵگای نوێ لەئەزمونی ئیسلامیەوە وەربگرێت ( اقتباس بکات): واتا متمانە کردن بە "باوەڕ"[٩٢]. "باوەڕ" وەکو پێشمەرجێك بۆ لکاندنی ئیسلام بەو ناسیۆنالیزمەی کە گوزارشتێکی راستەقینە لەئامانجو ویستەکانی بەعس دەکات. سەدام حوسەین دەڵێ لەکاتێکدا باسی موحەمەدی مەزن دەکەین، دەبێ وەك پەیامبەرێکی مرۆڤایەتیو پاڵەوانێکی ناسیۆنالیستی گەورەی نەتەوەی عەرەب سەیری بکەین، چونکە کەسانی گەورەی وەك پەیامبەر لەباوەشی نەتەوەیەکی گەورە لەدایك دەبن[٩٣].

بێ گومان مەبەستی سەرەکی بەعس ئەوە نییە قەوارەیەکی خودایی theist بدات بەپەیامی پەیامبەر، چونکە (وەکو ئاماژەمان پێکرد) هەوڵ دەدات ناوەڕۆکی ئاینی ئیسلام بۆ مەبەسێتکی سیاسیو تەکتیکیو لەهەمان کاتدا ستراتیژی بەتاڵ بکاتەوە. کاتێك عەفلەق دەڵێ " ژیانی پەیامبەر نوێنەرایەتی سایکۆلۆژیەتی (رۆحی) عەرەب دەکات لەڕاستیە رەهاکەیدا"[٩٤] وکە "موحەمەد(ص) بریتی بوو لەهەموو عەرەب،

باهەموو عەرەبێکیش وەك موحەمـەد بێـت"(٩٥) مەبەسـتی لەمەسـیرەی ئـاینی یـان ناسـیۆنالیزمی ئـاینی پەیامبـەر نییـەو ناڵـێ کـە لـەنێوان عـەرەبو ئیسـلامدا پەیوەندیەکی تایبەتی هەیە ، وەکو زۆر نووسەری ڕۆژ ئاوایی ئەیانەوێ باسی بکەن(٩٦). کەبەعس ناسیۆنالیزمی ئاینی ڕەتبکاتەوە ، ئـەوە شـتێکی ئاشـکرایە ، بـەڵام بـەعس بەشێوەیەکی ئایدیۆلۆژی یان ئەگەر بتوانین بڵێین بەشـێوەیەکی بەعسـیانە پەیامبـەر پێشکەش دەکات وەك ناسیۆنالیست. موحەمەد بریتی بوو لەهەموو عەرەب، باهەموو عەرەبێك لەمەودوا موحەمەد بێت: مەبەست لەمە ئەوە نییە کەهەموو عەرەبێك دەبێ ئایندار ( متدین) بێت، یاخود باوەڕی بەئاینی ئیسلام هـەبێت. ئەمـە لـەلای بـەعس کێشەیەکی لاوەکیە. کێشەی سەرەکی ئەمەیە: بەعس کەخۆی وەك ئایدیۆلۆژیایـەکی ناسیۆنالیستی ڕاستەقینە پێناسەدەکات، هیـچ ناچونیەکیـەك (دژاودژیـەك) نابینـێ لەنێوان یەکێك کەموسڵمان بێت یان نوێژکەر بێت یان کافر، بەمەرجێ کـە بەعسـی بێتو باوەڕی بەموحەمەد هەبێت وەك "پاڵەوانێکی ناسیۆنالیسـتی مـەزنی نەتـەوەی عەرەب"، چونکە ئەگەر پەیامبەر نوێنەرایـەتی ڕۆحـی عـەرەبی دەکـرد ، بەعسـیش، بەهـەمان شـێوە، نوێنەرایـەتی ڕۆحـی عـەرەب دەکـات. کۆتـایی ئـەم سـیللۆژیزمە (syllogism) ئەوەندە ڕوونە کە بەڕاستی پێوستی بەسـەلماندنێکی دوورو درێـژ نییـە. سەدام حوسەین بە زۆرو زەبەنگی بۆمان ڕوون دەکاتەوە: "وابـزانم حـیزب وەك تیـۆریو وەك پراکتیك حیزبی هەموو بزووتنەوەیەکی عەرەبەو تەنها حیزبـە کـەڕۆحی یەکـەمی عەرەبی لەبەرکردوە"(٩٧).

بێ گومان هەڵوێسـتی ئاشـکرای بـەعس بەرامبـەر بەئیسـلام تەنـها فەلسـەفیو ئایدیۆلۆژی نییە، بەڵکو پەیوەندی هەیە بەپێکهاتەی ئاینیو مەزهەبی ئەو نیشـتمانە عەرەبەی کە دەیەوێ پارچەکانی بکات بەیەكو حوکمڕانی بکات. ئەگەر تەماشـایەکی کارتی جوگرافی وڵاتە عەرەبیەکان بکەین، دەبینین کە زۆر ئـاینی جیـاوازو مەزهـەبی ڕەنگاو ڕەنگ ئەو وڵاتانە پێك دێنن. ئەگەر مارۆینەکانو ئۆرتۆدۆکسـەکانی لوبنانو قوبتییەکانی میسرو بەربـەرەکانی جـەزائیرو تونـسو مـەغریبو دیانـەکانی سـوریاو

سـودان‌و ئـەردەن‌و عـیراق‌و ئەنیمیسـتەکانی سـودان بەعـەرەب دابـنرێن پێویسـتە کۆکەرێکی هاوبەش هەبێت کە سەرجەم ئەم گروپانە بکات بەیەك.

ئەم کۆکەرە هاوبەشە چیە؟ نەسـیۆنالیزمی عـەرەب‌و ئـاینی ئیسـلام وەك کولتـور. مارۆنیەك یاخود قوبتیەکی میسر. . .هتـد. دەبـێ تێبگـات‌و ئەندێشـەی بڕازێنێتـەوە بەوەی کەخۆی بەعەرەب بزانێ‌و قـەوارەی پێناسـەیی لەگـەڵ ناسـیۆنالیزمی عـەرەبدا بگونجێنێ. گرنگ ئەوەیە کە لەعەرەبێکی موسڵمان خۆی جیا نەکاتەوە چونکە ئیسلام بۆ عـەرەبێکی موسـڵمان کولتورێکـە وەك چـۆن بـۆ عـەرەبێکی دیـان مەسـیحیەت کولتورێکە. ئەوەی کەهەردووکیان پێکەوە کۆدەکاتەوە ئـەو ناسـیۆنالیزمە عەرەبیەیـە کە جەوهەرەکەی بریتیە لەناسیۆنالیزمی بەعسی.

بێ گومان، ناتوانین ئەم باسە تەواو بکەین بـێ ئـەوەی ئامـاژە بـەخاڵێکی زۆر گرنگ بدەین. زۆر لەنووسەران پارتی بەعس بەعەلمانی لەقەڵـەم دەدەن‌و دەڵێـن گوایـە بەعس عەلمانیە چونکـە پـارتێکی ئـاینی نییـەو ئـاین لـەئایدیۆلۆژیای رەسمـی جیـا دەکاتەوە. بۆ پەرتدانەوەی ئەم باسانە پێش هەموو شتێك پێویستیمان بەپێناسـەکردنی زاراوەی عەلمانی هەیە. عەلمانیـەت واتـای چییـە؟ عەلمانیـەت پرینسـیپێکە کـە داوا دەکات دەوڵەت دەست وەرنەداتە کارو باری ئاینی‌و هەڵسـو کـەوتی ئـاینی تاکـەکان. هەروەها داوا دەکات کەدەوڵەت سەر بە هیچ بەشێك لە بەشەکانی هاوولاتیـان نـەبێ‌و هیچ کەسێك جیانەکاتەوەو جیاوازی لەنێوان هاوولاتیاندا بە گوێرەی ئینتیمای ئاینیـان نەکات. بەم شێوەیە دەوڵەت نابێ جیهانبینی‌و دیـدی بەشـێك لەبەشـەکانی کۆمـەڵ بەسەر بەشەکەی دیکەدا بسەپێنێ، کەداوا دەکات کۆمەڵگەی مـەدەنی‌و کۆمەڵکـەی ئاینی جیا بکرێنەوە لەناو دەزگاکانی دەوڵـەتدا. دەرئـەنجامی ئـەم پرینسـیپە بریتیـە لـەوەی کەیاسـاکانی دەوڵـەت لەسـەر بنچینـەی جیابونـەوە ( ئـاوتۆنۆمی) لـەنێوان دەوڵەت‌و دەزگا ئاینیەکان سەرچاوە دەگرن: دەوڵەت دەست وەرناداتە کارو بـاری دەزگـا ئاینیەکان‌و ئاینیش دەست وەرناداتە کارو بـاری سیاسـی. ئەمەیـە بـە کورتـی واتـای عەلمانیەت. ئایدیۆلۆژیاو رژێمی بەعسی بە هیچ شێوەیەك عەلمانی نـین لەبـەر ئـەوەی

وەك سەرجەم ئایدیۆلۆژیاو بزوتنەوە تۆتالیتاریەکان، دەیەوێ بە شێوەیەکی رەهـا خـۆی بە سەر هەموو دەرکەوتە ئاینیەکاندا بسەپێنێ. حکومەتی بەعسی عیراقی نەك تەنـها هیچ ئازادیەکی ئاینی نەدا بە دەزگا ئاینیەکانو ئاینزای سوننەی بەرز نرخاند، بـەڵکو بە ناوی ئایدیۆلۆژیای نەسیۆنالیستی بەعسیەوە دەسـتیکرد بـە داپلۆسـینی شـیعەو سەرجەم ئاینزاکانی دیکە. لەبەر ئەم هۆیە، دەتوانین بڵێین کەبەعس هەرگیز بنچینـەی حکومەتو ئایدیۆلۆژیای بەعسو سیاسەت یان دەوڵەت لەئاین جیا ناکاتـەوە. بـەڵکو لەسەرئاستی ئۆنتولۆژی ئاین ملکەچ پێ دەکات بۆ دەزگاکانی دەوڵـەت. بـێ گومـان ئایدیۆلۆژیـا تۆتالیتاریـەکان بـەهیچ شـێوەیەك نەدەیانـەوێو نـەدەتوانن بـهێڵن کەدەزگاکانی ئاینیی بەسەربەخۆیی بجولێنەوەو رێز ناگرن لەئازادی ئاینی. ئاین دەکـەن بە داردەستو دەیخەنە ژێر ویستو مەرامی خۆیانەوە.

# پەراوێزەکانی بەشی سێهەم

1-Fouad Matar, Saddam Husayn ou le devenir irakien, Le sycomore, 1980, Paris, p. 19.

٢-بڕوانە میشیل عەفلەق ، في سبيل البعث، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ل ٢٤٢.

٣-هـ ، س، ل ٢٤٢

٤-هـ، س، ل ٢٤٢

٥-بڕوانە میشیل عەفلەق، لە ناو:

Elyas Farah, Parti bath arabe et socialiste evolution de l'ideologie arabe revolution naire, La pensee nationale, Michel Aflak, Menuesa, Madrid, 1978, P. 128

٦-بڕوانە:

Patrick seale, The struggle of Syria, A Study of Past War Politics (1945-1958), Oxford University Press, London, 1965, P. 154.

7-Elyas Farah, Ibid, P. 194

٨-میشیل عەفلەق لە ناو:

Elyas Farah, Ibid, P. 128.

٩-ڕاستیەك كەخۆی دەسەپێنێ و پێویستی بەسەلماندن نییە.

١٠-میشیل عفلق، في سبيل البعث، هـ. س. ل٩٧

١١-میشیل عفلق، هـ. س. ل. ٩٨-٩٩.

12-Michel Aflak, Parti bath arabe et socialiste, choix de textes de la pensee du fondateur du parti bath, Bol. Ind. La Albarreja, Madrid, 1977, P. 85.

١٣-میشیل عەفلەق، هـ. س. ل. ٦٨.

١٤-بڕوانە وتاری میشیل عەفلەق، هـ. س. ل. ٦٧-٧٠

15-Itimar Rabinovich, Syria under the bath: 1963-1966, The Army Party Symbiosis, Jerusalem University Press, 1977, PP. 9-10.

١٦-مادەی شەشی دەستوری پارتی بەعس.

١٧-پرنسیپی یەكەمی دەستوری پارتی بەعس. بەلای حنا بطاطوەوە یەكێتی عەرەب كەبەعس داوای دەكات "ئامرازێك نییە كەبیەوێ بگاتە ئامانجێك یاخود شتێكی بەكەڵك پێك بهێنێ"، بەڵكو

مافێکی سروشتی یە ". بە واتایەکی تر نەتەوە دەبێ لــەچوارچێوەی دەوڵــەتێکدا بــژی". لەبەرئــەوە یەکێتی "پێویستییەکی ئەخلاقیە" و "لەسەر ئاستی مێژوویی دەبێ بەدی بهێنرێ". بڕوانە
Hanna Batatu, The Old Social Classes and the Revolutionary Movement of Iraq, A study of Iraq's Old Landed and Commerical Classes and of it's Communists, Bathists and Free Officers, Princiton University Press, 1978, P. 731.

١٨-بڕوانە نضال البعث، ل. ٧٢-٧٣ و هەروەها:
Wafik Raouf, Nouveau regard sur le nationalisme arabe, Bath et Nasserisme, Paris, 1989, P. 109.

19-John J. Devlin, The bath party, A History from it's Origins to 1966, California, Hoover Institution Press, 1976, P. 26.

٢٠-لە ئەدەبیاتو بڵاوکراوەکانیدا، بەعس ئیسرائیل بە فەلەستینی داگیرکراو لەقەڵەم دەدا. لــەم ڕووەوە بەعس بانگەشە دەکات بۆ ڕزگاردکردنی سەرجەم خاکی فەلەستین (تحریر کامل تراب فلسطین). کاتێك کەبەعسی عیراقی تەمجیدی (نبوخذنصر) یان صەلاحەدین دەکات وەکو ڕزگارکــەری گــەورەی فەلەستین لەقەڵەمیان دەدا، یەکەمیان دادەنێ بە ڕزگارکەری گەورەی فەلەستین لــەمێژووی کۆنــدا (مێــژووی پێــش ئیســلام) و دووەمیشــیان لــەناو چوارچێــوەی "ڕوحێکــی ئیســلامیدا". لــە چــاو پێکەوتنێکدا لەگەڵ نووسەری بەعس، (فؤادمطر) سەدام حوسەین دەڵێ کــە ( نبوخذنصــر) پیــاوی گەورەی مێژووی کۆنی پێش ئیسلامەو تجاوزی ژیانی ئاسایی دەکات. پێش هــەموو شــتێك پیاوێکــە کەپەیوەندیەکی بەنرخ دروست دەکات لەنێوان تیۆریو پراکتیکیدا. تا ئەم خەســڵەتانەن کەدەیکــەن بەپیاوێکی گەورەو وای لــێ دەکەن کەبگات بەئامانجەکانی خۆی. ســەدام حوســەین دەڵــێ کــەژیانی نبوخذ نصر کاری زۆر کردۆتە سەری چونکە پێش هەموو شتێك توانای عەرەب دردەخاتو لەلایــەکی تریشەوە ڕزگارکەری فەلەستینە. ڕاستە کە( نبوخذ نصر) عەرەبی عیراقە، عــەرەبی عــیراقی کۆنــە، بەڵام عیراق بەشێکە لەنەتەوەی (عەرەب) لەهەموو چەرخەکانی مێژووداو نبوخذ نصر یش جووەکانی بەزان لە فەلەستین. سەدام حسین درێژە دەدات بە باسەکەی و دەڵێ کاتێك کە بیرلەوە دەکەمەوە بڵێــم بەعەرەبەکان بە تایبەتی عیراقیــەکان مێــژوو بەرپرســیارتان دەکــات بەرامبــەر ئەرکەکــەتانو ئــەم ئەرکەش دەبێ ببێ بەچەکێك کەجەڵەتان تێ بخات نەك ببــێ بەقورســاییەك کــەرێتان لــێ بگــرێو سڕتان بکات. دەبێ ئەم چەکــە بەکاربــهێنن چونکــە ئێــوە خــاوەنی مێژوویــەکن (٠٠) و ئەوانــەتان لەبیرنەچێت کەفەلەستینیان ڕزگار کردووە پێشو پاش ئیسلامیش هەروەها صەلاحــەدینیش هــەمان تایبەتمەندی هەیە بــەڵام لــەچوارچێوەی ڕۆحێکــی ئیســلامیو موســڵمانێکی عیراقیــە. لــەکۆنگرەی جوتیاران کە لەبەغدا بەسترا لەساڵی ١٩٧٩ بە ئەندامەکانم ووت کەســەریان ســوڕنەمێنێ کــاتێك

فەلەستینییەك شەهید دەكرێ لەفەلەستین كە لەفەلەستین لەدایك نەبووە، هەروەها سەرتان سوڕنەمێنێ كاتێك كەعیراقیەك یان لوبنانییەك یان سوورییەك یان هەرعەرەبێكی تر دەبێ بەشەهیدی فەلەستین . من صەلاح الدین دەژمێرم بەسەرۆكێكی گەورە چونكە توانی لەچەرخی خۆیدا رۆحی نەتەوە بوروژێنێو بەرەو ئامانجێكی تەواوی بەرێ: یەكیەتی بۆ سەركەوتنێكی گەورە بەسەر خاچ هەڵگرەكاندا. بڕوانە:

Fouad Mater, Saddam Husayn ou le devenir Irakien, Ibid, PP. 158-159.

٢١-جغرافية: العراق للصف الخامس الابتدائي، وزارة الثقافة، العراق، ١٩٧٥ ل ٧-٨ ، لە:

Christine Moss Helms, Iraq, Eastern Flank of Arab World, Washington D. C., 1984, P.17.

22-Bassel Youssef, Les droits de l'homme dans la pensee du parti bath arabe et socialiste, etude comparee, Bagdad, dar al-mamoun, 1982, P.143.

٢٣-مشيل عفلق لە :

Hanna Batatu, Ibid, PP. 733-734.

٢٤-میستیسیزم (mysticism) عەقیدەیەكی فەلسەفیە كەبریتیە لەكۆی بۆچوونو پراكتیزەكان كەئامانجیان یەكێتی ناوەخنی نێوان مرۆڤ و پرینسیپی بوونە (واتا خودایەتی).

٢٥-میشیل عەفلەق، في سبيل البعث، هـ. س، ل ٧١

٢٦-بڕوانە

Hanna Batatu,Ibid, P.736.

٢٧-هـ. س. ل ٧٣٦.

٢٨-هـ. س. ل ٧٣٦.

٢٩-هـ. س. ل ٧٣٥.

٣٠-هـ. س. ل ٥٦.

٣١-بڕوانە مادەی چواری دەستوری پارتی بەعس.

٣٢-مشیل عەفلەق، في سبيل البعث، هـ. س. ل.٣٠٧.

٣٣-هـ. س. ل ٣٠٧.

34-Hanna Batatu,Ibid, PP. 736-737

35-Patrick seale, The Struggle for Syria, A Study of Post –War Arab politics 1945-1958, 1965, London, P.154

٣٦-وەكو كۆیەك كەپێكهاتووە لەوماكانەی كەهەمان سروشتیان هەیەو دابەش بوون بەشێوەیەكی یەكسان.

37-Kamal S. Abu Jabar, The Arab Bath Socialist Party, History and Organization, 1966, Syracuse University Press, P. 112.

38- Michel Aflak, in , Samir al – Khalil, La machine infernal, politique de l'Iraq morderne, Editions Jean-Claude Lattes, 1991, p. 290 .

39- Michel Aflak, in, Jean- Pierre Viennot, Le role du bath dans la genese du nationalisone arabe, 9e annee, 3e trimestre, n. 35, 1965, 155.

40- Saddam Husayn , in, Foud Matar, op. cit ., 150.

٤١- بڕوانە، هـ. س. ل. ٢٩٩-٣١٢.

٤٢- شعوبیه بزوتنەوەیەك بوو لە سەردەمی عەباسیەکان کە فارسی بەرز دەنرخـــاندو بـەچاوێکی نزمەوە تەماشای عەرەبی دەکرد. بەلاّم ئەمڕۆ شعوبیه گوزارشت دەکات لەچوارچێوەیەکی فیکری کـە لا دەدات لەنەسیۆنالیزم. لەئەدەبیاتی بەعسیدا، شعوبیه بە شـــێوەیەکی نێگـەتیف بـەکاردەهێنرێ و ئاماژە دەکات بۆ لایەنی خراپی خەڵك و بزوتنەوە کە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای بەعسی ناگونجێن. بۆ نمونـە عبدالکریم قاسم لەزۆر لایەنەوە بە شێوەیەکی پۆزەتیف تەماشا نەدەکرا لە لایەن بەعســەوە چونکـە بەباشی خۆی تەرخان نەکردبوو بۆ مەسەلەی یەکیەتی عەرەب. بڕوانە:

John Devlin, The Bath Party, A History from its Origins to 1966, Hoover Institution Press, 1976, p. 45.

بڕوانە هەروەها: د. عبد العزیز الدوری، الجذور التأریخیة للشعوبیة، دار الطلیعة، بیروت، ١٩٨٠. د. عبدالله سلوم السامرائي، الشعوبیة، حرکة مضادة للأسلام والأمة العربیة، المؤسسة العراقیة للدعایة والطباعة، بغداد، ١٩٨٤.

٤٣- میشیل عفلق، هـ. ل ٣٠٧.

٤٤-" في التفکیر الاشتراکي" ، وزارة الاعلام، دار الحریة للنشر، بغداد، ١٩٧٣، ل ١٨-١٩ .

٤٥- میشیل عفلق، معرکە المصیر، هـ. س. ل ١٧.

٤٦- ئەم دوو چەمکەمان لەحەننا بەتاتو وەرگرتوە، بەلاّم ئەو دەرئەنجامەی ئێمە پێـــی گەیشــتوین جیاوازە لەو، بڕوانە:

Hanna Batatu, op. Cit., p. 738.

٤٧- میشیل عفلق، في سبیل البعث، ل ٧ .

٤٨- بڕوانە ل ١١، ل١٣، ل٧٢ .

٤٩- ل ٢٩- ٣٠.

٥٠- ل ٢٨.

٥١- ل ٢٨.

52- Fuad Matar, op. cit., p. 166.

٥٣- هـ. س. ل. ٥٦، ل. ٥٨.

٥٤- بڕوانـــــه مــــــادەی یەکـــــەمی پرینسیپە گشـــــتییە کانی پــــــارتی بـــــەعس.

55- Maurice Duverger, Droit constitutionnel et institutions politiques, Puf, Paris, 1956, p1. 123-124.
56- Pierre Aycoberry, La question nazie, Les interpretations du national socialisme, 1922- 1975 , Ed. Du Seuil, 1989, P. 62.
57- Amazia Baram, Qawmiyya and Wataniyya in Bathi Iraq; The Search of a New Balance, in, Middle Eastern Studies, fast. 2,n.19, 1983, p.189.
58- Ibid ., pp. 189-190.
59- The 1968 Revolution in Iraq, Experience and Prospects, the Political Report of the Eighth Congress of the Arab Bath Socilist Party, January 1974, Itacha Presse, 1979, pp. 120- 121.
60- Ibid., p. 121.
61- Fuad Matar, op.cit., p. 161.

٦٢- جلال الطالباني، کردستان والحرکة القومیة الکردیة، دار الطلیعة للطباعـة والنشـر، الطبعـة الثانیة، بیروت، ١٩٧١، ل ٣٢٣.

٦٣- میشیل عفلق، احادیث الامین العام الرفیق میشیل عفلق، بغداد، ١٩٦٩، ل ٧. هەروەها:
Halkawt Hakim,in (ouvrage collectif), Le Panarabisme irakien et le probleme kurde, Les Kurdes Par- dela l'exode, L'Harmattan, Paris, 1992, P. 140.
64- Orfa Bengio, Bathi Iraq in Search of Identity; Between Ideology and Praxis, in, Orient, Vol. 28,1987, p.513.
65- Ibid., p. 513.
66- Amazia Baram, Mesopotamian Identity in Bathi Iraq, in, Middle Eastern Studies, Vol. 19, Fasc. 4, 1983, p. 246.
بۆ ئەو مەبەستە، بڕوانە ئامۆژگاریەکانی سەدام حوسەین لەسەر نوسینەوەی مێژوو: صدام حسـین، حول کتابة التاریخ، دار الثورة، ١٩٧٨. بڕوانە هەروەها: صدام حسین، کیف یکتـب التـاریخ، ١٩٧٥، هەروەها: یجب ان لا نتحدپ عن التاریخ بصوره معزوله عـن الزمـن وتفـاعلات الاحـداپ، ١٩٧٥، لەناو ئامیلکەی، الثورة و التربیـة الوطنیـة، وزارة التربیـة، ١٩٧٧، ل. ٣١-٣٦، ل. ٥٣-٦٨. بڕوانـە پێشوکی کتێبەکەی د. فاضـل البراك کە لەبەر ڕۆشنایی ئامۆژگاریەکانی سەدام حوسـەین پێشـنیز دەکات نوسینەوەی مێژوی میللەتی عەرەب دوبارە بکرێتەوە لە سـەر شـێوازی نـوێ، ل. ٩-١٤. لـە

شوێنێکی دیکه د. البراك جەخت دەخاتە سەر ئەوەی کەموامەرات کراوە لەسەر کەسایەتی عەرەبی کەخاوەنی یەکەم شارستانیەتی مرۆڤەو یەکەم شەریعەی بەخشیوە بەمرۆڤایەتی لەسەر زەوی. . هتد. بڕوانە : د. فاضل البراك، المدارس اليهودية و الايرانية فى العراق، دراسة مقارنة، بغداد ، ١٩٨٤، ت. ٢٢٤.

67- Ibid., pp. 436-437.
68- Ibid., p. 439.
69- Ibid., p. 439.

٧٠- بەم بۆنەیەوە بڕوانە هەڵوێستی رۆشنبیرە بەعسیەکان لەناو هـ. س.، ل ٤٣٩-٤٤٣. هەروەها بڕوانە:

Amazia Baram, Culture in Service of Wataniyya: The Treatmeat of Mesopotamian Inspired Art in Bathi Iraq, in , Asian and African Studies, Vol. 17, Fasc. 1-3, 1983, pp-225-313.

٧١- بۆ ئەم مەبەستە، بڕوانە:

Amazia Baram, National Integration and Local orientation in Iraq Under the Bath, in, The Jerusalem Journal of International Relations, Vol.9, Fasc.3,1987, p.45.
72- Amazia Baram, Mesopotamian Identity, Ibid., p.444.
73- Ibid., p. 444.
74- Amazia Baram, Qawmiyya and Wataniya, op.cit., p.190.
75- Ibid., p.445.
76- Ibid., p.45.
77-Jean- Pierre Viennot, Le bath enter theorie et le pratique, in, Orient, 8em annee, 2em trimestre, n.30, 1964, p.14.

٧٨- ميشيل عفلق، في سبيل البعث، ل ١٢٤.

٧٩- ل ١٢٤.

٨٠- ل ١٢٤- ١٢٥.

٨١- ل ١٢٦.

٨٢- ل ١٢٧.

٨٣- صدام حسين، الدور القيادي لرسالة الاسلام، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣، ل ٤.

٨٤- ميشيل عفلق، ل ١٢٧.

٨٥- صدام حسين، هـ. س. ل ٧.

٨٦- ل ٨.

87- Maxime Rodinson, Les Arabes, Puf, Paris, 1979, p.28.

88- Ibid., pp. 28-29.
89- Samir al-Khalil, op. cit., p.259.

٩٠- برِوانه، ل. ١٤.

٩١- ميشيل عفلق، في سبيل البعث، ل ١٢٧- ١٢٨.

92- Samir al-Khalil, op. cit., p.261.

٩٣- صدام حسين، الثورة والنظرة الجديدة، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١، ل ١١٢- ١١٣.

٩٤- ميشيل عفلق، في سبيل البعث، ل ١٢٥.

٩٥- ل ١٢٦.

٩٦- بۆ ئەم مەبەستە برِوانە:

Jean- Pirre Viennot, op. Cit., p.69.
97- Fuad Matar, op. cit., pp.169-170.

# بەشی چوارەم
# بەعس و فاشیزمی مێژوویی

## بەعس و ناسیۆنال سۆسیالیزم:

لەبەشی پێشودا بەعسمان بەشێوەیەکی سکێماتیك پێناسە کردو پیشانمان دا کەئایدۆلۆژیای بەعسی نوێنەرایەتی پان عەرەبیەت دەکات و دەیەوێ ببێ بەتەنها نوێنەری نەتەوەی عەرەب لەناو چوارچێوەی تەنها دەوڵەتێکدا. ئەم دەوڵەتە دەبێ گوزارشت بکات لەیەکێتی ناسیۆنال و هێزو ووزەی لە "یەکچونی رۆحی" ئەندامەکانی وەربگرێت. یەکێتی و ئازادی و سۆسیالیزم کۆڵەکەی مەرکەزی بینای ئایدیۆلۆژیای بەعس و"شۆڕش لەسەرەوە" تەنها رێگایە کەتوانای ئەوەی هەبێت "پەیامی نەمری عەرەب" بەدی بهێنێ . ئەم شۆڕشە رێگا پاك دەکاتەوە بۆ شۆڕشێکی کۆمەلایەتی راستەقینە کەهەوڵ ئەدات، لەرێگەی ژیانەوەی رۆحی عەرەب و گۆڕینی بنەڕەتیی عەقلییەت ، ئادەمیزادێکی نوێ دروست بکات و پەیڕەوێکی کۆمەلایەتی لەسەر مۆدێلی رابوردوی مەزنی نەتەوەی عەرەب بخولقێنێ.

لەم بەشەدا دەمانەوێ لەسەر ئاستی فەلسەفەی سیاسیی بزانین ئەو تایبەتمەندییە سەرەکییانە کامانەن کەبەعس لەناسیۆنال سۆسیالیزم نزیك دەکەنەوە. بەلام پێش ئەوەی ئەم قەوارەیە شیبکەینەوە، دەمانەوێ هێڵ بەژێر ئەوەدا بێنین کەلێرەدا نیازمان نییە هاوتەریبیی مێژوویی و سۆسیۆلۆژی پیشان بدەین. ئاشکرایە کەفاشیزم دیاردەیەکی پوختی ئەوروپیەو لەسەردەمێکی زۆر تایبەتی مێژووی ئەورووپادا هاتۆتە کایەوەو پاشماوەی لۆژیکێکی تایبەتی مێژووی ئیتالیاو ئەڵمانیایە. لەسەر حساب کردنی

ئەم رەچاوگرتنە، هەموو شیكردنەوەیەك كە " هۆكار" و"ئەنجامەكانی" بەرەچاوگرتن وەردەگیرێ دەخەینە ئەولاوە. باسێك كەبیەوێ شیكردنەوەیەكی هۆیی بكات كەلكی نییە چونكە بەعس وەك زۆر دیاردەی تۆتالیتار لەكۆمەڵگەیەك یان لەكەلتورێك سەری هەڵنەداوە كەئەزمونێكی دوورو درێژی سەبارەت بەكاركردنی دەزگاكانی دیموكراسی هەبێت. لەبەر ئەم هۆیە نابێ بەعس بە "كەوانەیەك" یان "نەخۆشیەكی مۆراڵ" بژمێردرێ یان ئەگەر بمانەوێ هەمان گوزارشتی نوسەری ئیتالی بەناوبانگ بێنیدێتتۆ كرۆچێ ( Benedetto Croce ) بەكاربهێنین سەبارەت بەفاشیزمی ئیتالی"لەهۆش چوونێكو خەمۆكیەكی مەدەنیو سەرخۆشییەكی"[1] سەردەمێكی تایبەتی مێژووی عەرەب یان ڕۆژهەلاتە. بەعس، هەروەكو هەموو دیاردەیەكی سیاسی دەسەلاتخواز لەڕۆژهەلاتدا، بەشێكە لەمێژوویەكی پڕ لەكێشەو پاڵەپەستۆی كۆمەلایەتیو ئاینیو سیاسیو ئابوری كە لەژیانیدا نەیتوانیوە بەرەو ڕێگایەكی ڕاستەوخۆ بۆ بەدیهێنانی دیموكراسی بە واتا گەردونییەكەی هەنگاوبنێت. لەم ڕوانگەیەوە، بەعس درێژەدانی بازنەیەكی مێژوییە، كەنازانێ لەكوێوە دەست پێدەكاتو لەكوێدا كۆتایی دێت. بەلام ڕووخساری نوێی بەعس وای لێدەكات كەهێلێكی بچڕاو یان لادانێكی ئایدیۆلۆژی دروست بكات كەهاوتای نەبێت لەنێوان چوارچێوە ئایدیۆلۆژییە تەقلیدییەكانی جیهانی عەرەبو ڕۆژهەلات. ئەم ڕوخسارە نوێیە سەری لە زۆر بیرمەندو ڕۆشنبیر شێواندوە كەتائێستا بە ووتەی مۆنتسكیۆ جەوهەر و "سروشتی" بەعسیان فەرامۆش كردوە. بۆ نمونە چیرۆك نوسی بە توانای فەرەنسی جان پییێر ڤیێننۆ (Jean-Pierre Viennot پسپۆری جیهانی عەرەبە زۆر لە ووتارەكانی میشیل عەفلەقی لەعەرەبیەوە بۆ فەرەنسی وەگێڕاوە دەڵێ" هیچ ئایدیۆلۆژیایەك وەكو ئەوەی بەعس، وابەكەموو كوڕی لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا نەناسراوە "[2]. ڕاستە. بەلام بۆچی واباش نەناسراوە؟ لەوانەیە ئەوانە هیچ بەرژەوەندیەكی تایبەتیان بۆ توێژینەوەی قوڵ و ئالۆز لەسەر بنچینە تیۆریەكانی هەیكەلی بەعسی نەبوبێ. پێش جەنگی كەنداو زۆربەی زۆری نوسەرانی ڕۆژئاواییو ڕۆژهەلاتی، بەعسیان دەخستە ڕیزی ئەو

ناسیۆنالیزمە پێشکەوتنخوازانەی کەدژی کۆلۆنیالیزمو ئیمپریالیزمو زایونیزم ئالای سەربەخۆیی و سەربەستیان هەڵگرتوە. شایستەی ئەوەیە زوو بەزوویی بوترێ کەبێگومان بەعس لەئەنجامی کاردانەوەیەکی بەهێزو توند دژی دۆخێکی دژواربەدەرکەوت، هەر لەئەنجامەکانی پارچە پارچە بوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پاش جەنگی جیهانی یەکەم بگرە هەتا دەگاتە ئەو سەردەمەی کەناوچەی ئەسکەندەرونە لەلایەن فەرەنساوە لەساڵی ١٩٣٩ درا بەتورکیا . دەتوانین بڵێین کەبەعس بەم شێوەیە کۆلۆنیالیزمی ڕۆژئاوایی کرد بەئامانجێکی سەرەکی کینەو رکەبەرایەتی. بەڵام ئەگەر کینەو رکەبەرایەتی هاوبەشە لەنێوان سەرجەم هێزە سیاسیەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کەبوونی خۆرئاواو سیاسەتە کۆلۆنیالیستو ئیمپریالیستەکەی تاوانبار دەکەنو کولتورو عەقلیەتیان بەتەواوی رەفز دەکەن، ئەوەی بەعس بوو بەهۆی دروست کردنی فەلسەفەیەکی سیاسی کە قەوارە تیۆریەکەی زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ پارتە سیاسیە رۆژهەڵاتیو عەرەبیەکان. هیچ ئایدیۆلۆژیایەك کەدەسەڵاتی سیاسی گرتبێتە دەست ئەو تایبەتمەندیەی بەعسی نییە. دەمانەوێ باس لەو تایبەتمەندیە بکەین، واتا ئەوەی کەبەندە بەناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژیو تیۆری بەعسو کاریگەریی بۆ سەر هەڵسوکەوتی سیاسی حکومەتی بەعسی عیراقی. لەڕێگەی شیکردنەوەی ئەم ناوەرۆکەوە دەمانەوێ ئەو "خزمایەتیە" یاخود ئەو هاوتەریبیە یان ئەو لەیەکچوونە فەلسەفیو ئایدیۆلۆژیە لەنێوان بەعسو فاشیزمی مێژوویی دەربخەین. ئەم هاوتەریبیە پەیوەندی بەبیرو باوەڕی سیاسییەوە هەیە واتا نەخشەی گشتی ئایدیۆلۆژیای بەعس: ئەو ئایدیۆلۆژیایەی کە لەسەر کۆمەڵێك پرینسیپو بەها پێناسە دەکرێ کەجیهانبینیەك دەخەنە ڕوو بۆ بەدیهێنانی پرۆژەیەکی سیاسی کردەوەو گۆڕان.

## دەوڵەتی ناسیۆنالی بەعسیو ناسیۆنال سۆسیالیزم

یەکەم تایبەتمەندی گشتی کەبەعس لەناسیۆنال سۆسیالیزم نزیك دەکاتەوە بریتییە لەویستی بەعس بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنال لەسەر بنچینەی ڕابوردوو. ئەم ئاواتە دەوەستێتەوە سەر کیلیازمێکی یوتۆپی کە لەڕاستیدا لەدۆخێکی جیۆپۆلیتیکی لەیەکچوو یان هاوبەش سەرهەڵدەدات. بەم واتایە ناسیۆنال سۆسیالیزم دەبێ بە "سەر چاوەیەکی ئیلهام" بۆ ئایدیۆلۆژیای بەعس. وەفیق رەئوف تێبینی ئەوە دەکات کە مۆدێلی ئەڵمانی زۆر شیاوە بۆ ئەوەی کار بکاتە سەر بیری ناسیۆنالیستی عەرەبی: "(. . .) ئەمە تەنها بەهۆی خۆشەویستی ئەڵمانیای رایخی سێیەم نییە بۆ سەربەخۆیی جیهانی عەرەب لەسەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا، بەڵکو بەتایبەتیش، لەبەر ئەوەی پێوانەی یەکێتی ناسیۆنال پشتی دەبەست بەگەڕانەوە بۆڕابوردوو و گەڕان بەشوێن یەکبونێك کەبنچینەکەی زمانو کولتورو رەگەز بوو"[٣]. ناسیۆنال سۆسیالیزم دەیویست "ڕایخی هەزارساڵە" دابمەزرێنێ: ئەم ئیمپراتۆریەتە نوێیە دەبوایە هەموو ئەورووپای بگرتایەتەوە لە " ئۆقیانۆسەوە بۆ ئۆراڵ". ئەو کۆمەڵگا جەرمانییەی کەناسیۆنال سۆسیالیزم دەیخواست بنیادبنرێ "هەمووی لەناو سنوری سیاسی ئەڵمانیادا نەبوو". ئیدیالی ناسیۆنال سوسیالیزم ئەوە بوو کە"دایکی نیشتمان" هەمووی لەناو تەنها یەك دەوڵەتدا کۆبکاتەوە. پەیوەندی لەنێوان ئەم کۆمەڵگایەو دەوڵەتی نوێ، دەبوایە لەسەر بناغەی یەکگرتنی ئەڵمانیای گەورە بنیادبنرایە، بەلابردنی سەرجەم سنورە سیاسیەکان. ڕایخی سێیەم نەدەبو"لەسەر بناغەی دەوڵەتە جەرمانیەکان بوەستایە، بەڵکو دەبوایە لەسەر بنچینەی تەواوی میللەتی ئەڵمان وپارتی ناسیۆنال سۆسیالیزم بنیاد بنرایە"[٤].

ئایا بەعسیش هەمان تێڕوانینی نییە؟ هەروەکو تێبینیمان کرد لەبەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەعسیش بەهەمان شێوە دەیەوێت ئەو دەوڵەتەی نوێنەرایەتی نیشتمانی عەرەب دەکات لەگەڵ هەمان ئەم پێوانانە بگونجێ: ئەم پێوانانە تەواوی ئەوزەویانە دەگرنەوە کەعەرەب تیایاندا دەژیو تەنانەت ئەو زەویانەش

که لەناو سنووری چەند ولاتێکی ناعەرەبدان. یان عەرەبی "ئیریدێنتیستی" بەعس ( بڕوانە بەشی یەکەم) هەروەکو ئەوەی ناسیۆنال سۆسیالیستە. دکتۆر ستێیناشەری Steinascher حیزبی نازی دەیگوت: " ئێمە میللەتێکی سەدملیۆنین. ئەڵمانیا تەنها دەوڵەتیك نییە کەپێی دەڵێن ئیمپراتۆریەتی ئەڵمان‌و هەموو ئەو زەویانە دەگرێتەوە کەئەڵمان تیادا دەژی، ئەڵمانیا سەرجەم ئەو زەویانە دەگرێتەوە کەدانیشتوانی بەئەڵمانی ئاخافتن دەکەن‌و بەئەڵمانی بیر دەکەنەوە. ئەڵمانیا هاونیشتیمانی ئەڵمان دەگرێتەوە کەهاووڵاتی دەوڵەتەکانی دیکەن[٥]. ئەم داخوازیە ئێتنیکی‌و زمانیە کەبنچینەکەی پێکهاتوە لە مافی مێژوویی، وا لەدروشمی بەعسی دەکات "من المحیط الی الخلیج" کە لەدروشمی ناسیۆنال سۆسیالیزم " لە ئۆقیانوسەوە بۆ ئوراڵ" نزیك بێتەوە، چونکە نەوەك لەبەئەوەی لەڕووکەشدا لەیەکتری دەکەن بەڵکو لەبەر ئەوەی ئاوات‌و خواستی هەردوکیان لەسەر هەمان پرۆژەی یوتۆپی دەوەستنەوە. بێگومان، ئەم هاوتەریبیە واتای کۆنکرێتی خۆی وەرناگرێ‌و هیچ گرنگیەکی زانستی نابێ ئەگەر ماکە ئایدیۆلۆژیەکانی دیکە تەواوکەری نەبن، واتا ئەو ماکانەی کەپەیوەندیان هەیە بەتیۆری دەوڵەت‌و دیدی دەستەبژێریی ئریستۆکراسی‌و چەمکی نەتەوەو. . هتد.

## تیۆری دەوڵەتی بەعسی

بیرو باوەڕی تیۆری بەعس سەبارەت بەپەیوەندی نێوان دەوڵەت‌و کۆی ناسیۆنال زۆر جار لەوانەی ناسیونال سۆسیالیزم دەکەن. لەم بارەیەوە بەعس‌و ناسیۆنال سۆسیالیزم، هەردوکیان، هەمان لۆژیکیان هەیە. ئەم لۆژیکە لەچی پێك هاتوە؟ دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوە تێبینیان بکەین:

یەکەم/ لەڕوانگەی بەعسەوە، نەتەوەی عەرەب لەبارو دۆخێکی زۆر ناخۆش‌و دژواردا دەژی. خراپ بوون‌و شێواندنی نەتەوە لەئەنجامی هەرەسهێنانی ڕۆحی ڕەسەنی عەرەبە.

دووەم/ پێویستە ئەم ڕۆحە زیندو بکرێتــەوە، بـەڵام ئـەم زیندوکرنەوەیـە یـان ئـەم ژیاننەوەیە (بەعس) نایەتەدی ئەگەر ئەو سنوورە دادوەریانەی کەنەتەوە جیا دەکەنــەوە لەدەوڵەت دانەمرکێنرێن. بۆ ئەم مەبەستە، پێویستــە دەوڵـەت بەشێوەیەکی بـەهێزو کاریگەر ببەستێنرێت بەنەتەوەوە ، بەشێوەیەك کەدەوڵەت لەناو باوەشی نەتــەوە خـۆی بدۆزێتەوە.

سێیەم/ ئەم بەیەکەوەبەستنەوەیە نایەتەدی بەبێ لکاندنی نەتەوە بەحزبـەوەو دەبــێ هەموو هێزێکی سیاسی کەنیازی هەیە هاوبەشیەکی دیموکراسی بکات بخرێتە لاوە.

کاتێ میشیل عەفلەق بەرەنگاری کێشەی پەیوەندی نێوان دەوڵەتو نەتەوە دەبێتەوە، تیشك دەخاتە سەر ئەوەی کەنەخۆشی نەتەوەی عەرەب بریتیە لەنەتەوەی عەرەب "خۆی لە خۆیدا". چونکە نەخۆشیەك نییە کەپەیوەست بێ بـەئۆرگانیزمێك کـەپێی دەوتـرێ دەوڵەت، واتا نەخۆشیەکە کەنەتەوەی عەرەبی گرتۆتەوە: نەخۆشــیەکە کـە "خـۆی لـە خۆیدا" نەخۆشــی نەتەوەیــە. بەشــێوازێکی دووروو درێــژی زیــاد لەپێویســتو بـەبێ خۆبەستنەوە بەشــێوازێکی لۆژیکێکــی ڕێکوپێکــی فەلســەفی دادوەریو پڕلەهەڵــەی گرامەرو سینتاکس، میشێل عەفلەق تێبینی دەکات کە بەپێچەوانەی میللەتانی دیکە کەژیانی سیاسیو ئابوریان تەواوە، کێشەی وولاّتە عەرەبیەکان ســەبارەت بەپــەیوەندی نێوان دەوڵەتو کۆی ناسیۆنال جیاوازە. لــەم کۆمەلاّنــەدا گـەورەترین کێشــەی پارتـە سیاسیەکان ئەوە نییە بیربکەنەوە چۆن چاکسازی لەنەتەوەدا بکــەن، چونکـە "نەتــەوە لەوێ بوونی هەیە" (فالامة هناك قائمة)[٦]. قەوارەی نەتەوەیی شتێکە کەبوونی هەیــەو میللــەتانی ئــەو ولاّتانــە بــەهێزو گونجــاوو هوشــیارن ســــەبارەت بــــەبوونو بەرژەوەندیەکانیان[٧]. بەڵام جیهازی کارگێڕی دەوڵەتیان کەمو کورتی زۆرە. لەبەر ئەوە کێشەی ســەرەکی ئــەم کۆمەلاّنــە پێکــهاتوە لەچۆنیــەتی ئامــادەکردنی ڕای گشــتیو ڕێکخستنی ئەندامان لەپێناوی چاکسازی کردنــی دەزگاکــانی دەوڵـەت پــاش گرتنــە دەستی دەسەلاّت[٨]. لەم وولاّتانەدا، دەوڵەتو جیهازی کارگێڕی باش کار ناکەنو پارتە سیاسیەکان کە بەنۆرە حوکم دەگرنە دەست سەرقاڵی چاکسازی کردنی دەوڵەتن.

لەدارِشتنی ئەم لۆژیکە دەتوانین چ شتێك تێبگەین ؟

لەراستیدا ئەم لۆژیکــە دەیـەوێ ئـەوە بخاتـە ڕوو کـەپلورالیزمی( فرەلایـەنی) سیاسی لەولاتە دیموکراسیەکان بەدی هاتوەو هەیە لەبەر ئەوەی کێشـەی بەشـی زۆری پارتە سیاسیەکان ئەوە نییە کەکار بکەن بۆ بنیادنانی کۆمەڵ.

کۆمەڵ لەم ولاتانــەدا سـەبارەت بـەبوونی خـۆی هۆشـیارەو گەیشـتۆتە قۆنـاغێك لەگەشـەکردنو پێشـکەوتن کـە دەزانـێ ویسـتو بـەرژەوەندی خـۆی چیـە. بـەلام بەپێچەوانـەی ئـەم کۆمەلانـە، نەتـەوەی عـەرەب زۆر ئەشـگەنجە دەکێشـێ چونکـــە لەقۆناغێکی زۆر ئالۆزو دژوار ئـەژی. کـەموکورتیو کارنـەکردنی دەولـەت لەوولاتـە عەرەبیەکان بەشێوەیەکی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بارودۆخـە[٩]. ئـەم کەموکورتیـە ئەنجامی ناتەواوی ژیانی گەلەکەیــەو هــەر لەبــەر ئەوەشـەکە " نەتەوەکـە پێوسـیتی بەچارێك هەیە"[١٠]. لە بەرئەم هۆیە پارتی بەعس بە شـوێن وەلامـی ئـەم پرسـیارەی خوارەوە دەگەڕێ: چۆن دەتوانرێ " پێش چارەکرەسەرکردنی دەولـەت نەتـەوەی عـەرەب چارەسـەر بکـرێ "(؟)[١١]. گومـانی تێـدا نییـە، پێشـینەیی بەعسـی بنیادنـانێکی دیموکراسی نییە: بنیادنانێکی دیموکراسی نییە کە پەیوەسـت بـێ بـەوەی کـار بـدرێ بەچەند ئۆرگانێکی بڕیاردان یان ژمارەیەك لەپارتی سیاسی. چونکـە کێشـەی بـەعس بریتیە لە دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ ئەو نەخۆشیو ئازارەی کە نەتەوەی عەرەب تووشی بوە. "نەتەوەکەمان نکوڵی لەوە دەکات کەلەئەنجامی خەوتنێکی درێـژ خایـەن توشـی شێواندن بوەو وای لـێ هـاتوە کـە ئیـتر خـۆی نەناسـیتەوەو پارچـەکانی لـە یـەکتری جیانەکاتەوە. بەشێوەیەکی وا دابەش بـووە کەئـەندامو بەشـەکانی نکولـی لەیـەکتری ئەکەنو گەیشتونەتە ئاستێکی نزم لەخۆپەرسـتیو لێکدانـەوەی بـەرژەوەندی بچـوكو ئاستێکی ڕەقو بێ جولە"[١٢].

دەبێ زوو بەزوویی تێبینی بکەین کە ئەم شـێوازە فیختەییـە لـەدەربڕینی نـاڕەزایی سەبارەت بـە میللـەت بەشـێوەیەکی گشـی هیـچ دوور نییـە لـەلۆژیکی فاشـیزمی مێژوویی‌و بەشێوەیەکی تایبەتیش لەناسیۆنال سۆسیالیزم. ئەگەر بەم بۆنەیەوە بمانـەوێ

بیرو باوەڕی نازیەت شیبکەینەوە، ئەم دابەزینە بۆسەر گیانی میللەتو ئەم سکالاٌ دەربرینە سەبارەت بەناخۆشیو ئەشکەنجەی میللەتو لەئەنجامدا دانی مافو شەرعیەت تەنها بەخۆ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، بەشێوەیەکی سیستیماتیك هاوتەریین لەگەڵ بیرو تێڕوانینی نازیەت. لەزۆر بۆنەو زۆر شوێندا لەئەڵمانیای ڤایمەردا هیتلەر نارەزایی خۆی دژی ئەودۆخە دەردەبڕێ کە ئەلمانیای کۆماری ڤایمەر تیایدا دەژیا. هیتلەر ژیانی ئەلمانیەکانی لەگۆشەیەکی ئابڕوبەرانەوە پیشاندەدا. ئەو خەتەرو مەترسیەی کەهەڕەشەی لەئەڵمانیا دەکرد لەڕوانگەی هیتلەرەوە پێکهاتبو لەهەرەسهێنانێکی مۆرالی[١٣]. هیتلەر دەیگوت،" هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتو میللەتی ئەڵمان ئەوەندە قوڵە کە لەوە دەکات هەموو کەسێك تووشی کوێرەوەریو بێ هەستیو بێ عەقلیی بوبێت،. کەس بەشێوەیەکی تەواو مەزنیی ڕابوردووی لەبیر نەماوەو ئەو هێزو جوانیەی جاران وەك خەوێك دێتە پێش چاو کاتێك بەو هەژاریە زۆرەی ئەمڕۆ بەراورد دەکرێ "[١٤]. هەر وەکو ئاماژەمان پێکرد، ئەم هەڵوێستە بە شێوەیەکی سیستێماتێك لەبیری هێتلەردا تێبینی دەکرێ. ئەم قەوارەیە کۆکەرێکی هاوبەشە (قاسم مشترك) لەنێوان بەعسو ناسیۆنال سۆسیالیزمداو کۆڵەکەی بیری هەردوکیان دەباتەوە سەر سەقفێکی دیکەی بیری فیختەیی. باتەماشای لایەنێکی تری ئەم لۆژیکە بکەین.

ئایا میشێل عەفلەقو بەعس پشت بە چ لۆژیکێك دەبەستن بۆ ئەوەی هۆکارەکانی تێکوپێك چوونو هەرەسهێنانی تەواوی نەتەوەی عەرەب بخەنە ڕوو؟ لەڕاستیدا ئەپۆلۆژی apology بەعسی ئەوەندە جیاوازی نییە لەگەڵ ئەوەی نازیەتدا. بێ گومان، بە پاڵ هەندێ تەبریراتی سیاسی پوختدا، عەفلەق شێوە باسێك دێنێتە پێشەوە کەسروشتێکی ئۆنتۆلۆژی مێژوویی هەیە. عەفلەق دەڵێت هۆی ئەم تێكو پێکچوونە دەگەڕێتەوە سەر هەرەسهێنانی ئەو ڕۆحەی کەجاران پاڵی بەعەرەبەوە دەنا یەکگرتوبن. لادانو دواکەوتنو شێواندن تەنها ڕووکەش نین، بەڵکو ئەنجامی لاواز بوون یان کەوتنی یان کاڵ بوونەوەی ڕۆحی عەرەبیە[١٥]. ئەم دۆخە نێگەتیڤە دەگەڕێتەوە سەر زۆر

فاكتەری جیاواز لەچەند كاتێكی جیاوازدا[١٦]. باشە، ئەم فاكتەرانە چین و لەچ سەردەمێكدا بوونە هۆی هەرەسهێنانی ڕۆحی عەرەبی؟

بۆ ئەوەی باش لەمە تێبگەین، پێوستە بەكورتی هەندێ خاڵی تر ڕوون بكەینەوە كە لەبەشی یەكەمی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا بەرەنگاری بوین. میشێل عەفلەق دەڵێ "پەیامی نەمری عەرەب پێش هەموو شتێك پێكهاتوە لەباوەڕ"[١٧]. واتای ئەم باوەڕە ئەوەیەكە یەكێتی عەرەب دەبێ "بناد بنرێتەوە" نەك تەنها لەڕوی سیاسیەوە، بەڵكو لەڕوی ڕۆحیشەوە[١٨].

باشە، ئەگەر یەكێتی سیاسی واتای ئەوەبێ كە هەموو وڵاتە عەرەبیەكان بین بەیەك لەناو دەوڵەتێكداو لەژێر دەسەڵاتی بەعس، ئایا واتای یەكیەتی ڕۆحی چییە؟ ئەوە ڕوونە كە واتاكەی لەناو جەوهەری "پەیامی نەمر" دا خۆی دەدۆزێتەوە. ئەم پەیامە لەچی پێكهاتوە؟ پێكهاتوە لەبوونی نەتەوەی عەرەب لەسەردەمێك كەیەكێتی ڕەچەڵەك و وڕەگەزی (وحدة الاصل والعنصر) دەخستە ڕوو.[١٩]. پاش ئەوەی كە ئەم "ماكە"، كاریگەری و تەوژمی خۆی وون كرد، نەتەوەی عەرەب دەستی كرد بەپرۆسەیەكی تێكشكاندنی بەردەوام و بێ كۆتایی. كەواتە دەبێ ئەم پەیامە نەمرە بژێنرێتەوە، واتا بەعس دەبێ دیسانەوە ڕابوردو لەسەر بنچینەی یەكێتی" ڕەچەڵەك و ڕەگەزی" جارانی نەتەوەی عەرەب دووبارە بكاتەوە. بیرۆكەی "پەیامی نەمر" بەشێویەكی زۆرەكی وادەكات كەڕابوردوو نەك تەنها وەك ڕوداوێك كەیەكێتی نەتەوەی عەربی بەرز دەنرخان و پیرۆزی دەكردبەڵكو بەتایبەتی وەك پەیوەندیەكی ڕاستەقینە لەنێوان ئێستاو داهاتودا تەماشا بكرێت[٢٠]. "ڕابوردوو شتێكی ڕاستەقینەیەو شتێكی ڕەسەنە لەژیانی نەتەوەكەماندا و كارێكی هەڵەو نەزۆكانەیە ئەگەر بیر لەوە بكەینەوە نكوڵی لەو رابوردوە بكەین.... ئێمە مەبەستمان لەرابووردو ئەو سەردەمەیە كەڕۆحی عەرەبی هاتبوە دی". ئەی مەبەستمان لەداهاتوو چیە؟ ئەو داهاتوەی كە پاڵمان پێوە دەنێ بۆ تێكۆشان بریتیە لەو سەردەمەی كەدەبێت ڕۆحی ڕەسەنایەتیمان بێتە دی[٢١].

به پێچەوانەی تەیارە ئایدیۆلۆژیەکانی دیکە ( کۆمونیزم‌و لایەنگرانی خۆرئاواو شارستانیەتی خۆرئاوا ) کە هەوڵ دەدەن ڕابوردو ڕەتبکەنەوە، بەعس ژیانی نەتەوە بەلەشێکی ژیاو (جسم حی) دەچوێنێ کە لەڕابوردودا تەندروست بوەو دواییش نەخۆش کەوتوەو پێشکەوتنیش واتای چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییەو واتای گەڕانەوەی نەتەوەیە بۆ دۆخێکی ساغ[٢٢]. لەچ سەردەمێکدا نەتەوەی عەرەب توشی ئەم نەخۆشیانە بوە؟

لێرەدا میشێل عەفلەق دەبێ قورسترین کێشە چارەسەر بکات: ئیسلام. ڕاستە ئاینی ئیسلام لەسەر پرینسیپی مرۆڤایەتی هاتۆتە کایەوە، بەلاّم ئەوەش ڕاستە کە بەلای عەفلەقەوە ئیسلام گوزارشتی لەپەیامی عەرەب‌و هەستی ناسیۆنالیستی عەرەبی دەکرد[٢٣]. ئیسلام سەرجەم ئەو بەهایانەی تێکشکاند کەپاڵپشتی جاهلیەت بوون. ئیسلام نوێنەرایەتی ڕۆحی عەرەبی دەکرد[٢٤] بەو واتایەی کەمرۆڤی عەرەب متمانەی بەداهاتو هەبوو. بەم شێوەیە جیهان بوو بەشانۆی چالاکیەکانی، ئەو شانۆیەی کە بەهاکانی نوێی ژیانی عەرەبی دەردەخست. بەم شێوەیە گواستنەوە لەجاهلیەتەوە بۆ ئیسلام ئازادی ئادەمیزادی عەرەبی دەردەبڕی. دیسانەوە ئەم پرسیارە دووبارە دەکەینەوە: میشێل عەفلەق دەست بۆ چ سەردەمێك ڕادەکێشێت؟ بۆ ئەوسەردەمەی کەکشان‌و پاڵەپەستۆی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی کەتیایدا "ڕەگەزی" عەرەب خۆی دەسەپاندو زۆر میللەتانی جیا جیا توانەوە لەناو بۆتەقەی عەرەبدا؟ یاخود بۆ سەردەمی پەیامبەرو چوار خەلیفەی ڕاشدین‌و ئەمەویەکان‌و ئەو بنەماڵانەی کەدوا بەدوای ئەودا هاتن بەتایبەتی پاش ساڵی ٧٥٠؟ ئەم ئاماژەپێکردنە مێژووییە زۆر پێویستەو بڕیاردەرە بۆ تێگەیشتنێکی باشی دەرئەنجامی داستانی عەفلەقی . گومانی تێدا نییە کەئاینی ئیسلام دەکەوێتە نێوان مێژووی عەرەب لەسەردەمی جاهلیداو سەردەمی فتوحات. دەزانرێ کەپەیامبەر توانی بەماوەیەکی زۆر کورت باوەڕی تازە بەسەر عەرەبدا بسەپێنێ. لەڕیگەی ئەم باوەڕە نوێیە، عەرەب توانیان خۆیان بەسەر زۆر لەگەلانی جیهان بسەپێنین. لەماوەی کەمتر لەسەدەونیوێك توانیان زۆر میللەت بخەنە ژێر دەسەلاّتی خویانەوە: تورك، فارس، کورد، بەربەر، هتد.. لەسەردەمی چوار

خەلیفەی ڕاشدیندا (٦٥٦ ـ ٦٣٢)، عـەرەب سوریاو میزۆپۆتامیـاو ولأتـی فـارس‌و کوردستان‌و میسرو لیبیایان داگیرکرد. ئەمجا، لەژێر دەسـەلاتی ئەمەویـەکاندا(٧٥٠ ـ ٦٦١) گەیشتنە هندو ئاسیای بچوك‌و ئـەفریقای ژووروو ئەسپانیا. بـەلام نابـێ ئـەوە فەرامۆش بکرێ کەئەو قۆناغەی پێی دەوترێ عـەرەب لـەمێژووی ئیسـلامیدا تەنـها "کاتێکی کورتی خایاند"[٢٥] وەکو عەفلەق دەڵێ هەمووی یەك سەدەو نیوی خایـاندو لەگەڵ کەوتنی ئەمەویەکان لەساڵی ٧٥٠ دا گەیشتە کۆتایی.

ڕوداوی بنەماڵـەی عەباسـیەکان سـەرەتایەکی پـڕ لەپرۆسـەیەکی دوورو درێـژی هەرەسـهێنانی خسـتە ڕووەو ئیژێمۆنـی hegemony ئیلێمینتـی عـەرەب ووردە ووردە دەستی کرد بەپاشەکشەو گەڕانە دواوەو گۆشەیەکی بەتالکرد بۆ پێکەوەژیانی ئیتنیـە جوراو جۆرەکان. ئەگەر لـەبارەی کولتـوری‌و کۆمەلایـەتی‌و ئابووریـەوە عەباسـیەکان توانیبێتیان بگەنە لوتکەی درەوشاندنەوەو پەرەسەندن، لەسەر ئاستی سیاسیدا هـێزی پالپێوەنـەری خەلیفـە نوێکـان ووردە ووردە ڕوی کـردە سـیس بونـەوەو نـەیانتوانی کۆنترۆلێکی ڕاستەوخۆ بەسەر خەلیفەکانی کۆردۆڤاو مەغریب‌و تورکیاو ئەسپانیا. . . هتد بکەن. بەپێچەوانەوەی ئەمەویەکان کەسیاسەتێکی ئیژێمۆنـی عـەرەبییان پـەیڕەو دەکرد، عەباسیەکان کە لەڕێگەی فارسەکانەوە دەسەلاتیان گرتـە دەسـت، ووردە ووردە دەستیان کردبوو بـەونکردنی ئیژێمۆنـی‌و لەدەسـت نـەمانی دەسـەلات‌و کاریگـەریی کولتـوری فارسـی خـۆی بەسـەر ژیـانی سیاسـی عەرەبـەکاندا سـەپاندبوو. ژیـانی ڕۆشنبیریی‌و کولتوریی، لەپاڵ چوارچێوەیەکی عەرەبیەوە، زۆر لایـەنی ژیـانی فـارس‌و ئاسوری‌و کلدانی‌و هندی‌و هتـد.. دەگرتـەوە. بـەهاتنی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی بـۆ سەردەسەلات لەسەدەی چواردەهەمدا، چەرخی عەباسیەکان کوژایەوەو سەرەڕای چـەند قۆناغێکی کەوتن‌و لاوازیی، عوسمانیـەکان توانیـان سـەرکەوتن بـەدیبێنن‌و کۆتـایی بەمەزنیی گروپێکی ئیتنیکی بهێنین کەچـەند سـەدەیەك لـەوەو پێـش ئەکتـەری بـێ هاوتای مێژووی جیهانی ئەوسا بوون. ئەم ڕوداوە تەنها هەرەسهێنانی تەواوی دەسـەلاتی عەرەب‌و ملکەچیان بۆ هێزێکی بێگانە مۆرنەکرد، بەڵکو زۆر ئیلێمێنتـی ئیتنیکیـی

پێکەوە تێکەڵاوکردو کوتلەیەکی سۆسیۆلۆژی دروست کرد کەعەرەب لەناویدا هەرچەندە زۆر بوو، بەڵام تەنها بەشێکی پێکدەهێنا. ئیدی نابێ ئەوە لەبیر بکرێ کەئەم مێژووە بەشێوەیەکی گشتی هاوبەشیی دەکات لەچوارچێوەیەکی مێژوویی وەك کۆی چەند ڕوداوێك کەتەواو بوەو لەکتێبەکانی مێژوودا دەخوێنرێ. بەڵام دەرخستنی ناوەرۆکە ئێتنیکیەکەی یان ڕەگەزیەکەیو "بەئایدیۆلۆژی کردنی" یان "بەسیاسی کردنی" یان "بەناسیۆنالیزەکردنی" یان "بەڕۆحی کردنی"، نابێ جیهانبینیەکی تایبەتی بخاتە ڕوو. مێژوو و پرۆسەی مێژویی نابێ بکرێ بەداردەستێك بۆ پیرۆزاندنی ڕۆڵی گروپێکی ئێتنیکی. لەم ڕوەوە باهەوڵ بدەینو بزانین چۆن بەعس بەزمانی میشێل عەفلەقەوە "کەوتنو لاوازبوونی رۆحی عەرەبی" باس دەکاتو بۆچی ئایدیۆلوژیای بەعس داوای ژیاننەوەی (بعث) ڕۆحی عەرەبی دەکات.

"ئەو سەردەمەی کەعەرەب لەدۆخی پێش ئیسلامەوە کەبەسرابونەوە بە ژیانی پەیوەست بە بەهاو نەریتی کۆ، هاتنە ناو ئیسلام و ژیانێکی پڕ لەئازادی تاكو یەکسانی نێوان تاکەکانیان بە دی هێنا، زۆر کورت بوو. زۆری پێ نەچوو جارێکی تر نوقم بونەوە لەناو زەریای بێ کۆتایی گەلانی بێگانە. لەو کاتەوەی کەهەستیان بەیەکیەتی نەتەوەیی نەماو نوقمی ژیانی گەلانی جیا جیا بوون، جارێکی تر گەڕانەوە سەر نەریتی دوا کەوتو و کێشەی تیرەو بەیەکادانیان . . . هەر بەدوای ئەمانەدا، سەدەی لاوازبونیان دەستی پێ کردو ئەو هاوڕەگەزیەیان وون کرد"[٢٦].

گرنگی ئەم جیهانبینیە لەوەدایە کەزۆر لایەنی سەیر دەخاتە پێش چاو. بێگومان عەفلەق لاواز بوونو هەرەسهێنانی "ڕۆحی عەرەبی" دەگەڕێنێتەوە سەر تێکەڵبوونی میللەتان، واتا تێکەڵ بوونی میللەتان بەعەرەبەوە، عەرەب وەك ماکێکی پۆزەتیڤ.

ئایا هیچ هاوتەریبیەك لەگەڵ ناسیۆنال سۆسیالیزمدا تێبینی دەکرێ؟ چ لۆژیکێك ئەم دوو تێڕوانینە لەیەك نزیك دەکاتەوە؟

بائەم دوو لۆژیکە شیبکەینەوە: کاتێك عەفلەقو بەعس (بەتایبەتی سەدام حوسەین) سەرنجمان سەبارەت بەئیسلام وەکو دیاردەیەکی ناسیۆنالیست ڕادەکێشن،

ئەوان پەنجە بۆ سەردەمی فتوحاتی بێ هاوتای عەرەب ڕادەکێشن، واتا ئەو سەردەمەی کەعەرەبی دەرپەڕان‌و بردینیە دەرەوەی دورگەی عەرەب‌و کردنی بەخاوەنی چەند ناوچەیەك‌و دەسەڵاتیانی فراوان کرد. لەو کاتانەوە وەکو عەفلەق دەڵێ "غرقوا فی تلك اللجة المتباینة المتماوجة من الشعوب". هەروەها وون کردنی "التجانس القومی" دەستی پێ کرد لەو کاتانەی کەعەرەب لەدەریایەکی بێ سنوور لەناو گەلانی بێگانەی جیاوازدا "نوقم بوون" ، واتا تێکەڵبوونی ئەو ڕەگەزو میللەتانە بوو بەهۆی تێکدانی "یەکێتی ڕەچەڵەك‌و ڕەگەز". ئایا ئەم لۆژیکە لەناو فەلسەفەو جیهانبینیی چ ئاراستەیەکی ئایدیۆلۆژی بەدی دەکرێ؟ ئایا هیچ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ ئەوەی ناسیۆنال سۆسیالیزمدا؟ بابزانین چ پەیوەندیەکی ئۆنتۆلۆژی تێبینی دەکرێ. عەفلەق‌و سەدام حوسەیەن نازناوی " وێنەیەکی بچوککەرەوەی نەتەوەی عەرەب" و "ڕۆحی یەکەمی عەرەب" دەدەن بەپارتی بەعس‌و وامان تێ دەگەیەنن کەبەعس بەبێ هیچ مەرجێ هەڵبژێردراوە بۆ ئەوەی نەتەوەی عەرەب لەتێکچون‌و هەڵوەشاندن ڕزگار بکات. ناسیۆنال سۆسیالیزمیش پارتی نازی دەکرد بەجەوهەری ڕەگەزی ئەڵمان‌و "بزوتنەوەکەی" دەسەپاند بەسەر میللەتی ئەڵماندا وەك ڕزگارکەرێکی ئەم رەگەزە کەبوبوو بەقوربانیی ئەم تێکشکاندنە. بێگومان، هیتلەر نەیدەتوانی "رەگەزی مەزن"[٢٧] لەتێکچون‌و بۆگەنکردنی ڕۆحی‌و ڕۆشنبیری رزگار بکات ئەگەر خۆی بەچاککەری ئەم هەرەسهێنانە دانەنایە. هیتلەریش دەیگوت تێکەڵبوونی خوێنی ڕەگەزی ئاری بەمیللەتانی نزم، ئاکارەکەی ئەم شتانەی خوارەوە بو: "نزم بوونەوەی ئاستی ڕەگەزی بەرز"، "گەڕانەوە دواوەی فیزیکی‌و ڕۆشنبیری‌و لەئەنجامدا دەرکەوتنی جۆرێك لەدیدەی دواکەوتوو"[٢٨]. هەروەها هیتلەر هێڵی بەژێر ئەوەدا دەهێنا کە تائەو کاتەی کە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ڕەگەزی ئاری توانی لەدۆخێکی مۆرالیی خاوەن دەسەڵاتدا بمێنیتەوە، توانی بەپاڵ ئەوەشەوە ببێ بەپارێزەری شارستانیەت‌و بەردوام بێ لەگەشەپێدانیدا. لەکاتیکدا کەمیللەتانی ژێر دەست گەشەیان سەندو پەروەردە کران، دەستیان کرد بەنزیکبوونەوە لەداگیرکەری ئەڵمان. بەم شێوەیە ئەو جیاوازیانەی

کەخاوەن‌و خزمەتکارانیان جیا دەکردەوە نەمان. ڕەگەزی ئاری وازی لەپوختیی خوێن هێناو بەهۆی تێکەڵ بوونی چەند ڕەگەزێك توانا شارستانیکارەکانی وون کرد. لەکۆتاییدا وەك دەست بەسەراگرتوەکانی لێهات، ئەمەش نەك تەنها لەسەر ئاستی ڕۆشنبیری بەڵکو لەسەر ئاستی فیزیکیش. بەم شێوەیە ئەو پلە بەرزەی وون کرد کەباوو باپیرانی هەیبوو بەسەریاندا[٢٩].

پێویستە بەم بۆنەیەوە ئەو ڕاستیە بخەینە پێش چاو کەمیشێل عەفلەق ئەو راستەوخۆییەی هیتلەری نییەو ئەگەر بەراوردی بکەین بەهیتلەر، تێگەیشتنی بۆ مێژوو و ڕەگەز پەرستی زۆر ناراستەوخۆترە. لەسالآنی نێوان هەردوو جەنگدا هیتلەر لەهەموو شوێنێکدا ئەم لۆژیکەی بەئاشکرا دەردەبڕی. بەلآم هەرچۆنێك بێت، سەرەرای تەوژمی جیاوازی حوقبەی (حقبة ) مێژوویی‌و کولتوری‌و دۆخی بابەتی سیاسی دوو جیهانی دوور لەیەك، میشێل عەفلەق‌و هیتلەر، بەعس‌و ناسیۆنال سۆسیالیزم بەهەمان شێوە تەماشای مێژوو دەکەن. هەردووکیان هیچ دوودڵ نین سەبارەت بەدانانی ملکەچکردنی میللەتانی بێگانەو تواندنەوەیان لەناو ئێلێمێنتە دروستکەرەکانی میللەتی داگیرکەر وەك چەرخێکی ئاڵتونی کەتیایدا لەیەکچونی ئێتنیکی کامەرانی‌و بەختەوەری بۆ مرۆڤ دەخەملآند. هەروەها، هیچیش دوودڵی ناکەن لەهاوێشتنی نەعلەتی شەیتان دژی ئەو پرۆسەیەی کە ئەو "لەیەکچونەی" لەناو بردو میللەتی بەرەو ئاراستەی پرۆسەی "هەڵوەشاندن" و"بۆگەن کردن"برد. هیچیش دوودڵی ناکەن لە"ئایدیۆلۆژیزەکردنی" مێژوو وەك کۆمەڵێك لەچەند ڕوداوێکی بابەتی.

جگە لەمەش، میشێل عەفلەق مەبەستی لە "ماوەیەکی زۆر کورت" ئەو سەردەمەیە کەئێلێمێننتی عەرەب خۆی بەسەر میللەتانی تردا سەپاندبوو، بەو واتایەی کەهەموو ئەو شارستانیانەی کەعەرەب بەدیانهێنابوو، "بەدیهێنانێکی لاوەکی‌و تەسکی خەوێکی مەزن‌و تەواو بوو"[٣٠]. ئایا بەم واتایەشە کە ڕابەرانی بەعس دەڵێن: "گەورەیی نەتەوەیەك بەژمارەی ئەندامەکانی ناپێورێ، بەڵکو بەژمارەی پیاوە زیرەك‌و سەرکردەکانی"؟[٣١]. میشێل عەفلەق دەڵێ، بە نەمانی یەکێتی عەرەب،

"مرۆڤی عەرەب گەڕایەوە تەنیاییو نائومێدی "(عاد الفرد الى الوحشة واليأس)[٣٢].
بۆ چی؟ "چونکە ئەو پەیوەندیە ژیاوەی کەمرۆڤ بەکۆیەکی ژیاو دەبەستێ لەسەردەمی لاوازیو ئیژێمۆنی ئێلیمێنتە بێگانەکانو پارچە پارچە بوونی کیانی عەرەبیدا وون بوو"(لان العلاقة الحية التي لايمكن للفرد أن يعيش بدونها وهي الارتباط بمجموع حي، قد فقدت في عصر الضعف وطغيان العناصر الاجنبية وتفكك الكيان العربي)[٣٣].

دەزانرێ کەتایبەتمەندی ئایدیۆلۆژیایەك تەنها بەداڕشتنی ووشە دەرناکەوێ، بەڵکو لۆژیکی گشتیش (کە سیستێمێتك بنیاد دەنێو دواییش دەبێ بەرژێمێکی سیاسی ) زۆر گرنگە. داڕشتنی ووشە خۆی لەخۆیدا گرنگیەکی ئەوتۆی نییە ئەگەر پشت بەلۆژیکێك نەبەستێ کەنیازی بەدیهێنانی ئامانجێكو خستنە ڕووی پرۆگرامێکی سیاسی نەبێت. وەك تائێستا بینیمان، لۆژیکی بەعس دەیەوێ جەخت بخاتە سەر گرنگیو بەهای پۆزیتیڤی ئیژێمۆنی ماکی عەرەبیو گەڕانەوە بۆ ئیژێمۆنی ماکی عەرەبی دژی ئیژێمۆنی ماکی بێگانە. لەراستیدا، واتای سێمانتیكو سیاسی ووشەی "بەعس"، لەسەر ئاستی ئۆنتۆلۆژی، ژیانەوەی ئەم قەوارەیەو گەڕانەوە بۆ ئەم ئیژێمۆنیە دەگەیێنێ. ئەم لۆژیکە لەناو سەرجەم دیاردە ناسیۆنالیستە گشتگرەکاندا هاوبەشە. بەلام بابزانین چ هاوتەریبییەکی دیکەش هەیە لەگەڵ ناسیۆنال سۆسیالیزمدا. لۆژیکی گشتی ناسیۆنال سۆسیالیزمیش ئەوە دووپات دەکاتەوە کەگەلانی ئاری بەژمارەیەکی کەمەوە توانیان گەلانی بێگانە ملکەچ پێبکەنو لەژێر کاریگەریی دۆخی تایبەتی باری ژیان کەڵك لەدانیشتوانی ئەو ناوچانە وەربگرن کەداگیریان دەکرد بۆ ئەوەی خەڵکی " ڕەگەزی نزم" کاریان بۆ بکەن. لەوکاتانەدا ، ئەڵمانیەکان گەشەیان بەو توانا ڕۆشنبیریەدا کە بۆ ماوەیەك شاراوە بوو و پاش چەند هەزار ساڵێك یان بگرە چەند سەدەیەك پێیان خستە ناو شارستانیەت. بەڵام کاتێك ئەم داگیرکەرانە وورده وورده وەفایان بۆ ئەو پرینسیپانە نەما کە لەرێگەی پوختیی خوێنەوە باوەڕیان پێ هەبوو، دەستیان کرد بەتێکەڵبوون لەگەڵ دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکانو کۆتاییان بەبوونی خۆیان هێنا. بەم شێوەیە، پاش نزیکەی هەزار ساڵێك،

خوێنی ئەو داگیرکەرەی کەجاران خاوەن بوو، تێکەڵ بەوەی ڕەگەزی ژێردەستە بوو و شارستانیەتی وون کرد. کاتێك خوێنی راستەقینەی داگیرکەری ڕۆحی وون بوو لەناو ئەوەی گەلانی ژێردەستە، ئەو مادە سوتێنەرەی کەمەشخەڵی لێ دروستکرابوو و کەرێپێوانی بەرەو شارستانیەتی مرۆڤایەتی ڕوناك دەکردەوە ئەویش وون بوو [٣٤].

تێڕوانینێکی خۆیی بۆ چوارچێوەی بابەتیی مێژوویی، تێڕوانینێکی ئایدیۆلۆژی بۆ مێژووی "ڕووداوەیی"، تێڕوانینێکی داهاتو بۆ مێژووی ڕابوردوو، تەماشایەکی" نۆرمەتیف" بۆ مێژوویەکی" پۆزەتیف"، گۆڕینی تەماشایەکی مێژوو کەوابوو بۆ تەماشایەکی مێژوو کەدەبوایەو دەبێ لەداهاتودا وابێت. ئەمەیە لەڕاستیدا لۆژیکی گشتی هەردوو ئایدیۆلۆژیا. چونکە لەڕوداوی بابەتیی مێژوو دەیانەوێ هەڵوێستی نۆرمەتیڤی خۆیان بسەپێنێن و مێژوو بکەن بەداردەستێکی ئایدیۆلۆژی لەخزمەتی ئامانجە ناسیۆنالیستەکەیان. هەر بۆ ئەم مەبەستەشە کەبەعس دەڵێ نەتەوەی عەرەب دەبێ خەبات بکات بۆ ئەوەی " خودی ڕاستەقینەی خۆی بگەڕێنێتەوە" (حتی یسترد ذاتها الحقیقیة) و لەڕێگەی "هەوڵ و ئەشکەنجە دەگاتە ڕەسەنێتی خۆی"(حتی یصل بالجهد والمشقة الی اصالتة)[٣٥].

ئەم ڕوانگەیە دەیەوێ لەڕێگەی گەڕانەوە بۆ "ڕەسەنیی ڕۆحی عەرەبی"، دەوڵەتێك دروست بکات کە لەسەر "شێوەی نەتەوە بنیادبنرێ و پێوستە دروست بکرێ و بژیێنرێتەوە"[٣٦] (علی صورة الامة المبتغی خلقها او بعثها). دەوڵەتێك نوێنەرایەتی ئەو نەتەوەیە نەکات کە پێویستە "بنیادبنرێ"(خلقها) و پەروەردە بکرێت لەسەر وێنەی قەوارەی "ڕۆحی ڕەسەن" ، ناتوانێ ئەو "ئامانجە مەزنە"(الغایة الکبری) مسۆگەر بکات کەبەعس خەباتی بۆ دەکات. ئیتر، ئەم دەوڵەتە دەبێ "نەتەوەیەکی ژیاو و گونجاو وهوشیار" (امة حیة منسجمة واعیة) بگرێتە باوەشی خۆی[٣٧]. کاتێك کەپێشنیازی بنیادنانی دەوڵەتێك دەکات کەناوکەکەی "نەتەوەیەکی ژیاو و گونجاو وهوشیار" بێت، بەعس ڕاستەوخۆ ئەوە پەسەند دەکات کە تەنها بنچینەی بەکۆمەڵایەتی بوونی مرۆڤی عەرەب و "خۆبەدیهێنانی" لەو کیانەدا خۆی دەدۆزێتەوە

کەپێی دەوترێ نەتــەوە. هــەروەها فـۆرمو نـاوەڕۆکی ئەوسیستــێمە دەوڵەتیــە بریتیــە لەنەتەوەو ئەو هەستە نەتەوەییەی کەسیمبۆلیزەی symbolize دەکـات. بـەم شـێوەیە ناسیۆنالیزم لەدەوڵەتی بەعسیدا دەبێ بەتەنها گوزارشــتێك بـۆ ژیـانی کۆمـەلأیـەتی. بەتواندنەوەی دەوڵەت لەناو نەتەوەداو فرێدانی لــەناو باوەشـی نەتــەوە، تەنـها مــاکی بەکۆمەلأیەتیبوون دەبــێ بەناســیۆنالیزم. مــادەی سـێهەمی پرینســیپە گشــتیەکانی دەستوری پارتی بەعس ئاماژە بەوە دەکات کەباوەڕی هەیـە بەناسـیۆنالیزم(ئـەو جـۆرە نەسیۆنالیزمەی بەعس) وەك راستیەکی نـەمر: "(..) ناســیۆنالیزم راســتیەکی ژیـاوو نەمرەو هەستی ناسیۆنالیستی هۆشیار کــەمرۆڤ بەشـێوەیەکی تونـد بەگەلەکەیــەوە دەبەستێتەوە هەستێکی پیرۆزەو پڕە لەهێزی خوڵقێنـــەرو پاڵپێوەنـەری خۆبـەختکردنو هەست بە بەرپرسیارێتیو کاریگــەریی هەیـە بـۆ ئاراسـتە کردنـی مرۆڤایـەتی تـاك بەشێوەیەکی پراکتیكو بەکەڵك"[٣٨].

زۆر بەدڵنیایی، کەدەوترێ "ناسیۆنالیزم راستیەکی ژیاوو نەمرە"، دان بەوەدا دەنـــرێ کەناســیۆنالیزم( ئـەو جـۆرە نەســیۆنالیزمەی بـەعس ) لەجولأنەوەیـەکی بــەردەوامو هەمیشەییدایە. ئاکاری ئەم تێڕوانینە باوەڕکردنە بەوەی کەمێژوو (بەلایــەنی کەمــەوە مێژووی عەرەب بەلای بەعسەوە) پێکــهاتوە لەپرۆســەیەکی نــەپچڕاو لەبــەرزڕاگرتنی بیرۆکەی نەتەوە، چونکــە ئەمــە واتــای ئــەوە دەگــەیێنێ کەناسـیۆنالیزم دیاردەیەکـە کەهەبوەو هەیەو لەداهاتوشدا هەر دەبێ. بە "ئەبەدی کردنــی" ناسـیۆنالیزم، بــەعس راستەوخۆ دان بەوەدا دەنێ کەناسیۆنالیزم بریتیە لەهێزی "داهاتوی گەردونی" مێـژوو و گوزارشتی سیستێماتیكو نەمری هەموو کۆمـەڵێکــە. کۆمـەڵێك ناتوانــێ دروسـت ببێو لەسەر شێوەی دەوڵەت بەراســتی دەق بگــرێ ئەگــەر لەلایـەن ناسـیۆنالیزمەوە نوێنەرایەتی نەکرێ، چونکە ناسیۆنالیزم لەلایەن هیچ پرینسیپێکی دەرەکییەوە سنوری بۆ دانەنراوە و وێنەو ڕەنگ دانەوەی کیــانێکی نــەگۆڕاوە کــەپێی دەگوتــرێ نەتەوەیــە. چونکە ناسیۆنالیزم بەستراوەتەوە بەئەزمونێکی "بــوون"ەوە (بــوون بــەواتا فەلســەفیو ئۆنتۆلۆژیەکەی) کەتەجمید کردنیو گەورە کردنەوەی، پەیوەندی بــەبوونێکی رابــوردوو

ئێستاو داهاتووەوە هەیە: لەراسیتدا، ئەم تێڕوانینەیە کەخۆی لەخۆیدا، سنوری داناوە بۆ بەردی بناغەی ئایدیۆلۆژیای بەعسی‌و ئامانج‌و سروشتی دەوڵەتی بەعسی دیاری کردوە. دەوڵەتی بەعسی کەدەبێ هەلومەرجی ئەو نەتەوەیە جێبەجێبکات کەبەردی بناغەکەی ناسیۆنالیزمە، ناتوانێ بەرەو پێشەوە بڕوات ئەگەر پێکهاتەکانی نەتەوەیەکی "ژیاوو هەلکردو هۆشیار نەبێت". بەڵام بەعس ئەوەی لەبیر دەچێتەوە کەئەگەر دەوڵەت نوێنەرایەتی کۆی مرۆیی یان "نەتەوەیەکی کۆمەڵیی" نەکات (چونکە دەوڵەتێك تەنها لەنەتەوەیەك‌و پارتێك پێك نەهاتوە، دەوڵەت دەتوانێ چەند میللەتێك بگرێتە باوەش‌و چەند حزبێکی سیاسی تێیدا کار دەکەن)، دەبێ بەداردەستیك، بە "ئامرازێك" کەخزمەتی جێبەجێ کردنی خواست‌و ویستی پارتێك دەکات. هەر لەبەر ئەوەشە کەبەعس دەوڵەت دادەنێ بەئامرازێك: " دەوڵەت ئامرازێکە نەکەم نەزۆر، دەوڵەت دەزگایێکە، دەوڵەت لەشێکە بە بێ رۆح(. . .)"[٣٩].

تێڕوانینی ناسیۆنال سۆسیالیزمیش هەمان چوارچێوە دەخاتە ڕوو. یەکەم ئەرکی ناسیۆنال سۆسیالیزم کەهیتلەر دیاری دەکات "بوونی ئەو تێڕوانینەیە سەبارەت بەسروشت‌و هۆکاری بوونی دەوڵەت". ئەم تێڕوانینە لەچی پێکهاتوە ؟ لەوە پێکهاتوە کەئەرکی دەوڵەت بەشێوەیەکی توند دەبەستێتەوە بە "ئەرکەکانی ڕەگەز"[٤٠]. لەمەوە دەتوانین تێبینی بکەین کەدەوڵەت، داردەستە نەك ئۆرگانیزمێکی دادوەری خۆی بۆ خۆی یاخود بەگویرەی تەعبیری ئەلفرێد رۆزێنبێرگ دەوڵەت Alfred Rosenberg "شتێکە بۆ خۆی"[٤١]. هیتلەر دەڵێ کە "چەمکی بنەڕەتی پێکهاتوە لەوەی کەدەوڵەت ئامانجێك نییە بەڵکو ئامرازێکە"[٤٢]. وەکو ڕێگەیەك یان "ئامرازێك"، دەوڵەت دەبێ بەشێوەیەکی لۆژیکی ئەرکی سەرەکی ئەوە بێت کە ئەم رەگەزە بهێڵێتەوەو چاکی بکات. ئەمە مەرجێکی بنچینەییە بۆ پێشکەوتنی مرۆڤایەتی"[٤٣]. بەلای ناسیۆنال سۆسیالیزمەوە، ئەگەر دەوڵەت، "نەتوانێ نوێنەرایەتی سەروەری غەریزەی هێشتنەوەی میللەتێك بکات" وەك "میکانیزمێکی ئۆتۆماتیکی پوخت" دەمێنێتەوە[٤٤].

ئایا ئەم لەیەکچونی تیڕوانینە، لەمەشدا، ئەمەش سەر سوڕهێنەر نییە؟ ئەگــەر بــۆ میشـێل عەفلــەق دەوڵــەت "لەشـێکی بــێ ڕۆحــە" و ئامانجەکـــەی خزمـــەتکردنی ئیمپیـێرەتیڤی "پــەیامی نـــەمرە"، بـــەلای هیتلـــەرەوە هـــەمان شـــت، دەوڵـــەت "مێکانیزمێکی بێ ڕۆحە. . . و ئامانجە تەواوەکەی خزمەتکردنی بـــیری مەزنــە"(٤٥).

وەك دەبینین، بەلای بەعسو ناسـیۆنال سۆسـیالیزمەوە، بـەلای عەفلـەقو هیتلـەرەوە، دەوڵەت، یەکەم دەبێ ببێ بە "محتوای"(محتوی) نەتەوە یان ڕەگەز، دووەم دەبێ ببێ بە ئامرازێك کە لەخزمەتی چاککردنی نەتەوە یان ڕەگەزدا بێت. بەلای بەعسو ناسـیۆنال سۆسیالزمەوە، دەوڵەت ئۆرگانیزمێکە کەکەڵکی بریتیە لەرێکخستنی نەتـەوە یـاخود ڕەگەز. بـەعسو ناسـیۆنال سۆسـیالیزم هـەمان تـێڕوانینی ئۆرگانیکییـان سـەبارەت بەدەوڵەت هەیە: یەکگرتنی دەوڵەتو نەتەوە، واتا تواندنەوەی دەوڵەت لەناو نەتـەوەدا. چەمکی دەوڵەت وەك ئۆرگانیزمێکی دادوەری ســەربەخۆ لــە "کۆمــەڵگای مــەدەنی" بەرەو ئاراستەیەك دەبات کەداهاتوی بریتیــە لەقەوارەیــەکی میسـتیك. بـەم شـێوەیە، دەوڵەت بە "نەتەوەی سیاسیەوە" دەلکێنرێ. بەم شێوەیەش، دەوڵەت دەبێ بە "فۆرمــی ژیانی" نەتەوەیەك یان ڕەگــەزێك کــە دەمارەکــەی یــان مادەکــەی ناسـیۆنالیزمە. بـۆ بەعسو بۆ ناسیۆنال سۆسیالیزمیش، دەوڵەت "شێوەیەکە لــەبوونی" نەتەوەیــەك یــان ڕەگەزێکی ژیاو. "دەوڵەت - نەتەوە" یاخود "دەوڵەت - ڕەگەز" کیانێکە کە لەرێگەی ناسیۆنالیزمەوە دەبێ بەراستیەك: نەسیۆنالیزمی بایۆلۆژی، بێ گومان.

## بەعس و تیۆری دەستەبژێر

ناتوانین لەجەوهــەری "دەوڵــەت - نەتــەوەی" بــەعس تێبگــەین ئەگــەر کاراکتــەرە ئێلیتیستەکەی elitistکە پرینسیپی دیموکراســی نــەهی دەکــات، فــەرامۆش بکــەین. دەوڵەتی بەعسی، بەرهەمی "شۆڕشی گشتگر" ، ناتوانــێ فۆرمێکــی ژیــاو وەربگــرێ ئەگەر ئەو نەتەوەیەی کەباوەشـــی پیــاکردوە نــەبێ بــەمادەی ویســتی کەمایەتییــەكو ئەمیش، وەکو لەبەشی داهاتودا بۆ نەمان دەبــێ باســی لێبکــەین، نــەبێ بەخواســتو

ویستی سەرۆكێك كە "پاشماوەی رۆجی ئەسڵی" دەهێنێتە كایەوە. برپرەی پشتی سەرجەم سیستەمی دەوڵەتی بەعسی دەوەستێتەوە سەر ئەم تێڕوانینە كە تا ئێستا بەداخەوە خراوەتە لاوە چ لەلایەن زۆربەی زۆری رۆشنبیرانی رۆژهەلات، پێش هەموویان، كوردو عەرەب، چ لەلایەن ئەوانەی رۆژئاواو چ لەلایەن پسپۆڕانی بیری سۆسیۆلۆژی‌و سیاسی عەرەب. خستنە لاوەی ئەم تێڕوانینە، كۆسپ دەخاتە بەردەم تێگەیشتنی لایەنێكی تری ئایدیۆلۆژیای بەعسی.

ئەوەی كەبەعس ئاواتێتی‌و خەباتی بۆ دەكات، بنیادنانی دەوڵەتێكە كەسەركردەكانی پێكهاتبێت لەو تاكانەی كە بەهەموو لەخۆبردنێكەوە ئەركی رزگاركردنی نەتەوەی عەرەب لەگەندەڵی‌و تێكشكاندن جێبەجێ دەكەن: ئەوتاكانەی كە بەرگرییان (المناعە) دژی دوو شت وەرگرتوە: دژی ئەو "نەخۆشیانەی" كەزۆربەی زۆری نەتەوەی عەرەب تووشی بوەو دژی ئەو دوژمنەی كە بەرپرسیارە لەبلاوكردنەوەی ئەو نەخۆشیانە: ئەو كەسانەی كەچالاك‌و خەباتگێڕو ڤیتالیست vitalist. ئەم تاكانە كەبریتین لەهەڵبژاردەیەك، نمونەی تۆوی "هێزی شاراوە"، یان "گورج‌و گۆڵی شاراوەی" نەتەوەیان تێدا هەیە، كەكراون بە سەركردایەتی‌و لەسروشتیاندا دوورن لەو خۆپەرستیەی كەنەتەوەی عەرەب تیادا نوقم بووەو توانای قوربانی دانیان لەپێناوی خزمەتی پەیامی نەمر هەیە. بەڵام ئەگەر سەركردایەتی "دەوڵەت- نەتەوە" بدرێتە دەستی ئەم ئێلیتە( دەستەبژێرە)، تەنها لەبەر ئەوە نییە كەئەم كەمایەتیە پێكهاتوە لەناوكی نەتەوە لە "دۆخە پوختەكەیدا" و باوەڕی هەیە بەپەیامی نەمر، بەڵكو لەبەر ئەوەشە كە زۆربەی زۆری نەتەوەكە، هەر لەسروشتیدا، توانای تێگەیشتنی بەرژەوەندیەكانی نەتەوەی نییە. " كۆی كۆمەڵ یاسای خۆی هەیە، هەر كۆمەڵێكیش سروشت‌و غەریزەی خۆی پاڵنەرێتی لەبەرزڕاگرتنی دیاردەو ڕواڵەت‌و ناونیشان‌و سیفاتە گشتیەكاندا، چونكە كۆ سیفەتی زیرەكی‌و هەستەوەری‌و توانای رۆچونی تاكی نییە " (المجموع لە قانون، وكل جمع مدفوع بطبیعتە، بغزیرتە الی تمجید الضواهر

والشكليات والعناوين والالفات والصفات العامـة، لان الجمع ليس لـه اوصـاف الفـرد وحساسيته وقدرته على التعمق)[٤٦].

بزووتنەوەی بەعسی لەپێناوی ئەوەی کەرێگەی ڕاست وەربگرێ، دەبێ "ڕۆڵی تاکەکان بەرزبنرخێنێ" ( علينا ان نقدر دور الافراد")[٤٧] ، چونکـه هـەر تاکـەکانن کـەنابن بەکۆیلە لەناو دۆخێکـی کۆییـدا (کۆمـەڵیدا) کـەپارێزگاری ئـازی خۆیـان دەکـەن، کەسەربەخۆیی بیریان هەیە، کەبانگەشەی واتا دەکەن لەگفتـەکاندا،کـە لەگوزارشـتە گشتیەکاندا بەدوای شتی ژیـاودا دەگـەڕێن، کـەزۆر جـار بێدەنگـن و قسـەو کاریـان لەئەنجامی بێدەنگیـەکی بەرهەمهێنـەرەوە دێـت، کـەچاودێری بزووتنەوەکـە دەکـەن و چاکی دەکەنەوە کاتێك کە توشـی ڕووکەشـی دەبێـت و شـپرزەیی دەخولقێنـن کـاتێك کەشپرزەیی ناوەکی لاوازدەبێت[٤٨]. زۆرینە کەخەسڵەتی هەڵپەیی هەیە، دەبێ لەلایـەن ئەو کەسانە پێشڕەوی بکرێ کەدەزانن چۆن جۆش و سۆزیان دەجولێننەوە.

بێ گومـان، ئـەم تێروانیـە، کۆنـە لـەمێژووی ئـەو فەلسـەفە سیاسـیەی کـەڕۆڵی کەمایەتی هان دەدات لەمومارەسە کردنی دەسەڵات. بۆ نمونە گوستاڤ لبۆن Gustave Le Bon (١٨٤١ـ ١٩٣١) یەکێکە لەو نوسەرانەی کەمیراتیەکی گەورەی بیرو بـاوەڕی ئێلیتیسـتی بـۆ ئایدیۆلۆژیـە توندوتیژەکـان بەجێهێشـتوە. لەلێکۆڵینـەوەی بـۆ سایکێۆلۆژیای زۆرینە (جەماوەر، مێگەل)، لبۆن تێبینی دەکـرد مـرۆڤ ئـاژەڵێکی لۆژیك نییە، کاتێك کەتێکەڵی گروپ (جـەماوەر) دەبـێ، مـەیلی نـزم دەبێتـەوە بـۆ ئاستێکی ڕۆشنبیری و مۆراڵیی زۆر نزم. مـرۆڤ لەسـەر ئاسـتی ڕۆشـنبیری و مەنتـەقی دواکەوتوترە لەتاکێك بەتەنها. تـاکێك بەتەنـها دەتوانـێ بەشـێوەیەکی بـەردەوام بـیر بکاتەوەو بەشێوەیەکی مەنتـەقی ڕەفتـار بکـات چونکـە توانـای ئـەوەی هەیـە خـۆی بەرامبەر ویستە ناشعوریەکانی ڕابگرێ، بەڵام زۆرینـە ( کـۆی کۆمـەڵ) خـاوەن ئـەو توانایە نییـە[٤٩]. عەقڵیـەتی زۆرینـە، سـۆزی غـەریزەو بەهەڵپـەیی خـۆی بەسـەریا سەپاندوەو بێ ئارامی و جولانـەوەو بزێـوی و شـتی نامـەنتقی بەشـێکن لەپێکهاتـەی سایکۆلۆژی[٥٠]. ئەنجامی ئـەم دۆخانـە، چوارچێـوە بـۆ کەراکتـەری ناسـەقامگیریی

عاتفیو بیٚ سەبریو بیٚ تەحەمولیو بیٚ هەستی بەرامبەر بەقەوارەی بەرپرسیێتی دادەنیٚ. سەبارەت بەگۆشەی ترادیسیۆنی دەوڵەتیەوە، لبۆن بە بەردەوامیو بەشیوەیەکی سیستیٚماتیك هانی کۆنترۆڵیٚکی توندو تیژو دەسەلاٚتخوازی جەماوەر دەدات لەلایەن کەمایەتیەکەوە یان لەلایەن ئەرسیتوکراسیەتیٚکی مەنتەقی. هەر بۆ ئەوەی شارستانیەت بتوانیٚ پیٚش بکەویٚتو گەشەبسیٚنیٚ، جەماوەر دەبیٚ کۆنترۆل بکریٚو لەلایەن ئەم "کەمایەتیە لۆژیکییەوە" پیٚشرەویی بکریٚ [٥١].

ئەگەر باش لەتیٚروانینی ئایدیۆلۆژیای بەعسی بکۆڵینەوە، بۆمان روون دەبیٚتەوە کەپیٚکهاتەیەکی تری لەهەمان کاتدا پەریٚتۆ Pareto و فیختە Fichte دیٚتە پیٚش چاو: عەفلەق هیٚلّ بەژیٚر ئەوەدا دیٚنیٚ کە ئەم نەتەوەیە (واتا نەتەوەی عەرەب) دەزانیٚ کە لەژیانی حازریدا هیچ شتیٚك نییە کەشایستەی هیٚشتنەوە بیٚت [٥٢]. بەلاٚم سەرەرای ئەم دۆخە نیٚگەتیڤە، "پاشماوەیەکی رۆحی رەسەن ماوە"(بقایا الروح الاصلیة) [٥٣] کەهیٚشتا پیس نەبوە، کەهیٚشتا هیٚزیٚك ماوە لەدۆخیٚکی شارەوەدایەو لەبەرئەوە پیٚویستە نەتەوەی (عەرەب) ئەو جەوهەرە لەخۆیدا بدۆزیٚتەوە [٥٤]. رزگار کردنی "پاشماوەی رۆحی رەسەن" واتای ئەوەیە کەدەبیٚ کاربکریٚ بۆ "ژیاننەوەی هیٚزی شاراوەوو ریٚگە پاکبکریٚتەوە بۆ ئەوەی هیٚزی کاریگەری هەبیٚو بتوانیٚ لەناو سەرجەم نەتەوەدا بلاٚوبیٚتەوە.

رزگار کردنی "پاشماوەی رۆحی رەسەن" واتای ئەوەیە ئیتر، کەدەبیٚ ئەو حەیەویەتەی ( چالاکییەی) کە شاراوەتەوە "بخریٚتە روو و دەرپەریٚنریٚ لەو ژینگە خاوو خلیچکە بیٚ جوڵەیەدا و "بشۆرشیٚنریٚ" و بگۆردریٚ بۆ "بزووتنەوەیەکی پالٚپیٚوەنەری یەکەم"(الحرکة الدافعة الاولی) و بۆ "تەیاریٚکی سایکۆلۆژی بەهیٚز"(التیار النفسی القوی) [٥٥] و لەئەنجامدا ببیٚتە هۆی ژیاننەوەیەکی گشتگیر. بیر نەکردنەوە لەم ژیاننەوە گشتگیرە، دەبیٚتە هۆی روخاندنی نەتەوەکە. دەوڵەتی بەعسی دەبیٚ لەنەوەیەك لەدایك بیٚت کە هەلو مەرجی یەکەمی جولاٚنەوەی چالاککردنەوەی ئەم "ژینداریو چالاکیە شاراوەیە"ی تیٚدا بیٚت. ئەگەر بەشیٚکی نەتەوەکە توشی پۆخلیٚی نەبوەو بەپاکی

ماوەتەوە، ئەم بەشە دەبێ بپارێزرێت. خۆی لەخۆیدا، ئەم بەشەیە کەخاوەنی ژینداریو چالاکیەکی شاراوەیەو هەر ئەویشە کەخەبات دەکات بۆ بەدی هێنانی پەیامی نەمر.

شایستەی وەبیرخستنەوەیە، ئەم لۆژیکەش زۆر نزیکە لەلۆژیکی ناسیۆنال سۆسیالیزمەوە. بەم بۆنەیەوە، هیتلەر ئاماژە بەوە دەکات کەزۆر لەمێژەوە ئەڵمانیەکان "غەریزەی گرێگری بە هێزیان وون کردوە کەزۆر پێویستە بۆ ئەو کاتانەی کەنەتەوە لەخەتەردا دەبێتو ئێلێمێنتێکی بێ هاوتایە کەناهێڵێ نەتەوە برووخێت"[٥٦].

"غەریزەی گرێگر" بەلای هیتلەرەوە تەنها فاکتەرە کە" بەرەیەکی یەکگرتووی گەلێکی گونجاو" دروست دەکات دژی دوژمن. ئیتر، دەبێ گەلی ئەڵمان بگەرێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە ئەم" غەریزەیە" بەردی بناغەی یەکێتی پێك دەهێنا. ئەو"هاوکاری گرێگر"ەی کەجاران ئەڵمان خاوەنی بوون، ئەمرۆ خەریکە لەناو دەچێ. لەناو چوونی ئەم "یەکێتی گرێگرە"یە کەبوە بەهۆی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەی کەدوچاری نەتەوەکە بۆتەوە، چونکە "یەکگرتنی گیانیی"ی جاران پارچە پارچە بوو. میللەتی ئەڵمان ئێستاش دوچاری کەمو کوڕیی ئەم "یەکگرتنە گیانیەیە". بەلاّم ئەگەر "نەبوونی تواندنەوەی ڕەها لەنێوان ئەو ئێلێمێنتانەی کە لەزۆر کۆنەوە نەتەوەی ئەڵمانیان پێکدەهێنا" شتێکی ڕاستە، هەروەها شتێکی دیکەش هەیە کەزۆر "دڵخۆشکەرە": "بەلایەنی کەمەوە بەشێك لەخوێنمان بەپوختی ماوەتەوەو توشی ئەو تێکشکاندنە نەبووە کەڕەگەزەکەمان بەرەنگاری بۆتەوە"[٥٧]. لەبەر ئەوە، ئەرکی ناسیۆنال سۆسیالیزم ژیانەوەی ئەو بەشەیە کە لەپیسبونو تێکشکاندن خۆی پاراستوە. خۆشبەختانە، نەتەوەی ئەڵمان خاوەنی "ئەو توانا شاراوانەیە کە لەناو بەشێکی میللەتەکەدا بێ دەستوەردان ماوەتەوە". دەبێ "بزانرێ کەئەم توانایانە هێشتا ماونو خەبەر کردنەوەیان بەسە (کافیە) لەلایەن باروهەلی دەرەکی بۆ ئەوەی بێنەوە سەر ڕوو"[٥٨].

چەند پرسیارێك: ئایا گەڕانەوە بۆ "ڕۆحی ڕەسەن" (بەلای بەعسی عەفلەقیەوە) یان "غەریزەی گرێگر" (بەلای ناسیۆنال سۆسیالیزمی هیتلەریەوە) دەبێ چۆن بێت؟ کێ

نوێنەرایەتی "ڕۆحی ئەسڵی" یان "غەریزەی گرێگر" دەکات؟ کێ ئەو"چالاکییە شاراوەیە"( ئەوگورج و گۆڵیە شاراوەیە) دەژێنێتەوە؟

لەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، بەعسی عەفلەقی هێشتا ڕاستەوخۆتره لەناسیۆنال سۆسیالیزمی هیتلەری. ئەو" گەندەڵی و تێکچون و لادانە" کەتووشی نەتەوەکە بوون، هەستی پێویستی بۆ گۆڕان و بەرگری لەگەندەڵی دەخولقێنن. بەڵام "ئەم هەستە بەشێوەیەکی ڕوون و هوشیار لەناو کەمایەتیەکی ڕۆڵەی ئەم میللەتە گەشە دەکات"[٥٩]. تەنها ئەم کەمایەتیە دەتوانێ بەرپرسیێتی قلْپ کردن و گۆڕینی باروودۆخ وەربگرێ و ڕونی بکاتەوە بۆ میللەت لەپێناوی هوشیار کردنەوەی و پەروەردەی بکات و واقعی خۆی بۆ باس بکات و ڕێگەی راستی پێ پیشان بدات بۆخەباتێکی ڕێکخراو[٦٠].

زۆرینە کەئەم هەستەی نییەو ئەو"ڕۆحە کۆکەرەوەی تاکی" نییە، دەبێ باری کردەوەی ئەم کەمایەتیە هەڵبگرێت و ملکەچی بێت. بەڵام ئایا، لەڕوانگەی بەعسەوە، تەنها ویستی کەمایەتیە کەبڕیار ئەدات و کردەوەی شۆڕشگێریی بەڕێوە دەبات؟ بەڵێ، چونکە هێشتا میللەت خاوەنی هوشیاریەکی تەواو نییەو هێشتا ناتوانێ نوێنەرایەتی ویستی زۆربەی گەل بکات و دەنگی بگەیێنێ.

لەهەموو وولاتێک و لای هەموو میللەتێک کاری شۆڕشگێری پەیوەستە بەکەمایەتیەوە"[٦١]. بەڵام "جۆرێکی تایبەتی لەکەمایەتی"، کەمایەتیەک کەهوشیارە بەرامبەر واقعی میللەتەکەی"( اقلية من نوع خاص ،اقلية واعية لواقع امتها). ئەم کەمایەتیە بۆ نوێنەرایەتی میللەت دێتە پێشەوە پێش ئەوەی میللەت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ مۆڵەتی ئەم نوێنەرایەتیەی بداتێ...[٦٢].

کورتەی (سینتەزەی) ئەم تێڕوانینەی ئایدیۆلۆژیای بەعسی بەشێوەیەکی پراکتیکی لەم قەوارەیەی خوارەوە پێکهاتوە: بەعس بۆ دەوڵەتێکی ئیدیال خەبات دەکات و هەوڵ دەدات کۆمەڵێک پێک بێنێت کە لەباری مۆراڵی و لەباری سیاسیەوە یەکگرتو بێت. یەکێتی ناوخۆ پێویستی بەوەیە کەزۆرینە لەگەڵ ئەوکەسانەی کەنوێنەرایەتی "پاشماوەی ڕۆحی ڕەسەن" دەکەن و"ئێلێمێنتی ڕۆح"(عنصر الروح)[٦٣] پێکدێنن

یەکبگرێ. واتا، نەتەوەی عەرەب کەپێویستی بەبزوتنەوەیەك هەیە بۆ نوێنەرایەتی کردنی "ئێلێمینتی ڕۆح"، پەنا دەباتە بەر ئەم "ئێلێمێنتی ڕۆحە" کە لەراستیدا بریتیە لە "حیزبی راستەقینە" ( الحزب الحقیقی)، "حیزبی ژیاو" (الحزب الحی) و ئەمیش بە ئەرکی خۆی دەزانی کەدەوڵەت ملکەچ پێبکات بۆ بەدیهێنانی "ئامانجی مەزن"(الغایة الکبری). زۆرینە چەند پێگەیشتو بێت، توانای گەیشتنە ئاستی کەمایەتی نییە، چونکە توانای ئەوەی نییە بەقوڵی شت ببینێو بیر بکاتەوە(٦٤). لەبەرئەوە مەحاڵە ئامانجی پیرۆزی نەتەوە تێ بگات. ئەم بێ توانایییە "سروشتیە"ی زۆرینە، ڕەنگدانەوەی خۆپەرستیو تەمەڵی وسستیو گەندەڵیو پۆخڵی (تلوس) ڕۆحیە. لەبەر ئەوە دەبێتە هۆی ئاستەنگێك لە ڕێی بنیادنانی ئەو "ئامانجە مەزنەی" کەبەعس پێشنیازی دەکات ئەگەر لەلایەن کەمایەتیەك کەهەڵگری ڕۆحی باوو باپیرە کۆنترۆل نەکرێت.

ئێستا تێدەگەین کەپەرچ دانەوەی (ڕەفز کردنی) "گەشەپێدانی خاو" کە بەگوێرەی دیدەی بەعسی بریتیە لە "چاکسازی ڕووکەشی"، واتای ئینکار کردنێکی ڕەهای پراکتیکی دیموکراسی دەگەیێنێ. ئەگەر" پەیامی نەمر" واتای کۆکردنەوەی هەموو عەرەبە لەتەنها یەك دەوڵەتو ئەنجامی کرداری دەستەبژێرێکە، بەلای بەعسەوە زۆر سروشتیە کە ویستی کۆی گشتی لەلایەن ئەم دەستەبژێرە نوێنەرایەتی بکرێ. تێبینی دەکەین کەبەعس هەر لەیەکەم قۆناغدا بیری دیموکراسی ڕەتدەکاتەوە: ئەو دیموکراسیەتەی کەدەوەستێتەوە سەر هەڵبژاردنی گەردوونیو فرەلایەنی سیاسیو یاساکانی بەلانسی دەسەلات. بەلای بەعسەوە، پەسەندکردنی پرینسیپی دیموکراسی، رازی بوونە بە "چاکسازیی ڕووکەشی" و لەئەنجامی ئەمەشەوە پێشێل کردنی ئەو "ئامانجە مەزنە"یە کەئەرکی یەکەمی بنیادنانی کۆمەڵێکی مۆراڵیو بەدیهێنانی پرۆژەیەکی گۆڕانی رادیکالیی سایکۆلۆژیای گشتیە. ئامانجو خەونی بەعس لەڕێگەی گۆڕانێکی تەواوی ژیانی میللەتی عەرەب لەسستیەوە بۆ پیشکەوتنو لەنزمیەوە بۆ سەرکەوتن دێتەدی. پرینسیپی ئایدلۆژیای بەعسی ئەم مەرجەی خوارەوە دادەنێ:

"شۆڕش ناتوانێ پەیامی خۆی بگەیەنێ بەبێ دروست کردنو خولقاندنی کۆمەڵێکی نوێو بەبێ گۆڕینی سیستەمی بەهاکانیو بیر وباوەڕو هەڵسوکەوتی تاکەکان"[٦٥].

ئیتر، دەتوانرێ وێنا بکرێ کەویستو خواستی گۆڕینی ڕادیکاڵ لەو سیستێمانە تێبینی دەکرێ کەمەبەستیان پەرتدانەوەی پرینسیپی دیموکراسییە بەهەموو ئاراستەکانیەوە. ئەگەر وانەبێ، چۆن، بەلای ناسیۆنالیزمی بەعسیەوە، میللەتێك دەتوانێ مومارەسەی مافی خۆی بکات، بەتایبەتی لەسەردەمێکدا کەئەم میللەتە نوقم بوە لەناو دواکەوتوییو ڕەشو سپیو باشو خراپ بەشێوەیەکی ڕوون لەیەك جیاناکاتەوە. لەڕوانگەی بەعسەوە، میللەتی عەرەب لەدۆخێکی ئاوادا هەرگیز بەرژوەندی خۆی نازانێ. بەجۆرێك یان شێوازێك لەیوفێمیزم euphemism بەعس جەخت دەخاتە سەر ئەوەی کە:"دیموکراسیەت زۆر پێویستە. . .، بەلام لەبەر نوقسانیو نارێكو پێکی لەپەروەردەداو تێکچونی خووڕەوشتو خراپ بوونی باری ئابوریو تەندروستی، میللەت بەشێوەیەکی شیاو توانای مومارەسە کردنی مافی خۆی نییە. ئێمە نیازمان نییە بێبەشی بکەین لەمافەکانی. بەپێچەوانەوە، دەبێ لەڕێگەی ئەوەوە خەبات بکەین.... بەلای ئێمەوە، (میللەت) هەم ئامانجو هەم ئامرازیشە. ئامانجی ئێمە خزمەتی میللەتە لەڕێگەی میللەتەوە"[٦٦]. وەك تێبینی دەکەین، باوەڕ نەکردن بەدیموکراسیەت لەئەنجامی تێڕوانینێك دێت کەمیللەت دەکات نەك وەك ئامانجێك خۆی لەخۆیدا، بەڵکو وەك ئامرازێك لەخزمەتی ویستێکی خۆیی. کاتێك کەئایدیۆلۆژیای بەعسی، میللەت دادەنێ بەئامرازو بەئامانج، مەبەستی ملکەچ کردنیەتی بۆ ویستی خۆی. میللەت وەك میللەت خۆی لەخۆیدا ئامانجێك نییە، بەلام ئامرازێکە لەخزمەتی ئەو "ئامانجە مەزنەی" کەعەفلەق باسی لێدەکات. هەر وەك ئێمانوێل کانت Emanuel Kant دەڵێ، کاتێك بوونی میللەتێك دەوەستێتەوە سەر ویستێکی خۆیی، ئەو میللەتە ملکەچە بۆ ئامانجێکی خۆیی[٦٧]. ئەمجا، کاتێك کەمیللەتێك دەبێ بەئامرازێكو ملکەچ دەبێ بۆ ویستێکی تایبەتی، ناتوانێ ویستی خۆی هەبێت. ئەو میللەتە هیچ ویستی نییە چونکە هەر وەکو بەعس دەڵێ، توانای مومارسەی مافی خۆی نییە

بەشێوەیەکی شیاو .بەم شێوەیە، پرینسیپی "زۆرینەی ژمارە"، هەموو کاریگەریـەکی خۆی وون دەکات. بەهۆی داوکەوتن و خراپ بوونی باری ئابووری و تەندروستی پەروەردە، هیچ پێویست ناکات، بەلای ناسیۆنالیزمی بەعسیەوە، تەماشایەکی پۆزەتیفی کێشەی دەنگی زۆرینە بکرێ و نرخێکی بۆ دابنرێ. ئەندامێکی بەعس کەحەننا بـەتاتو نـاوی نابات، لە ساڵی ١٩٦٣ واتا لەوکاتەی کەبـەعس لەسـەرحوکم بـوو، تێبینـی دەکـات کەکاتێك بزووتنەوە شۆرشگێرەکان دەسەلاّت دەگرنـە دەسـت، ڕوو هـەڵدەماڵن لەسـەر ئەوەی کەدەبێ بەسەر بیروڕای جارانیاندا بچنەوە. بەلاّم کاتێك کـە لـەقۆناغی خـەباتی میلليدان، بانگەشە بۆ دیموکراسیەت دەکەن بۆ ئـەوەی بتوانـن لەباشـترین بـارودۆخدا چالاکی خۆیان بکەن. ئەوکاتەی کەدەسەلاّتیان بەدەستەوەیە، دەبینین کەدیموکراسـیەتی بۆرژوازی خەتەرێکی گەورەیـە بـۆ شـۆڕش"[٦٨]. هـەرچۆنێك بێـت، پێـش یـان پـاش دەسەلاّت گرتنە دەست، گرنگ ئەوەیە کە بەعس لەجەوهـەری فەلسـەفەی سیاسـیدا و بەتیۆری و بەپراکتیك، پرینسیپی ئەو دیموکراسیەتە بەشێوەیەکی پۆزتیڤ وەرناگرێ کە پێـك هـاتوە لـەدەنگدانی زۆرینـە. پرینسـیپی زۆرینـەی ژمـارە، بـەلای بەعسـەوە، بەپێچەوانەی چەمکی بەرپرسێتی و قوربانی دان و پاڵەوانیـە، چونکـە ئەمانـە سـیماو خەسڵەتی تایبەتی دەستەبژێرن، هی ئەریستۆکراسیەکن کە هەڵگری "پاشماوەی ڕۆحـی ڕەسەنە"، هی "پیاوی ئازادن کە هەڵگری چەکن". زۆرینە ( جەماوەر، مێگەل)، تەنها کۆمەڵێکە لەو خەڵکانەی کە بێ لایەن و بێباکن و شـیاوی ئـەوەن کـە بـەنزم تەماشـا بکرێن. بەلای ئایدۆلۆژیای بەعسیەوە، دیموکراسیەت ناتوانێ ئاسـتی ئـەو"مێگەلـە" بەرزبکاتەوەو بیباتە سەرئاستی نوێنەرایەتی نەتـەوەیی و لـەو دۆخـەدا دەتوانـێ زیـان بەویستی خۆیی بگەیەنێ.

لەبارودۆخی دیکەدا، ناسیۆنال سۆسیالیزمیش گاڵتەی بەدیموکراسی دەکـرد چونکـە بەلای ئەویشەوە شتێکی ناماقوڵ بوو کەکەسێکی ئازاو ژیر لەدەنگدانی گشـتی بێتـە سـەر ڕوو. ئـەو ئـازارە قوڵـەی کـە ئـەڵمانیا بەدەسـتیەوە دەتلایـەوە، بەسـترابوەوە بەدیموکراسیەتی پەرلەمانیی تەنانـەت لـەفۆرم و سروشـتی دەزگاکـە خۆیـدا. یاسـای

"بڕیاری زۆرینه" و پرینسیپی فرەلایەنی سیاسی، بەلای هتلەرەوه، هەرلەبنەڕەتدا تۆڕی بەرپرسێتیو پالەوانی ( کەنەتەوەی ئەلمان پێویستی پێی هەیه) دەخنکێنێ. هیتلەر دەلێ، "شانس زیاتره کەحوشترێك بەکونی دەرزیەکدا بچێت وەك لەوەی لەڕێگەی هەلبژاردنەوه ڕوو لە پیاوێکی گەورە هەلبمالرێ. هەر لەوەتەی کە جیهان جیهانه، هەموو ئەوشتانەی کەکراون، لەڕێی کرداری تاکەکانەوه بەدیهاتون"[٦٩]. لەبەر چ هۆیەك؟ چونکه "بیری دیموکراسی جەماوەر، جگە لەکەراکتەرە ڕووکەشیەکەی" ناتونێ کۆتایی بەلاوازیی نەتەوەی ئەلمان بهێنێ[٧٠]. ناسیۆنال سۆسیالیزم بیری دیموکراسی پەرت دەداتەوه لەسەر بناغەی جیهان بینیەکی هاوسەنگ لەگەل ئەوەی بەعس. بەلای نازیەتەوه هەروەها، زۆرینه پێکهاتوه لەوەی کە بەلاتینی پێی دەوترێ ڤولگوس پێکوس vulgus pecus( جەماوەری ئاژەل) یان مولتیتودۆ دیسسۆلوتە multitudo dissoluta ( کۆمەلی هەلوەشاو) یان ئێکلێزیه کۆنفوزه ecclesai confusa(کۆمەلی تێکەل و پێکەل). هیتلەر دەیگوت "مەزنیی مرۆڤایەتی هەرگیز لەدەستی جەماوەردا نەبوه، بەلکو لەدەستی مێشکی دروستکەردا بوه"[٧١]. "میللەت، خۆی، دووره لەدەربڕینی ئاواتی خۆی بەشێوەیەکی تەواوو خاوەنی بیرو باوەڕی گشتیەو بێ دەسەلاته لەبەردەم هوشیاری بەرامبەر جەوهەری ئیدێیالو ناتوانێ تەمەنناى خۆی بەشێوەیەکی ڕوونو تەواوو دەر بڕێو رازی بکات"[٧٢].

ناتوانرێ چوارچێوەی ئەم مونازەرەیه تەواو بکرێ بەبێ ئەوەی هێل بەژێر ئەوەدا نەهێنرێ کە ڕۆمانتیزەکردنی قەوارەی دەستەبژێرەیی خەسلەتێکی هاوبەشی فاشیزمی مێژوییه. چونکه ئەم تێڕوانینه پێکهاتەیەکی سەرەکی فاشیزمی ئیتالیشه. موسۆلینی بەدەنگی بەرزەوه دەیگوت دیموکراسیەت "خەونێکی بێ کەلکه" یان "بیرێکه کە پەیوەندی بەواقعەوه نییه" چونکه "نایەکسانی چاكو بەپیتو بێچاره لەناو پیاواندا" ناتوانێ بەرهەمێکی چاك بێنێتەدی بۆ شتێکی وا" میکانیك"و دیاردەیەکی"دەرەکی" کە هەلبژاردنی گەردونیه"[٧٣]. ئەریستۆکراتیزمی دیکتاتوری

موسـۆلینی وای لێدەکـرد کـەژمارە رەتبکاتـەوە، واتـــا ژمـــارە وەك گوزارشـــتێکی نوێنەرایەتی کۆمەڵ.

فاشیزم، کاتێك دەستەبژێری دەخستە جێی زۆرینەی بێ ویست، خۆی بەرەو ادەکـرد ( خۆی بەشەرعی دەکرد ) بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی ویستی میللەتی ئیتالی بکات.

گومانی تێدا نییە کە لەسەر ئاسـتی جیـهانبینیو فەلسـەفەی سیاسـی، بـەعسو فاشیزمی ئیتالیو ناسیۆنال سۆسـیالیزمی ئـەڵمانی، هـەر چـەندە لەهـەندێ خـاڵدا جیاوازن لەگـەڵ یـەکتری، دەیانـەوێ، هەریەکـەو بەشـێوەی خـۆی " ئۆلیگارکیـەکی یارمەتیدەر" بەدیبێنن، بەواتایەکی دیکە دەیانەوێ فۆرمێکی حکومەت بخولقێنن کە لەناویدا ئەریستۆکراسیەتێکی ئایدیۆلۆژی دەسەڵاتێکی ڕەهـا بسـەپێنێ بەسـەر ئـەو زۆرینەیەی یان ئەو جەماوەرەی کە لەسروشتو پێکهاتەی ئۆنتۆلـۆژی خۆیـدا توانـای مومارسە کردنی مافی خۆی نییەو نەزانو بێ ئاگایە لـەئیدێیالی خـۆی. لەڕاسـتیدا لەم تێڕوانینەوە گرنگی بێهاوتای دەستەبژێرو تاك هـەڵدەقولێ. هیتلـەریش دەیویسـت سەرکردایەتی کۆمەڵ بدات بـە " تاکـە بـەرزەکان"، بـەو کەسـانەی کـە "باشـترین مێشکیان" هەبوو."ئامانجی مەزنی" ناسیۆنال سۆسـیالیزمو ناسـیۆنالیزمی بەعسـی ئیمپێرەتیڤانـە پێویسـتیان بـەو تاکانـە هـەبوو کـە "بەشـێوەیەکی تایبـەتی ژیـرو زیرەکن"،کەڕزگاریان بوە لەناسەقامگیریی‌و خاوو خلیچکیی‌و دژی بێمێشکی‌و وورِیـی زۆرینەن: ئەوانە دەبێ جڵەوی دەسەڵاتو سەرۆکایەتی بگرنە دەست. هیتلەر دەیگـوت: "کاتێك کەژمارەیەك لەو تاکانەی کەپڕن لەوزەو هێزی ئەکتیڤو بەتـەواوی ڕزگاریـان بوە لەوتەمەڵیەی کە جەماوەر دوچاوی بۆتەوە یەکتری دەگرن، ئەوانـە دەبـن بـەخاوەنی میللەت"[٧٤].

ئایا ئەم هەڵبژاردەیە یان ئەم ژمارە کەمە کە لەناو باوەشـی میللەتـەوە دێتـە دەرەوە وگوزارشت لەویستی میللەت دەکات، پێکهاتوە لە کێ؟

لەراستیدا ئـەم دەسـتەبژێرە هیـچ کیـانێك ناگـەیێنێ حـیزب خـۆی نـەبێ. ئـەم کەمایەتیە کەدەبێ دەسەڵات بگرێتـە دەسـتو بـەردەوام بێـت لەمومارەسـە کردنـی

دەسەڵات بەبێ دابەشکرنی لەگەڵ میللەتو کیانی دیکـەداو هـەڵگری "عەدالـەتی ئیدێیاله"، بریتیه لـەحیزب. ئـەم کەمایەتیـە لەهـەمان کـاتدا زۆرینەشـە، چونکـە بەگوێرەی "مەیوتیکی" maieutic بەعسو ناسیۆنال سۆسیالیزم گوزارشت لەهەستو نەستو ئومێدی میللەت دەکات.

بەلای بەعسیشەوە، لەبەرئەوەی ڕێکخەرو ئەرکی خستنەکاری ویسـتی ڕاسـتەقینەی میللەتی لەسەرە ، ئەم کەمایەتیە تەنها خۆی سنوور بۆ بەرژەوەندی گەل دادەنێ. لەبەر ئەوەی کاتێك کەنوێنەرایەتی ئامانجی ئێستاو پاشەڕۆژی گەل دەکات، ئـەم کەمایەتیـە خۆی لەخۆیدا زۆرینە پێکدێنێ. بۆ نمونە سەدام حوسـەین دەڵـێ: "هـەموو حـیزبێك، بـەپارتی بەعسـی عـەرەبی سۆسیالیستیشـەوە، پێکـهاتوە لەکەمایەتیـەك ئەگـەر بەراوردبکرێ بەکۆی خەڵکەوە ( بەگشت دانیشتوانەوە). . . . بەڵام کـاتێك گوزارشـت لەداخوازیو هەڵسوکەوتی ڕۆژانـەی نوێنەرایـەتی ویسـتی میللـەت دەکـاتو کـاتێك کردەوەکانی لەگەڵ ئامانجەکانی میللەت لـەحازرو داهـاتودا دەگونجێـن، ئـەم حیزبـە زۆرینە پێکدێنێ" (٧٥). دەبێ بوترێ کەئەم لۆژیکە هیچ جیاوازی نییە لەگـەڵ ئـەوەی هیتلەر: "کەمایەتی نوێنەرایەتی زۆرینەی ویستو بڕیار دەکات" (٧٦).

ئایدیۆلۆژیە ناسیۆنالیستە تۆتالیتاریەکان هەرچەند جیاوازی هـەبێت لـەنێوانیاندا، بەگوێرەی جیاوازی کولتورو مێژوو و دروستبونی سـایکۆلۆژی، لۆژیـكو هەڵوێسـتیان بەرامبەر ئەم مەسەلەیە یەکنو یەکتری دەگرنەوە لەوەی کە، وەکو بۆمـان ڕوون بـۆوە، میللەت بەکیانێکی بەتاڵ دادەنێنو لەبەر ئەوە میللەت ناتوانێ ویستی هەبێت. گشت فەلسەفەی بەعسو ناسیۆنال سۆسیالیزم لەم هەڵوێستەوە هەڵئەهێنجێنرێ (اسـتنتاج دەکرێ ): ئەگەر میللەت ویستی نەبێ، کـرداری سیاسـی، کـردەوەی سیاسـی، کـاری سیاسی هیچ واتایەکی نییە. لەبەر ئەوە، پێویستە بەشـێوەیەکی ئیجبـاری ویسـتێکی تایبەتی هەبێت کە لەپێشدا نوێنەرایەتی بکات: پێشـینەیی ویسـتی تایبـەتی خـۆی دەسەپێنێ بەسەر ئەو بارو دۆخەی کە ویستی گشـتی دروسـت دەکـات. ئـەم ویسـتە،

ویستی ئێلیتێکی ئایدیۆلۆژیە کە هاوشێوەیە لەگەڵ تەنها ویستێك: ئـەوەیش ویستی سەرۆکە.

## کورتەی چیرۆکەکە : لێڤیەتانی بەعس

تێڕوانینی بەعس سەبارەت بە "ویستی میللـەت" دەمـان باتـە هـەمان لۆژیکـی لێڤیەتانی هۆبسیو لەوێوە بۆ ناسیۆنال سۆسیالیزمو فاشیزم. لەڕاسـتیدا، لێڤیـەتانی هۆبسی وەلامێکی "بۆ دواوەتەماشاکەری" retrospective پێداویستەکانی سـەرۆکی بەعسیە. باپێش هەموو شتێك بیری تۆماس هۆبس Thomas Hobbes لەم بارەیەوە بـە کورتی ڕوون بکەینەوە لەبەر ڕۆشنایی پێشکەشکردنی "درنجی تەوراتیی" کە کتێبـی یەعقوب باسی لـێ دەکاتو دەڵێت: "هیچ هێزێك نییە لەسـەر گـۆی زەویـدا بتوانـێ بەراورد بکرێ بەو"[٧٧]. هونەری ئادەمیزاد... ئەوەیە کە دەتوانێ ئاژەڵێکـی دەسـتکرد بەرهەمبێنێ.بەڵام بەلاسایی کردنـەوەی ئـەو کـارە ماقوڵـەو زۆر بەنرخـەی سروشـت کەمرۆڤە، هونەر هێشتا دورتر دەڕوانێ. ئەم هونەرەیـە، کـە ئـەم لێڤیەتانـە گەورەیـە دەخولقێنێ کە پێی دەڵێن کۆمار یـان دەوڵـەت ( سیڤیتاس بـە لاتینـی ). ئەمـەش مرۆڤێکی دەستکردەو هەرچەندە باڵاو هێزێکی گەورەتری هەیە لەمرۆڤێکی ئاسـاییو، دروست کراوە وەك تەواوکەری ئەو بۆ بەرگری کردن لێی. لە کەسایەتی ئەودا سەروەری بریتیە لەڕۆحێکی دەستکرد چونکە ژیانو جولانـەوە بەهـەمـوو لـەش دەبەخشـێ .... پاداشتو سزا کە بەسەروەریەوە بەیەکەوە بەسراونەتەوە سـەرجەم ئـەندامان دەبزوێنـن لـەپێناوی جێبـەجێکردنی ئـەرکی خـۆی.... گەشەسـەندنو دەوڵەمـەندی سـەرجەم ئەندامە تایبەتیەکانی بریتین لەهێز. کاری پێکهاتوە لەپاراستنی گـەل...یەکسـانیو یاسا ئەقڵو ویستی دەستکردن، یەکێتی ڕاسـتەقینەو تەندروسـتی بـۆ دەخولقێنـنو کێشەی خەڵکی، نەخۆشیو شەڕی میللیو مردنی بۆ دروست دەکـەن. لـە کۆتـاییدا، پەیمانو ڕێککەوتن کە لەبناغەدا بۆ ئەوان جەستەی سیاسی بەرهەمهێنراون. ئەگـەر

پێکەوە کۆبکرینەوەو بکرێن بەیەك لەوە دەکەن کەکاتێك خوای بەخشندە ووتی با مرۆڤ لەکاتی خەڵقاندنی دنیادا دروست بکەین "[٧٨].

ئەم لیڤیەتانە کە بۆ سەر ئاستی چاودێریکەری گەورەی تەندروستی میللەت کە بەرزکراوەتەوە، دەبێ ببێ بەوەی کەگەرەنتی ئاشتی بکات لەناو کۆمەڵی دەستکرددا. خەڵکی، بەلای هۆبسەوە، ناتوانن لە"دۆخی سروشتیدا" پێکەوە بژین چونکە "هەموو کەس دژی هەموو کەسێکە". پێویستیان بەدەسەڵاتێك هەیە کەبیان پارێزێو لە لەناوچوون ڕزگاریان بکا. "لەوەوە بەشێوەیەکی ڕوون دەردەکەوێ کە هەتا خەڵکی پێکەوە بژین لەژێر سایەی دەسەڵاتێکی هاوبەش کەبەڕێزەوە ڕایان بگرێ، لەدۆخێکدا دەژین کە پێی دەوترێ جەنگ، ئەم جەنگەش بریتییە لەجەنگی هەموو دژی هەموو"[٧٩]. لەدۆخێکی وادا، هیچ جێگایەك نییە بۆ کۆمەڵێك لەئاشتیدا. یەکسانی یان نایەکسانی چەمکێکی بێ واتان چونکە دەسەڵاتێکی هاوبەش نییە، یاسانییەو" لەو شوێنەی یاسا نییە، یەکسانی نییە "[٨٠]. لە دۆخێکدا کە " هیچ ناتوانێ نایەکسان بێ، " توندو تیژیو زۆرزانی" دەبن بەفەزیلەی بنەڕەتیی. لە "کۆمەڵێکی سروشتیدا" هەریەك ئازادە دەسەڵاتی خۆی بەکار بێنێ بەگوێرەی ویستی خۆیو سەروەرە بەرامبەر خۆی چونکە لەدۆخی جەنگدا "هەریەك بەگوێرەی بیرکردنەوەی خۆی سەروەرە "[٨١]. لەدۆخێدا کە "مرۆڤ بوە بەگورگ بۆ مرۆڤ " homo homini lupus ، خەڵکی ناتونن بەشێوەیەکی هەمیشەیی بژین ئەگەر یەکتری لەناو نەبەن. غەریزەی خۆهێشتنەوە، ئیجباریان دەکات کەمەیلیان بۆ ئاشتی هەبێت. بۆ ئەوەی بەئاشتی بژین خەڵکی ناچارن پەیمانێك لەنێوان خۆیاندا ببەستنو ویستە تایبەتیەکەیان بدەن (بگوێزنەوە بۆ) بە یەکێکی دیکە. بەم شێوەیە کۆمەڵی دەستکرد لەئەنجامی پەیمانێك لەنێوان خەڵکی دروست دەبێ کە لەناویدا دەسەلاَت دەگوێزدرێتەوە بۆ یەکێکی دیکەو ئەمەش ئەو لیڤیەتانەیە کە مافی سروشتیی ڕەهای دەبێت بەسەر پیاوە دروستکراوەکان. ویستی تەنهاو دابەشنەکراوی ئەم لیڤیەتانە جێی ویستی هەموان دەگرێتەوە. ئەم لیڤیەتانە بەشێوەیەکی ڕەها لەدەرەوەی ئەو پەیمانەیە کەخەڵکی لەنێوان خۆیاندا دەیبەستن.

"ئەمەیە نەوەی ئەم لیڤیەتانە گەورویە ، یان بۆ ئەوەی بەڕێزەوە قسەبکەین، نەوەی ئەم خودایە کەنەمر نییەو دەمانپارێزێو ئاشتیمان بۆ مسۆگەر دەکات بەبێ پەنا بردنە بەر خوای نەمر. چونکە فەزیلەی ئەم دەسەڵاتە کە وەری گرتـوە لەهـەر یـەك لەتاکـەکانی کۆمارو ئەو جموجۆڵیەی کە پێی دراوە لەلایەن دەسەڵاتێكو هێزێکی بەم شێوەیەو ئەو ترسەی کەبڵاوی دەکاتەوە وایان لێدەکات کە هەموو پێکەوە ویستی خۆیان یەکبخـەن لەپێناوی ئاشتی ناوخۆو هاوکاری یەکتر دژی دوژمنی دەرەوە"[٨٢].

لەوەی کە تائێستا باسمان کردوە دەگەینە چ ئـەنجامێك؟ بـەلای هۆبسـەوە خـەڵکی هاوکات کاریگەری ئەقڵیان بەسەرەوەیە. بێگومان بەکارهێنانی ئەقڵ دەیانبـات بـەرەو ئاراستەی پەسەند کردنی ژیان لەکۆمەڵداو پێکـەوە ژیـان. ئەگـەر وانـەبێ، لـەدۆخی سروشـتیدا ، تـەماعو کێبڕکـێو خۆپەرسـتی دەسـت بەسـەر کەراکتـەریدا دەگـرن. کردەوەکانی " لە ڕێگەی حوکمدانی خۆیو حەزە تایبەتیـەکانی بـەڕێوە دەبرێـن"[٨٣]، هەریەکە خۆی لەگەڵ بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی دەگونجێنێ. لەبەر ئەوە پێویسـتە ویستێکی بـەهێز هـەبێت کەحـەزو تـەماعی بـەرەو دواوە بگەڕێنێنـەوە یـان ئەگـەر پێویستی کرد بیچەوسێنێتەوە یان لەپێناوی بەردەوام بوونی کۆمەڵ هێزبەکار بێنێ.

ئەم پەنۆرامەیە ئەوەمـان پیشان دەدات کەکۆمـەڵ لـەدۆخێکدا دەژی کەنوسـەرێك Jules Monnerot وەسفی دەکات وەك هەسـتی تەنگانـەو تـەنیاییو بـێ هـێزی یـان "دۆخی دژوار"[٨٤] کە پێویست بەبوونی دەسەڵاتێکی یـەکگرتو دەکـات. دەسـەڵاتێك کەبتوانێ گرێ کوێرەوکێشە لەناو کۆمـەڵێکدا نـەهێڵێت کەدەیـەوێ بەئاشـتی بـژی. خۆی، ئەم "دۆخە دژوارەیە" کە سنوور بۆ کەراکتـەری سـۆتۆریۆلۆژی sotoriology سەرۆكو سەپاندنی ویستی ڕەهای سەرۆك دادەنێ.

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئایدیۆلۆژیای بەعسی، دەتوانین بڵێین کە بەعسیش لەهەمان خاڵی دەستپێکردنو ڕوانگەی هۆبسەوە تێدەڕوانێ: ئەو خەتـەرە نزیکـەی کەخەریکـە نەتەوەی عەرەب دەفەوتێنێ پێویستی بە "هاتنی" ڕزگارکەرێك هەیـە. ئایدیۆلۆژیـای بەعسی وێنای "ژینگەیەکی دەرەکی دوژمنانەو دژواری بەردەوام" دەدات کـە خەریکـە

خۆی بەسەر نەتەوەی عــەرەبدا دەسـەپێنێ. ئـەم ژینگەیـە هـەر خـۆی لـەخۆیدا وەك دوژمنێك دێتە پێشەوە کەبەرپرسە بەرامبەر ئەو شتەی کەبوونی نییـە[٨٥]. بەرامبـەر ئەم دوژمنایەتیە، بیروڕای جیاوازو دووبەرەکی هێزی پاڵپێوەنەری نەتەوە لاواز دەکات‌و لەچالاکی‌و بزێوی کەم دەکاتەوە. تەنها پاراستن لەم نەخۆشیە یەکگرتنی ناوخۆییە. بەم بۆنەیەوە، سەدام حوسەین تێبینی دەکات: "سەرەڕای ئەوەی کە هەمیشـە واز نـاهێنین لەدووبارە کردنەوەی باسکردن سـەبارەت بـەو هـێزە دەرەکیانـەی کەڕاسـتەوخۆ پیـلان دادەنێن دژی ئێمەو دژی شۆرشـەکەمان‌و بەگشـتی دژی میللـەتی عـەرەب‌و گـەلانی نزیك، تەنها خۆپاراستی سەرەکی (لەم پیلانانە) پێك هاتوە لەبەرگری نـاوخۆیی"[٨٦].

بەلاّم کێشەو نەخۆشی نەتەوەکە تەنها لـەدەرەوە سـەرچاوەناگرن، بـەڵکو لەناویشـەوە. میشیل عەفلەق کەباسی" تێڕوانینی ئەسڵی بەعس" دەکـات دەڵـێ لـەکاتێکدا کـە "دەڵێین نەتەوەی عەرەب لەدۆخی جەنگدایە، (. . .) واتای ئەوەیە کەبـەعس هـەرگیز بێ ئاگا نەبوە بەرامبەر بـەو مـەترسـیە ڕاسـتەقینانەی کـە دەورەیـان داوەو بەرامبـەر بەگەورەیی ئەو کارەساتانەش کە ئازاری دەدەن"[٨٧]. زیـاتر لـەوەش میشـیل عەفلـەق بەردەوامە لەئاماژەکردن بۆ" پێویستی پەروەردەکردنی هەموو یەکێك بـەگوێرەی ئـەم دۆخە سایکۆلۆژیە. شتێکی باشە کەجەخت بخرێتـە سـەر ئـەوەی کەشـەڕ لـەدوژمنی دەرەوەو دۆخی خراپی ناوەوە سەرچاوە دەگرێ [٨٨]. "دۆخی جـەنگ" کـە لەخەتـەری دەرەوەو ناوەوە هەڵدەقولێ، پێش هـەموو شـتێك پێویسـتی بەیـەکگرتنێکی نـاوخۆیی هەیە یاخود پێویستی بەوە هەیە کەسەدام حوسەین پێی دەڵێ "مەناعەی ناوخۆ".

لێرەدا چەند پرسیارێك خۆیان دەسەپێنن: کێ دەبێ ئەم بەرگریە ناوخۆییـە مسـۆگەر بکات، یاخود کێ دەبێ یەکگرتنی کۆمەلاّیەتی بخولقێنێ بۆ ئەوەی کۆی نەتەوایـەتی بتوانێ لەئاستیدا بژی‌و بەردەوام بێت؟ ئایا سنورێکی کـاتیی هەیـە بـۆ ئەمـە، واتـا تاکەی دەبێ بەردەوام بێت؟

هۆبس، وەکو ڕونمان کردەوە، وەلاّمی ئەم پرسیارانەی داوەتەوە: دەسەڵاتی تەنها تاکێك وئەم دەسەلاّتەش نەك "تەنها بۆ کاتێکی دیاری کـراوو سـنووردار"[٨٩]، بـەڵکو هـەتا

هەتایە چونکە خەڵکی تەنانەت ئەگەر "لە ڕێگـەی هـەوڵو تەقـەللا سـەرکەوتنیش بەسەر دوژمنی دەرەکیدا بەدی بێنن، (دوایی) لەژێر تـەوژمی جیـاوازیی بـەرژەوندی، بەش بەش دەبنەوەو دیسانەوە دەست دەکەنەوە بەشـەڕ لـەنێوان خۆیـاندا"[٩٠]. هۆبـس مەبەستی لەوە بوو کەویستی ڕەهای تەنها تاکێك زۆر پێویسـتە چونکـە ئـەم ویسـتە ڕەهایە، لۆژیکانە، لەئەنجامی بێ هاوتای مەیلی مرۆڤ بۆ شەڕ دێتـە کایـەوە. لـەوەوە، بەرای ئەو، خێرا، گرنگیی یەکگرتنی کۆمەڵایەتی پێویستی بـەبوونی ویسـتی ڕەهـای لێڤیەتان دەکرد "بۆ پاراستنی ئاشـتیو ئاسـایشو بەرهەڵسـتی کـردن دژی ئـاژاوەی ناوخۆو دوژمنایەتی لە دەرەوە"[٩١].

چۆن ئایدیۆلۆژیای بەعسی ئەم بابەتانە دەخاتە ڕوو؟ دەبا لەو پێناسـەوە دەسـت پـێ بکەین کە بەعس سەبارەت بە چەمکی نەتەوە دەیکات:

" نەتەوە بە ژمارە پێوانـە نـاکرێ بـەڵکو بیرێکـە لـە نـاو کۆمـەڵدا یـان لـە هەندێکیدا بەرجەستە دەبێت، میللەتانیش بە کەمی ژمارەیان لە ناو ناچن، بەڵکو بـە نەبونی بیرێك لە نێوانیاندا لە ناودەچن. کۆی ژمارەیی خۆی لە خۆیدا وەك ژمارە پـیرۆز نییە، بەڵکو پیرۆز بونو بەرجەستە بونی بیرە نەتەوەییەکەیە لەو ژمارەیەدا لە ئێسـتا بێت یان لە ئایندە، چونکە ئەو بیرە نەتەوەییە لەهەموو تاکێکی ناو کۆمـەڵدا وەك تۆو بونی هەیە بەڵام پێویستی بە نەشو نماو گەشەکردن هەیە تا بتوانێ بە ناوی کۆمـەڵەوە قسە بکات. سەرۆکیش لە کاتێکدا ئەم بیرە نەتەوەییە لاوازو لە پاشەکشەدا بێ، دیارە زۆرینەی لە گەڵدا نابێ بەڵکو نەیارانو دژەکانی زۆر دەبن، سەرۆکیش بـیر نـاکـات بـە قوربانی ژمارە بەڵکو بە پێچەوانەوە ژمارە بەرەو بیر دەبـات. سـەرۆك کۆکـەرەوە نییـە بەڵکو لێدەرو ڕێکخەرە، واتا خاوەنی بیرێکە کە هەرچیەك پێی ناخۆش بێ یان جیـاواز بێ ( لە گەڵیدا) لـێ جیا دەکاتەوە"[٩٢].

ئایا ئەم تێڕوانینە ویستی ڕەهای سەرۆکی بەعس بەردەوام پێناکات؟

با ئەم پرسیارە بەشێوەیەکی دیکە بخەینە ڕوو. کاتێك کە دەڵێ حیزب نوێنەرایـەتی "ویستی میللەت" دەکات چونکە "کردەوەکانی لەگەڵ ئامانجەکانی میللەت لـەدۆخی

ئێستاو پاشەڕۆژدا دەگونجێن"، ئایا ئایدیۆلۆژیای بەعسی کە ئـەم ویسـتە بەویسـتی ڕەهای سەرۆکەوە دەلکێنێ، نایکات بەشتێکی هەمیشەیی؟ ئەگەر وەلأمی ئەم پرسیارە پۆزیتیف بێت کە بەراستی پۆزتیڤیشە، ئایا میللەت ویستی هەیە کە بەرێگەیەك یان بەرێگەیەکی دیکە بتوانێ گوزارشتی لـێ بکات؟ بێ گومان دەکەوینە ناو پلیۆنـازم pleonasm یان تۆتۆلۆژیەوە tautology ئەگەر دیسانەوە ئەم باسە دووبارە بکەینـەوە. بەلأم ئەوە ڕوونە کە ئەگەر سەرۆك وەك سەرۆکێك کە هەلگری "بیری پـیرۆزی" نەتـەوە بێت، هەلگری "ویستی" نەتەوە نییە کە ڕاستەوخۆ نوێنەرایەتی دەکات. هـەر لەبـەر ئەوەشە کە لەلاپەڕەکانی پێشوودا هێلمان بەژێر ئەوەدا هێنا کە "ویسـتی میللـەت" بەو شێوەیەی کەبەعس پێناسەی دەکات، ویستێکی ڕاستەقینە نییە چونکە لەڕێگەی ئـەم "بـیرە" هێگلیـەوە دێتـە کایـەوە: ئـەم "بـیرە" هێگلیـە کـە "ڕەهایـە"و "خۆسنووردانەرە" "بۆ خۆی" و"خۆی لـە خۆیـدا" ئەگـەر بمانـەوێ هـەمان زاراوەی هێگلێ بەکار بهێنین. میللەت بۆ بەعس ئەوەیە کە بۆ هێگل "بەشێکە لەدەولەت کـە نازانێ چی دەوێت"[٩٣]. سەرۆك ئەو تاکەیە کە دەزانێ چی دەوێت: ئەو تاکەیـە کـەوا لەمیللەت دەکات کە ویستی هەبێت. بەم شـێوەیە ئایدیۆلۆژیـای بەعسـی "ویسـتی میللەت" دەلکێنێ بەویستی سەرۆکەوە. نابێ ئـەوەش فـەرامۆش بکـرێ کـە بـەلای بەعسەوە، هەروەها بەلای ناسیۆنال سۆسیالیزمو فاشیزمیشـەوە، "ویسـتی میللـەت" تەنها لەڕوالەتێکی دادوەری گوزارشت ناکات چونکە لەراسـتیدا "ویسـتی میللـەت" بوونی نییە. ئەوەی کەبوونی هەیە تەنها ئـەو" بیرەیـە" کـە لـەناو ویسـتی سـەرۆکدا مەتێریالیزە دەبێت.

فاشیزمی ئیتالیش لەڕیگەی هەمان ئۆپێرەسیۆنی لۆژیکیەوە دەگاتە ئەوەی "ویستی میللەت" بلکێنێ بەویستی سەرۆکەوە. بەم بۆنەیەوە دەتوانـێ بوتـرێ کـە جیـهانبینی بەعسی، لەم بارەیەوە، هیچ جیاوازیەکی وای لەگەلێ فاشیزمی ئیتالیدا نییـــە. کـاتێك کەموسۆلینی دەولەت پێناسە دەکات، دەلێ کەدەولەت[٩٤] " ژمارە نییە کەبریتی بێت لەکۆی ئەو تاکانەی کەزۆربەی میللەت پێکدێنین"[٩٥]. موسۆلینی دژی دیموکراسیەت

دەوەستێ چونکە لەڕوانگەی ئەوەوە دیموکراسیەت میللەت پێناسە دەکات وەك زۆرینەی ژمارە. موسۆلینی دیموکراسیەتی زۆرینەی ژمارە لادەبات و دیموکراسیەتی فاشی "ڕێکخراوو سەنترالیزە کراو وتۆتۆریتار (دەسەڵاتخواز)"(٩٦) دەخاتە جێگەی. بەلای موسۆلینیەوە دیموکراسیەتی فاشی بەشێوەیەکی ڕاستەقینەو ڕاستگۆ گوزارشت لە "ویستی میللەت" دەکات، چونکە "میللەت بەچۆنایەتی و بەچەندایەتی واتای ئەو بیرە بەهێزە دەبەخشێ کە لەناو میللەتدا وەك هوشیاری و ویستی ژمارەیەکی بچوك یان ویستی تاکێکی لێدێت و وەك ئیدێیالێك دەیەوێ ڕاستەوخۆ بچێتە ناو هوشیاری و ویستی هەموو"(٩٧).

وەکو تێبینی دەکەین، چەمکی بیری هێگلی جێی چەمکی ژمارە دەگرێتەوەو بۆ بەعس و فاشیزم، نەتەوە یان میللەت پێك نەهاتوە لەچەند خەڵکێك کەپێیان دەوترێ هاوولاتی بەو واتایەی کەتوانایان هەبێ هاوبەشی بکەن لەو کردەوە دادوەریە جیاوازانەی کە بەهۆیانەوە گوزارشت لەویستی میللی دەکرێ(٩٨)، بەڵکو پێك هاتوە لەو "بیرەی" کەدەچێتە ناو "ویستی" سەرۆکێك. "ویستی میللەت" پێکنەهاتوە لەگوزارشتێکی چەندایەتی گشتی چونکە میللەت ناتوانێ نزم بێتەوەو کەم بکرێتەوە بۆ قەوارەیەکی چەندایەتی. ئەگەر مەبەستمان لەچەندایەتی خستنەسەریەکی چەند "شتێکی بێ ڕۆح" بێت، ئەوا بەهیچ شێوەیەك ناتوانین مەسەلەی ویست بێنینە پێشەوە. نەتەوە پێکهاتوە لە "کۆیەکی" چۆنایەتی، پێکهاتوە لەو"بیرەی" کەچۆتە ناو ویستی ڕەهای سەرۆکەوە. سەرۆك ئەو تاکەیە کە خاوەنی ویستی ڕەهایە کە ژمارەکان بەیەك دەگەیێنێ و دەیانگوێزێتەوە بۆ ناو "بیر".

پیرۆزیی نەتەوە، لەسەر ئاستی پراکتیکیدا، لەم "بیرە"وە هەڵدەقوڵێ کەچۆتە ناو ویستی سەرۆکەوەو ئەمیش بەرپرسێتی بەدیهێنانی "ئامانجی مەزنی" لەپاشەڕۆژدا وەرگرتوە. بۆ ئەوەی بناغەکەی بەهێز بکرێت و بگەشێنرێتەوە، دەبێ ئەندامەکانی ڕەفتاربکەن و خەریکی ئەو کردەوانە بن کە لەگەڵ ویستی سەرۆك بگونجێن. ئەگەر ئەم "بیرە" بەرەو لاوازیی بڕوات، واتا ئەگەر پیرۆزی نەتەوە بەرەو کز بوونەوە بڕوات، ئەوا

ئەركی سەرۆكە كەدەسپێشخەری بكاتو كاری بۆ بكات. لەم بارو دۆخەدا سەرۆك پێویستی بەوە نییە كەبانگەشە بۆ جەماوەرو، بۆ میللەت بكات. مافی بێ هاوتای خۆی هەیە( ئەو مافەی كە ناتوانرێ مشتو مڕی لەسەر بكرێ ) وەك "خاوەنی بیری بێ هاوتا" كەهێز بەكار بێنێ دژی هەموو كەسێك كەهەوڵ بدات بەرپەرچیبداتەوە.

گومانی تێدا نییە، ئەم تێڕوانینو هەڵوێستە، ئەو دەرسانەی هۆبسمان بیر دەخاتەوە بە بۆنەی "جەریمەی لیزمەژێستێ (جەریمە دژ بە مەزنیی سەروەر): "خەڵكی دەبێ ئاگادار بكرێنەوە سەبارەت بەگرنگیی تاوانەكانیان ئەگەر باسی خراپەی نوێنەری سەروەر بكەن(. . .) یان بەرهەڵستیو مناقشەی دەسەلاتی بكەن، یان ئیتر بەڕێزەوە ناوی نەهێنن بەشێوەیەك كەببێتە جێی رقو كینەی رەعیەكەیو واز لەملكەچبوون بێنن كە بنچینەی ئاسایشی كۆمار پێكدێنێ. لێرەدا خاڵێكی ئەو عەقیدەیەمان لەپێش چاوە كە لەسەر ئاستی بەراورد كردن سێهەم فەرمانمان وەبیر دەخاتەوە"[٩٩].

ئایا بەعس چ سنورێك بۆ دەسەلاتی سەرۆك دادەنێ لەكاتێكدا دەیەوێ لەپاشەڕۆژدا بیكات بەنوێنەری بیری پیرۆزی نەتەوە ؟ یاسای مۆرالیێ خاوەن "بیر" پێكهاتوە لەوەرگێڕانی ویستی بێ سنور بۆ هێز. تەنها سنوور ئەگەر هەبێ سنورێكی خۆییە كە لەلایەن خودی خۆیەوە وەكو خاوەن، دابین كراوە. "چونكە ئامانجی ئەم دەزگایە بریتییە لەئاشتیو بەرگری كردن لەهەموو كەسێك كەمافی ئەو ئامانجەی هەبێت، مافی رێگەشی (ئامرازیشی) هەیە. هەموو تاكێك یان هەموو كۆمەڵێ كەمتمانەی سەروەریی پێ درابێت مافی ئەوەی هەیە ببێ بەحاكمی ئەورێگایانەی كەپێوستن بۆ گەیشتنە ئاشتیو بەرگری كردن، لەهەمان كاتدا ببێ بەحاكمی ئەوەی كەبێزاری دەكاتو ئەوەی كەپێویستە بكرێت"[١٠٠].

ئایدیۆلۆژیای بەعسی كەدەیەوێ مۆدێلێكی ئیدێیال بۆ "كۆمەڵی بەعسی" بخوڵقێنێ، لەڕاستیدا دۆكترینی (عەقیدەی) "ئامانج پاساوی ئامراز دەكات" بەواتا نێگەتیڤەكەی بەكاردێنێ. بەم بۆنەیەوە دەتوانین بڵێین كە بەبێ هیچ گومانێك دیدی مەكیەڤێللی نوێنەرایەتی ئێتیكە هەرە گرنگەكانی پیاوی خوایی بەعس دەكات.

بابزانین بــه چ شـێوەیەك. کێشـەی سیاسـی، نـاوەندی سـەرنجی بـیری مەکیـەڤێللی پێکدێنێ: چـۆن بەشـێوەیەکی تونـد "دەوڵـەتی نـوێ" بنیـاد دەنـرێو کـەبنیاد نـرا پارێزگاری دەکرێتو بەردەوامی پێ دەدرێت؟ بۆ ئەوەی سەروەر دەسەڵاتی خۆی بپارێزێ، پێویستی بە "فەزیلە" هەیە. بـەڵام بـێ گومـان ئـەم فەزیلەیـە هیـچ پەیوەندیـەکی بەچەمکی فەزیلەی ئاینیەوە نییە چونکە ئامانجەکەی وڵاتی سەر زەویە نەوەك ئاسمـان. ئەو"فەزیلەیەی" کە مەکیەڤێللی باسی لـێ دەکات پەیوەندی بەهێزو توانـاوە هەیـە: سەروەر کە دەیەوێ دەسەڵات بگرێتە دەستو لەهەمان کاتدا پارێزگاری بکـات، دەبـێ پەنابەرێتە بەر هێزوتوانای خۆی بەبێ گوێ دانە ئیعتباراتی ئـەخلاقی. مـۆراڵ تەنـها لەباش یان لەخراپ جێ بەجێ کردنی توندو تیژیدا ئیعتباری بۆ دەکرێت. بەڵام تونـدو تیژی دەبێ باش بەکار بهێنرێ لـەکاتێکدا ڕەوا بێـت کـە بوتـرێ خـراپ باشـە( کـە بەخراپ بوترێ باش). هـەر وەکـو جـان جـاك شـڤەلیێ Jean-Jacques Chevalier تێبینی دەکات، هیتلەر "کە بەڕاستو چەپ خەڵکی لــە نـاو دەبـرد لـە ٣٠ حزیـران ١٩٣٤ لـەوە دەکـات ئـەم پرینسـیپەی بـەکارهێنابێ"[(١٠١)]. ئیمپێرەتیڤــە بوتـرێ کەبەعسو سەدام حوسەینیش هــەمان پرینسـیپیان بـۆ کوشـتنی خـەڵکی عـیراقیو میللەتی کورد بە تایبەتی بەکار دەهێنا.

سەروەر دەبێ لەپێناوی گەیشتنە ئامانجەکانی خۆی، هێزو توندو تیژی دژی ســەرجەم ئەوخەڵکە بەکار بێنێ کەهەوڵ دەدەن بەرپەرچی نەخشەکانی بدەنەوە. "(..) سروشــتی میللەتان سەقامگیر نییەو رازی کردنیان ئاسانە بەشتێك، بەڵام ســەختە لـە ســەرئەم رازیبوونە بیانهێڵیتەوە. دەبێ واباش حوکمیان بکەیت کـەکاتێ بـاوەڕ نەکـەن، بـەهێز وایان لـێ بکەیت باوەڕبکـەن"[(١٠٢)]. لەئاسـتی لۆژیکـی سیاسـیو پراکیتکیـدا ئـەم فۆرمولەیە بنچینەی ئایدیۆلۆژیای بەعسی پێکدێنێو لەوێوە ڕێگە پاك دەکاتەوە بۆ سەرۆك کەمومارەسەی توندو تیژی بکات لەهەموو کاتێکدا کەویســتی خـودی خـۆی ڕێگەی پێ بدات. کاتێ باسی ململانێ دەکات لـەپێناوی یـەکێتی نەتـەوەی عـەرەب، ئایدیۆلۆژیای بەعسی بەم شێوەیە دیدی خـۆی دادەڕێـژێ: "(. . .) لـەم ململانێیــەدا

ئێمە خۆشەویستی خۆمان دەهێڵینەوە بۆ هەموو کەسێك. کاتێ توندو تیژین بەرامبەر ئەوانی تر، دەزانین کە ئەم توندو تیژیە لەپێناوی ئەوەدایە کەبیان گەڕێنینەوە بۆ گیانو راستیەکانی خۆیان. . ."[١٠٣].

ئەم هەڵوێستە باوکانەیەی بەعس کە بەشێوازێکی یوفیمیزم دەردەبڕێ، ڕێگە پاکدەکاتەوە بۆ توندوتیژیو بەشێوەیەك کەتێکگوری پرینسیپی قەوارەی مۆراڵیی مرۆڤ رەتدەکاتەوە. ئاپەتێمی apophthegm (* بەعسی پەردە رادەماڵێ لەتێکەڵبوونی consubstantialisation** ویستی سەرۆك لەناو زەبرو زەنگی "پۆزیتیڤ". بەم شێوەیە ئامانج پاساوی ئامراز دەکات. بەم شێوەیە لەپێناوی گەیشتنە " یەکێتی ئیدیال"[١٠٤]، ئایدیۆلۆژیای بەعسی بەئاشکراو تەنها هانی یەك ئامراز دەدات: زەبرو زەنگ. لەڕوانگەی بەعسەوە، توندو تیژی تەنها ڕێگەیە بۆ گوزارشت کردن لە "خۆشەویستی" چونکە ئامانجەکەی گەڕاندنەوەی "خۆی ڕاستەقینەیە" کە هەرەسی هێناوە. توندو تیژی بەعس دەبێ وەك باشیەك دەربکەوێ چونکە دەیەوێ "بیری مەزن" بهێنێتە دی کە بریتیە لەنەتەوە. توندوتیژی سەرۆك لەڕاستیدا باشیە: "دەتوانین، هەر وەکو مەکیەڤێللی دەڵێ، توندو تیژی بەچاکە لەقەڵەم بدەین ئەگەر بتوانین بەخراپ بڵێین باش(. . .)"[١٠٥]. بەلای مەکیەڤێللیەوە، میر کاتێ دەوڵەتی نوێ بنیاد دەنێ پێویستە خۆی وەك "بەبەزەیی"(بەڕەحم) دەربخات نەك وەك زاڵم. بەڵام ئەگەر پێویستی کرد "نابێ گوێ بداتە سومعەی خۆی سەبارەت بە خراپی توندوتیژی بۆ ئەوەی رەعیە پێکەوە کۆ بکاتەوەو وای لێبکات ملکەچی بن"[١٠٦]. کامیان باشترە: خەڵکی تۆیان خۆش بوێ یان لێت بترسن؟ خۆی، باشترە خەڵکی تۆیان خۆش بوێو لێت بترسن، بەڵام

---

* وتەیەك کە بەهای یاسایەکی مۆراڵی هەبێت.

** لەتیۆلۆژیدا ئەو عەقیدەیە دەگەیەنێ کە باس لە تێکەڵ بوونی جەستەو خوێنی عیسا دەکات. ئەم وشەیە بەشێوەیەکی گشتی تێکەڵ بوون لەناو یەك جەوهەری هاوبەش یان یەك سروشتی هاوبەش دەگەیەنێت.

ئەگەر گران‌و زەحمەت بێ کەهەردووکی بەدیبهێنی، زۆر باشترە وابکەی کەلێت بترسن وەك لەوەی کەخۆشیان بوێی[١٠٧].

سەرجەم تیۆری ناسانی حوکمڕانی ڕەها پشتیان بەستوە بەو تێزەی کەدەڵێ بەدیهێنانی کۆمەڵێ ئیدییال‌و پارێزگاری پەیڕەو و پەیوەندی جێگیرو بەردەوام لەنێوان سەرکردایەتی‌و ملکەچکردن، لەنێوان دەسەڵات‌و رەعیە ناتوانن بێنە سەر ڕوو ئەگەر لەڕێگەی سەپاندنی ویستی ڕەهای زاڵمێك (تیرانێك) نەبێ. بەڵام هەر لەبەر ئەوەی نەیان دەتوانی متمانە بکەن بەویستی ئازادی هاوڵاتیان، پێشنیازی هەموو ئامرازێکیان دەکردو هەموو ئامرازێکیان لەپێناو بەدیهێنانی بەکاردەهێنا. گرنگیی گرتنە دەستی دەسەڵات‌و پاراستنی، پێویستی بەوە نەدەکرد کە لەپێناوی بەڕەواکردنی دەسەڵاتیان بەشوێن تەبایی‌و پەسەند کردنی هاوڵاتیاندا بگەڕێن. تەنها پاساو بۆ هێزی قەسری تاکێك ئەوە بوو کە وەك خودای سەر زەوی پێناسە بکرێ. بەم شێوەیە پیاوی خودایی مافی بێهاوتای بەکار هێنانی دەسەڵاتی بێ سنووری هەبوو، مافی ئەوەی هەبوو کەزەبروزەنگ بەکار بهێنێ بۆ بڵاوکرنەوەی پەیامە ئاسمانیەکەی. بەم شێوەیە، سەروەریی میللەت لەڕێگەی ویستی سەروەرەوە (میرەوە) دەردەبرا، جێگری خودای بەخشندە لەسەر زەوی.

ئەمجا، لەسەر ئەم ئاستە چ بەعس چ ناسیۆنال سۆسیالیزم‌و چ فاشیزم کەکۆڵەکەی بیروباوەڕیان بەندە بەناسیۆنالیزمەوە زۆر لەیەك دەچن. وەك ئایدیۆلۆژیا هەرسێکیان کە دەیانەوێ " بەسەروی بارودۆخەوە بن"[١٠٨]، ئامانجیان بەردەوامی دانە بەم ترادیسیۆنە. دەبێ بوترێ، ئابەم واتایەیە کە هەر سێ ئایدیۆلۆژیاو سەرجەم ئایدیۆلۆژیا تۆتالیتاریەکان سەروەریی بۆ گەل دەگەڕێننەوە. هەر بەم واتایەشە کە "ویستی میللەت" دەگۆڕێ‌و دەبێ بەویستی ڕەهای سەرۆك. بەم بۆنەیەوە هیتلەر بەم شێوەیە پێشبینی بوونی خۆی نەدەکرد؟ "لەناو جەرگەی ئەم جەماوەرە(. . .) پیوێستەو هەر دەبێ ئەو پیاوە بێتە کایەوە کەهێزێکی پڕ باوەڕ بیبزوێنی‌و هەندێ پرینسیپی ڕەق دەخاتە سەر ڕوو(. . .) و جەماوەر دەلەرزێنێتەوەو خەباتی خۆی دەست پێدەکات

لەپێناوی سەپاندنی تاکە عەدالەتی ئەم پرینسیپانە، هەتا ئەو کاتەی دۆخی جیهانێکی ئازادی بیرو باوەڕ بەرز دەبێتەوە(. . .) لەپێناوی خزمەتی یەك باوەڕو یەك تاکە ویستی هاوکاریانە"[١٠٩].

چۆن کۆمەڵگەیەك دەتوانێ بوونی هەبێتو بەردەوامی بدات بەبوونی خۆی بەبێ ئەوەی ئەم "یەزدانە کەنەمر نییە" بەرز نەبێتەوەو نەگاتە سەر ئاستی ئاینی میستیك! هیتلەر نوێنەرایەتی سومبولو بەرجەستەی میللەتی خۆی دەکرد. هیتلەری "یەزدانکراو" بوو بوو بەوەی کە دەبوو بەشێوەیەکی نوێنەرایەتیانە بپەرسترێ[١١٠]. ئەمە بوو بەرهەمی ئایدیۆلۆژیای نایلیستی nihilist ناسیۆنالیزمی بایۆلۆژی نازیەت.

ئەی سەدام حەسەین؟ ئەویش بەرهەمی ناسیۆنالیزمی نایلیستی عەرەبییە، ئەویش "خاوەنی بیری بێ هاوتا"، بەرجەستەی بیری پیرۆزی نەتەوە بوو بەپەیامبەر: "قم للمعلم وفية التبجيلا كاد المعلم ان يكون رسولا"( هەڵسە بۆ مامۆستاکەتو ڕێزی پیشان بدە، مامۆستا خەریکە دەبێ بە پەیامبەر". ئەم هۆنراوەیەی هۆنەری میسری ئەحمەد شەوقی "ترانزپۆزە کراوە"( واتای ناوەڕۆکەکەی گوێزراوەتەوە بۆ ئاراستەیەکی دیکە) بۆ گەورە کردنی سەدام حوسەین. ئەمەیە ئەو بەیتەی کە هەڵبژێردرابوو و نوسرابوو لەسەر لافتەکانی عیراق بۆ "پیرۆزاندنی" "خاوەنی بیری بێ هاوتا". خاوەنی تەنها بیر کە "خەریکە دەبێ بە پەیامبەر" ناوی گەورەو مەزنیشی لێ دەنرێ: "سەرۆکی فەرماندە"، "سەرۆکی شۆڕشگێڕ" ، "ئەومۆدێلەی کەدەبێ دوای کەوی"، "سەرۆکی عەرەب"، "سواری نەتەوەی عەرەب"، "پاڵەوانی ڕزگاری خوازی نەتەوایەتی"، "الفارس المغوار"(سواری بەجەرگ)[١١١]. ئایا بەم شێوەیە ئەم"پیاوەی کە نمونەی نییە"، ئەم "یەزدانەی کە نەمرنییە"، بەرهەمی تێڕوانینێکی نایلیست بەشێوەیەکی ژیرو زیرەکیەکی بێنمونە کە بەزۆر خۆی دەسەپێنێ بەسەر جەماوەری بێباك، بەسەر "کۆی ژمارەیی"، ئایا ئەمە دەسەڵاتی ڕەها نییە؟

بانەختێکی دیکەش لەسەر ئـەم قەوارەیـە بدوێـین. وێنـەی سـەرۆك لـەناو هـەموو شەقامەکان هەڵواسرابو، لەناو هەموو خوێندنگەکان، لەناو بیناکانی بەڕێوەبەرایـەتی دەوڵـەت، لــە قۆمیســەریای پۆلیــس، لــەبارەگا ســەربازیەکان، لەدوکانــەکان، لەگۆڕەپانەکان، تەنانــەت زۆر جـاریش لەماڵـەکان‌و لەبـەلکۆنی خانوەکـان، لـەجێی حەسانەوەو پشودان‌و ژوری میــوان...هتـد، لەچوونـە نـاو هـەموو لادێیـەکی عـیراق وێنەیـەکی سـەرۆك بـەرزبوبوەوە. هیـچ کەسـێك دەر نەدەکـەوت لەبـەردەم کـامێرای تەلەڤزیۆن بەبێ ئەوەی کە لەپشتیەوە وێنەی سەرۆك دەرنەکـەوتبێ‌و لەهــەموو بۆنـەو خوتبەو قسەی خەڵکی ناوی دەهێنرا. بەکورتی لەڕادیۆ و تەلەڤزیۆن، نــاو ووتـەکانی گوێ‌و چاوی هەموانی دەکردەوە [١١٢]. منداڵی بچوکی خوێندنگەکان فـێری هۆنـراوەی ڕێز گرتن لەشەرەف‌و چاکەی سەرۆك دەکران. وێنەی لەســەر بـەرگی هــەموو کتێــب‌و دەفتەری خوێندنگەکان بوو و فەرمانەکانی لە سەر هەموو دەفتەرێك تۆمــارکرابوون‌و وێنــەی لەســەر کاتژمێرەکـان هەڵدەکـەنرا [١١٣]. لـەکاتێکدا بەسـەر شــەقامەکاندا دەرۆیشت خەڵکی مـەجبور بون بانگەشەی بۆ بکــەن‌و نـاوی بێنــن : "بـالدم بـالروح نفدیك یا صدام"(بەخوێن‌و بەڕۆح خۆمــان فیـدا دەکـەین بـۆت ئـەی سـەدام). پیـاوە سیاسیەکان دەستیان جووت دەکردو چاویان نزم دەکردەوە لەکاتێکدا کە لەپێش ئــەوان دەردەکەوت‌و وەزیرەکـان هۆڵــی کۆبوونــەوەیان بـەجێ دەهێشـت بـەبێ ئـەوەی پشـتی لێبکەن [١١٤] و بەرپرسە سیاسیەکان‌و کارگێڕیـەکان قاچیـان نەدەخسـتە سـەر قـاچ بەرامبەر هەیبەتی سەرۆك.

لەمەوە دەتوانین پرسیارێك بکەین: یەکێتی عەرەب، دەوڵەتی عــەرەب، نیشـتیمانی عەرەب، نەتەوەی عـەرەبی نەمر(امة العربیـة الخـالدة) یـان فۆرمولـەی بەعسـی: امـة عربیة واحدة ذات رسالة خالدة)کە لەسەر "ویستی میللەت" وەستاوەو ئەمیش لەسەر "ویستی ڕەهای سەرۆك" وەستاوە، ئەمانە چ واتایەکیان هەیە؟ سەدام حەســەین دەڵـێ کە "مێژوو بەرئەنجامی نەتەوەیە. ئەمە واتای ئەوەیە کە ئەوە بەسە گروپێـك لەخـەڵك کە لەسەر پارچەیەك زەوی بژیو بڕیــار بـدات بـۆ ئـەوەی بەشـێوەیەکی فیعلـی ببـێ

بەنەتەوە. چونکە سروشت بەشێوەیەکی سەرەکی سنوور دادەنێ بۆ ئـەوەی بزانـین ئێمـە نەتەوەین یان نا(. . .). لەسەر بناغەی ئەم پەیوەندیـە: ئێمـەی عـەرەب، تەنـها یـەك نەتەوە پێکدێنین،. خاکی ئێمە گشت نیشتمانی عەرەب دەگرێتەوە"[١١٥].

هیتلەریش، داوای یەکێتی لەسەر بناغەی پرینسیپی مافی "چارەنووس" دەکرد کـە لەسەر "ویستی گەلی ئەڵمان" دەوەستا[١١٦]. بەڵام ئەم ویستە، بۆ ئـەویش، گوزارشـتی لە ئەریستۆکراتیزمێکی دیکتاتۆری دەکرد کە بەسەریەوە سەرۆکێکی خودایـی حوکـم بکات. پیاوێك کەجارِ دەدات بۆ ئەوەی دەستی کردوە بەکاری سیاسی بەقەناعەتێکـەوە کەرۆژێك دەبێ بەرپسێتیەکی نائاسایی وەربگرێ[١١٧]، ناتوانـێ ئـەو لێڤەتانـەمان بـیر نەخاتەوە کەهۆبس باسی لێدەکات. ناشـتوانێ، بێگومـان، هیتلـەرمان بـیر نەخاتـەوە کەئەویش جارِی دەدا کەخودای بەخشندە پەیامی سەرۆکایەتی رایخی پێ بەخشیوە[١١٨]. مەترسی (خەتەری) ئەم بیرە تەنها ئەوە نییە کەوای لێدەکات وابلێ، بەڵکو ئەوەیە کە بەقەناعەتەوە وا بلێ. ئەی، کاری ئەم تاکە چیـەو لەراسـتیدا خـۆی بـۆ چـی تـەرخان کردوە؟ تەنها توندو تیژی نییە؟ هەر وەکو ئاننـە ئـەرێندت Hannah Arendt دەڵـێ توندو تیژی ئەنجامی راستەقینەو سروشتیی ئۆپۆزیسیۆنی تاکێکە دژی هەموو، "هـی یەکێك دژی هەموو"[١١٩]. ئەمەیە ئەنجامی فەلسەفەی نایلیست کەسـەدام حوسـەین هەوڵی دا دێرِ بەدێرِ جێ بەجێی بکات.

## تـاك و نەتەوەو ئۆپۆزیسیۆنی "برادەر-دوژمن"

لەروانگەی ناسیۆنالیزمی بەعسیەوە ، شوێنی تاك لەسەر بناغەی کەڵکی بـۆ کـۆی نەتەوایەتی دەپێورێ. لەو کاتەی کە سنوورە دادوەریـەکان لـەنێوان دەوڵـەتو نەتـەوە دادەمرکێنـێو بەشـێوەیەکی تـەواو یەکـەمیان ملکـەچ پـێ دەکـات بـۆ دوهـەم، ناسیۆنالیزمی بەعسی نایەوێ دۆخی تاك لەسەر بنچینەیەکی ئـەو پێناسـە دادوەریـە وێنا بکات کەسنوور بۆ ئەرکو مافی هاوبەش (متبـادل) دادەنـێ. بـەم شـێوەیە تـاك ملکەچ پێ دەکات بۆ حوکمێکی ئێتیکی کەنەتەوە پێی دەبەخشێ. ئەمە چ ئەنجامێکی

لۆژیکی هەیە؟ ئەو پەیوەندیە بابەتیو گەردونیانەی کەماف لەنێوان کیانە فەردیو کۆییەکاندا دایدەنێ دەگۆڕێنو دەبن بەپەیوەندیەکی شەخسی لەگەڵ نەتەوە. ڕادەی بەوەفاییو دڵسۆزیو خۆبەستنەوەی چالاك بەنەتەوەوە، دەبێ بەتەنها پێوانە بۆ کەڵکی مرۆڤو هاوولاتی. بەم شێوەیە، پەیوەندی سیاسی تاك بەکیانی ئیتیکی کەبریتییە لەنەتەوە، جێی ئەو پەیوەندیانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ دەبەستنەوە بەو ئۆرگانیزمەی دادوەریەی کە دەوڵەتە. بەڵام ، هەروەکو ڕوون کرایەوە، ئەگەر نەتەوە بەسەرۆکەوە بلکێنرێ، واتا ئەگەر نەتەوە لەڕێگەی سەرۆکەوە پێناسە بکرێ، ئەم پەیوەندیانە دەگۆڕێنو دەبن بەبنچینەی ملکەچی بێ مەرج بۆ ویستی ڕەهای سەرۆك. دەبێ بیری خوێنەری بخەینەوە کەکاتیك نەتەوە دەکات بە "بیرێکی" پیرۆز یان کیانێکی ڕەهاو خودایی، ناسیۆنالیزمی بەعسی پێشینەیی دەدات بەو پەیوەندیەی کەتاك دەبەستێتەوە بەنەتەوە.

ئەم پەیوەندیە پێکهاتوە لەچی؟ دەبێ دووبارەی بکەینەوە کە ئەم پەیوەندیە لەقەوارەیەکی عاتیفی پێکهاتوە کەباوەش بەسەرانسەری بوونی تاکەکەسیدا دەکات: ناسیۆنالیزم. هەروەکو ناسیۆنالیزم گوزارشتی ڕاستەقینەی نەتەوەی خوداییە، ئەویش هەر خوداییە، واتا چ نەتەوەو چ گوزارشت لێی، هەردوکیان پیرۆزو خودایین. ناسیۆنالیزم پیرۆزە[١٢٠] چونکە بەرهەمی نەتەوەی پیرۆزە. لەبەر ئەوە ناسیۆنالیزم تەنها ئامرازە مرۆڤ بەرەو ڕێگەی بەرپرسێتیو قوربانی دانو ئەکتیڤیزم ئاراستە دەکات.

لەم تێڕوانینەوە، ئایدیۆلۆژیای بەعسی یاسای مۆراڵی خۆی دەخاتە سەر ڕوو و مرۆڤ دەکات بەداردەستێك بۆ خزمەتی ئامانجێك کەنەتەوەیە. هەموو دەرکەوتەکانی ژیانی تاکە کەسیی، ووزە بۆ بەدیهێنانی شەخسی، هەموو هەڵسوکەوتی ڕۆژانەو هەموو کردەوە عەفەویەکان دەبێ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بەشێوەیەکی هوشیار یان ناهوشیار، بەرەو یەك ئامانج ئاراستە بکرێن: نەتەوەی نەمر.

بەزمانی بەعسەوە میشێل عەفلەق دەڵێ: "ئێمە بەرهەمی نەتەوەکەمانین(. . .) دەبێ هەمیشە باوەڕمان بەوە هەبێت کەکردەوەو بیرکرنەوەو توانامان بۆ جێبەجێ کردنی

شتێك لەناو خۆمانداو لەناو کۆمەڵ، هیچ شتێك نییە تەنانــەت دەنگدانەوەیــەکی بــێ ڕەنــگو ڕاســتیەکی کــەموکورت نــەبێ ئەگــەر بــەراورد بکــرێ بەراســــتی نەتـــەوە هەمیشەییەکەمان"(١٢١).

شارل موراس Charles Maurras ، ناسیۆنالیستو تیۆری ناسی حکومـــەتی ڤیشــی فەرەسی سەر بەئەڵمانیای هیتلەریو ڕەگــەز پەرســت، وەك عــەقلــەق دەیگــوت ئــەوەی کەبوونی هەیەو ئەوەی کەدەیبینینو ئــەوەی کــەخۆشمان دەوێ لەلایــەن نەتــەوەوە دابــین کراوە(١٢٢). یاخود ناسیۆنالیستێکی هوشیار بەرامبەر ڕۆڵیَ خۆی، ئەو یاسا مێتۆدانــە پەسەند دەکات کەدەڵێن هاووڵاتیەکی باش، بەرژەوەندی خۆیو سیستێمەکەی بۆ چاکی نیشتیمانەکەی ملکەچ پێدەکات(١٢٣).

بۆ بەعس نەتەوە ڕاستیو ڕۆحو مادەی تاکە. تاك ڕەنگدانەوەی نەتەوەیــەو نــابێت بــە بەشێك لەو ئەگەر بە بەبێ مەرج ملکەچی بۆ نەکات. بەهای مرۆڤ بەشێوەیەکی توندو مــەحکوم بەفەزیلـــەی نەتـــەوەوە بەســـراوەتەوە. لەبـــەر ئـــەوە دەبـــێ، بەهـــەموو لەخۆبوردنێکەوە، ڕەفتاری خۆی لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوە بگونجێنێ.

ئەگەر چاوێك بخشێنین بە ســەر ئــەو بــیرەی هــێردەر Herder ســەبارەت بەچــەمکی "ئۆرگانیزمی ژیاو" کە لەلایەن هیتلەرو ڕۆزێنبیگەوە ڕۆمانتیزە کراوە(١٢٤)، تێبینـــی دەکەین کە ئایدیۆلۆژیای بەعسی، ئەویش، ئەم چەمکە دەسیاسەتێنێ، واتا بۆ ئامانجی سیاسی بەکاری دێنێ.

بەعس جەخت دەخاتە سەر ئەوەی کە نەتەوە "ئۆرگانیزمێکی ژیاوە کەئەندامــەکانی بەسراونەتەوە بەیەکەوەو هەموو شیکاریەکی جەستەییو جیاکردنـــەوەی ئەندامــەکانی دەبێتــە هـــۆی مردنـــی"(١٢٥). ئــەو پەیوەندیــەی کــەمرۆڤ دەبەســتێ بەنەتــەوە پەیوەندیــەکی "ئۆرگانیکــە"(١٢٦). تــاك هیــچ واتایــەکی ( بەهایــەکی) نییــە ئەگــەر سەربەخۆ بێت لەنەتەوەو ناتوانێ بگاتە پڕیی ئامانجی خۆی بەبێ ئەوەی ئەندام نــەبێت. ئەگەر تاك بێ هەست بێ بەرامبەر ڕەگی نەتەوایــەتی، ژیــانێکی بــێ بەهــەرم دەباتــە سەر"(١٢٧).

کاتێك بوونی سەربەخۆیی تاك ئینکار دەکات، ئایدیۆلۆژیـای بەعسی دان بـەبونی تاکدا نانیّو مافە سروشتیەکانی دادەمرکێنێ، واتا کـەتاك ملکـەچ پـێ دەکـات بـۆ ئیمپێرەتیڤەکانی نەتەوەی نەمر (الامة الخالدة)، ئەرکی تـاكو مـافی نەتـەوە دەخاتـە چوار چێوەی جیهانێکی تایبەتی . چونکە چۆن هێزی قورسایی نەتەوە خوداییە، هەموو کردەوەکانی دەرکەوتەی قـەوارەی خودایـی گەورەییـەتی. بـەم شـێوەیە مـافی نەتـەوە بەسەروی مافی تاکەوەیەو یاسا بڵندەکەی پێـش هـەموو بەرژەوندیـەکی تایبەتیـە. " دەبێ نەتەوە نمونەییەکەمان بخەینە پێش هەموو شتێكو سەرووی هەموو کەسـێکەوە". بەڵام لە هەمان کاتدا " دەبێ حیزبەکەمان کەوێنەی نەتـەوە نمونەییەکەمانـە بخەینـە سەرووی کەسو سەرکردەکانی"[١٢٨]. بەهای تاکەکان ئەژمار دەکرێ "بەقەدەر ئەوانەی نوێنەرایـەتی ئـەم بـیرە دەکـەنو بەقـەدەر ئەوانـەی دەبـن بەوێنەیـەکی نزیـك بـەو و گوزارشـتێکی حـەقیقیو گونجـاو لەگـەڵیدا، واتـا بەقـەدەر ئـەوەی کەملکـەچی بـۆ دەکەن"[١٢٩].

گومانی تێدا نییە کەکاتێك بەعس ئۆتۆتومی تاك بەرپـەرچ دەداتو وەك ئـامرازێك بەکاری دێنێ بۆگەیشتنە ئامانجێکی مۆراڵی، هیـچ دوو دڵـی پیشـان نـادات کەبـەم شێوەیە هەمان هێڵی لۆژیکی ناسیۆنال سۆسیالیزمو فاشیزم تەواو دەکاتو بەردەوامی پێ دەدات.

دەبێ لەبیر نەچێتـەوە کەکاکڵـەی تـێڕوانینی نـازی وفاشیسـتیش لـەم جیهانبینیـە پێکهاتوەو پێکهاتە ئایدیۆلۆژیەکانی تاكو کـۆی نەتەوایـەتی بەیەکـەوە دەبەسـتێتو یەکەم ملکەچ پێ دەکات بۆ دووەم.

با لەنزیکترەوە ئەم جوێندنەوەیە تاقی بکەینەوە. بـەلای هیتلەریشـەوە "تـاك بوونـی نییە ئەگەر لە نـاو کۆمەڵگـەی ڕەگـەزیی خۆیـدا نـەبێ"[١٣٠]. هـەر وەکـو بـەعس، ناسیۆنال سۆسیالیزم پەیامێکی بێ هاوتا بەنەتەوە دەسپێرێو سەربەخۆیی بوونی تـاك پێشێل دەکاتو ملکەچی پێ دەکات بۆ ویستی نەتەوە. نەتەوە دەکات بەتەنـها واقعـی کۆمەڵایەتی کەتاك دەبێ پەنای بۆ بەرێ. بـەلای ناسـیۆنال سۆسیالیزمیشـەوە نەتـەوە

"واقعێکی گەورەیە"(١٣١) کەگوزارشت لەپەیوەندیەکی ناوخۆیی لەنێوان تاك‌و نەتـەوە دەکات، پەیوەندیەکی ئامرازو ئامانج: تاك وەك داردەست لەخزمەتی نەتەوەی ئـەڵمان‌و وەکو هیتلەر دەڵێ " بەواتای مەزنیی ووشە".

ئـەم شـێوە لۆژیکـە هاوبەشـە لـەنێوان سـەرجەم بزوتنـەوە ناسیۆنالیسـتە تۆتالیتاریاکانەوە. فاشیزمی ئیتـالیش بەهـەمان شـێوە کەراکتـەری پـیرۆز بەنەتـەوە دەبەخشێ‌و "مافی گشتی‌و تایبەتی دەخاتە ژێر ڕەحمەتی زلهـێزیی دەولـەت- نەتـەوەو دەسەلاتدارەکانی. هەر وەکو ئەلفریدۆ ڕۆککۆ Alfredo Rocco ، وەزیری دادو ڕۆشنبیرو تیۆری ناسی فاشیزم دەڵێ "بۆ فاشیزم، کۆمەڵ پێکهاتوە لەوەی کەتاك وەك ئـامرازێك بۆ ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی بەکاربهێنێ "(١٣٢).

سەرنج ڕاکێشەرە کە بەرێککەوتنێکی تەواو لەگەڵ تێڕوانینی ناسیۆنال سۆسیالیزم‌و فاشیزم، ئەم فۆرمولـە بەعسـیەی کەدەیـەوێ تـاك ژیـانی بـۆ نەتـەوەی "خودایـی"و "نەمر"، دواییش بۆ حیزب‌و سەرۆك تەرخان بکات، لەسەر ئاستی لۆژیکـی‌و ئـەدەبی سیاسـی بەعسـی دەمانباتـە چـەند ئاڕاسـتەیەکی دیکـە. ئـەم فۆرمولەیـە تەنـــها ناوەستێتەوە لەسەر ئەوەی کەتاك لەدۆخێکی ئاسایی بمێنێتەوە، واتا کەژیانی ڕۆژانـەی وەك هاوولاتی بەرێتە سەر، بەڵکو داوای لـێ دەکات کەهاوبەشیەکی چالاکانە لەژیانی نەتەوەدا بکات.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ کەبەعس ملکەچی چالاکانەی دەوێت‌و ئیتاعەی پەسیف ( ناچالاك) ڕەتدەکاتەوە چونکە ئەمەی دوایی تەنـها تەسـلیم بوونێـك‌و وازهێنـانێك‌و خیانەتێکە لەو پرینسیپە بەعسیانەی کـە لەسـەر بەرپرسـێتی‌و خـۆ بـەخت کـردن‌و خەبات‌و شەڕو پاڵەوانیەتی وەستاون. فۆرمولەی بەعسی دەیەوێ تـاك بەتـەواوی خـۆی تەرخان بکـات بـۆ چـالاکی ڕۆژانـەی ژیـانی نەتـەوە. هـەر وەك سـەرجەم چوارچێـوە ناسیۆنالیستە تۆتالیتاریەکان، دەیەوێ تاك ببێ بەنەتەوەو بەلاّم ناتوانێ ببێ بەنەتـەوە ئەگەر بەشێوەیەکی ئەکتیڤ هاوبەشی لەبەرزکرنەوەو ڕێزگرتنی خودایی نەکات. بـەم شێوەیەو تەنها بەم شێوەیە مرۆڤی عەرەب‌و ئەوەی لەولاّتی عەرەبدا دەژی سەربەسـت‌و

ئازادە، چونکە ئازاد نییە گەر هاوبەشی نەکات لەئازادی نەتــەوە. ئـازادی کەسـایەتی دەبێ بەواقعێكو بەڕاستیەك تەنها لــەو کاتــەی کــەتاك هوشـیاری نەتەوایـەتی خـۆی دەبەسـتێتەوە بەپێویسـتیی ئیدێیـالی نەتەوایـەتی. "لەیـەکێك بترســن کەهەسـتی ناسیۆنالیستی تیادا خەبەری نەبوبێتەوە(. . .) ئەم کەسە چ پیاوێکە؟ بۆ چ مێژوویـەك دەگەڕێتەوە؟"(١٣٣) . ئەم گوزارشتە ڕۆمانتیکیە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کـەتاك دەبـێ ئازاد بێ، بەڵام تەنها بەیەك مەرج: کە لەناو ئەو نەتەوە نەمرە بتوێتەوە کەبەعس خۆی چوارچێـوەی بـۆ دانـاوە. ئینتمـای چـالاك بـۆ نەتـەوە پاسـاو دەکـرێ لـەناو قــەوارە ئێتیکیەکەی چونکە نەتەوە واقیعو ڕاسیەکی مۆرالیە. تاك هیچ نییە تەنــها ئـەنجامی هێڵـە سـنووردانەرەکانی نەتــەوە نــەبێت، لەنەتــەوەوە کاریگـەریی کــردەوەی خــۆی وەردەگرێت، هەمووبایەغ پێدانێك لەناوچوار چێوەی ئەم بونەوەرە مۆرالیەدا دەپارێزرێ.

چۆن تاکێك دەتوانێ بیێ بە "پیاو"؟( بە واتــا ئەنترۆپۆلۆژیەکـەی). چـۆن دەتوانـێ بگەڕێتەوە بۆ مێژوو؟( مێژووی عەرەبی ). دەبێ هەڵسوڕێنەرو پاڵ پێوەنــەری مێــژوو( مێژووی عەرەبی) بێت. "لە قۆناغی لاوازیو دواکەوتن بەرپرسێتی تاك زیاتر دەبێــت" و هەموو جووڵانەوەیەك دەتوانێ زیان بەنەتەوەی خۆی بگەیێنێ!(١٣٤). " گرنگیــدان بە ژیانو بەرژەوەندی تایبەتی خۆ، نەك تەنــها پشـتگوێ خسـتنی خزمــەتی گشـتیە، بەڵکو لەزۆر کاتدا دژی دەوەستێتەوە.( بەم شێوەیە) تاك نابێ بەشانەی (خلیە) لەشـی نەتەوە، چونکە لەسەر حیسابی ئەو خۆی دەژێنێ، بــەڵکو دەبـێ بـەدژی ئـەم لەشـەو لەئەنجامی لاوازیی ئەو بەهێز دەبێو لەسەر حیسابی برسیەتی ئەو قەڵەو دەبێ "(١٣٥) .

شایستەی ئاماژەیە، کەلەم گۆشەیەوە، نەناسیۆنال سۆسـیالیزمو نەفاشـیزمیش بـەم شێوە ڕاستەوخۆیانە نەیانتوانیوە جەنگ دژی ئەوانە ڕابگەیێنن کــەخۆیان لـەکاروباری "نەتەوەی سیاسی" گێل دەکەن. بەڵام ئایدیۆلۆژیای بەعسی لەم سنوورەدا ناوەستێتەوە. بۆ ئەوەی پاساوی ئەو دایکۆتۆمیە* dichotomy بکات لەنێوان "برادەرو دوژمــن"،

---

* واتا دابەشبوون یاخود دژار دژی نێوان دوو ئێلیمێنت یان دوو بیر.

پێش هەمووشتێك كۆمەڵی ناسیۆنال دابەش دەكات بەسەر دوو كەتێگۆری لەهاووڵاتی، واتا دەیكات بەدوو كەرتەوە: "كاتێك كەجیاوازیەكان دەردەكەون لەنێوان جۆری راست لەهاووڵاتیان، واتا ئەو جۆرەی كەخۆی رزگار كردوە لەبەرژەوەندیو ئارەزوەكانی خۆیو ئەو جۆرەی كە بەرژەوەندیەكان كۆیلانوێتی( كە كردویەتی بە كۆیلە)(. . .)، تەنها ئەم دابەشبوونە، تەنها ئەم روونكردنەوەیە لەسەر ئەم دوو جۆرە، نەتەوە لەو ئالۆزیەی كەتێدا دەژی رزگار دەكات "[١٣٦].

كاتێك كۆمەڵی ناسیۆنال دەكات بەدووكەرتەوە: "هاووڵاتی تەواو" و " هاووڵاتی نا تەواو"[١٣٧]، بەعس لەبیری دەچێتەوە كەدیسانەوە لۆژیكی ئێلیتیستی فاشیزمی مێژوویی بەكار دێنێتەوەو هەوڵ دەدات ئەو جیهانبینیە بخاتە كارو لەگەڵ واقیعی كۆمەڵگەی عەرەب بگونجێنێ. پێویستە بوترێ كە عەقیدەی فاشیزم كەتێكەڵیەكە لەسان سیمۆنیزم Saint-Simonism و پەرێتیزم Paretism ، دەیویست ئاراستەی بەرپرسێتی رێكخراوی كۆمەڵایەتی بدات بە زاناكان. " دەوڵەتی كۆرپۆرەتیڤ corporative كە لەلایەن زاناكانەوە دەبوایە بەرێوە ببرایە " سەقامگیری بۆ رژێمێكی ئۆتۆكراسی مسۆگەر دەكرد كە لەرێگەی بەكار هێنانی هێزو توندو تیژی، ملكەچی هاووڵاتیانی "هەمیشەیی دەكر" بۆ ویستی رەهای حیزب. كاتێك كۆمەڵی لەنێوان دوو توێژ دابەش دەكرد، كەمینەیەك كە لەلایەن ترادیسۆنو هەوەسی سەرۆكەوە تەزكیە دەكراو زۆرینەیەك كە بەكوتلەیەكی بێ توانا لەتێگەیشتنی بەرژەوەندیە راستەقینەكانی نەتەوە دادەنرا، فاشیزم، ئەویش، هاووڵاتی " بەگوێرەی ترادیسیۆنی كۆنی ئەریستۆتالیسی دایكۆتۆمیزە" دەكرد: هاووڵاتی" ئەكتیڤ (چالاك)"و هاووڵاتی"ناچالاك (خامل)"[١٣٨]. ئەم تێروانینە "دایكۆتۆمیزەكەرە" تەنها وای نەدەكرد كە "مافی گشتیو تایبەتی هاووڵاتیان لەژێر رەحمەتی زلهێزی" پارتی فاشیست بونایە، بەڵكو وێنەی هەندەسەی دایكۆتۆمیكی "برادەر- دوژمن" ی كۆمەڵی ئیتالیشی دادەرشت. گومانی تێدا نییە ناسیۆنال سۆسیالیزمیش لەرێگەی هەمان دابەشكردنی دووفاقەییەوە بەراستو بەچەپ گشت ئەوانەی دوژمنی

"سروشتی" و ئایدیۆلۆژی خـۆی لـەناو دەبـرد. "بـەو شـێوەیە ڕووی دەدا کـەدەتگوت پێویستی بەدوژمنێك هەیە بۆ وروژاندنی ویستو سەرکردایەتی کردن" بە ئاڕاسـتەی ئامانجی مەزن[١٣٩]. هیتلـەر وای بـیر دەکـردەوە کـە بـۆ ئـەوەی ئـەم ئامانجـە مەزنـە بەدیبهێنێ، دەبوایە ئازادیو سەربەستی لەهاووڵاتیان وەربگرێتەوە. ڕایخی ناسیۆنال کـە دەیزانی چۆن "دانبنێ بە بەرژەوەندییەکانی هاووڵاتیانو بیانپارێزێ"، دەیتوانی ( وەکو هیتلەر دەڵێ) "ڕێگە بەخۆی بدات ئازادی خەڵکی بەشێوەیەکی فراوان پێشێل بکـات " چونکە شتێکی سروشتی بوو کەئەم کاروبارانە لەپێناوی مـەزنیی نەتـەوە ئـەنجامی پێویستی بوون "[١٤٠]. بەڵام بەعس کەکۆمەڵ دەکات بەدوو بەشەوە، بـە دوو گروپـی جیاوازەوە لەسنووری کلاسیکی چوارچێـوەی ناسـیۆنال سۆسـیالیزمو فاشـیزم دەچێتـە دەرەوە. تیۆری عەفلەق سەبارەت بەکۆمەڵی دووفاقەیی بەجێـهێنانی پراکتیکـی خـۆی لـەعیراقی بەعسـیدا خـۆی دەبینێتـەوە. سـەدام حوسـەین تەنـها نەیدەویسـت کـە دوژمنەکانی خۆی تەنها لـەنێو ئەوانـەدا هـەڵبژێرێ کەهەڵسـوکەوتیان دژی شۆڕشـە گشیتەکەی (تەواوەکەی) بەعسە، بەڵکو لەنێو ئەوانەشدا کە "نیەتێکیان" هەیـە: " شۆڕش دوژمنەکانی هەڵدەبژێرێو ئێمە دەڵێین دوژمنەکانی هەڵدەبژێرێ چونکە هەندێ دوژمـن هـەڵبژێردراون لەلایـەن (شوڕشـەوە) لـەڕیزی ئەوانـــەی کـــەکردەوەیان دژی پرۆگرامەکەیەتیو هەوڵ دەدەن زیانی پێ بگەینن. شـۆڕش دوژمنـەکانی هـەڵدەبژێرێ لەنێو ئەوانەی کەنیەتیان لادانە لەپرینسیپە بنەڕەتیو ڕەسەنە ڕاستەقینەکانی. ئـەوەی پەیوەندی بەوانەوە هەبێت کە شۆڕش دەپارێزن، (شـۆرش) هـەڵیاندەبژێرێ بـۆ ئـەوەی بیانکات بەبرادەری خۆی"[١٤١].

# پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

1- Benedetto Croce, in, Renzo de Felice, Le interpretazioni del fascismo, Editori Laterza, Bari, 1983, p. 29.
2- Jean Pierre Viennot, op. cit., p. 13.
3- Wafik Raouf, Nouveau regard sur le nationalisme arabe, Bath et Nasserisme, L'Harmatan, 1984, p. 15.
4-Louis Cavarre, La notion d'Etat dans le regime hitlerien, Travaux juridiques et economiques De l'universite de Rennes,Tome xiv, Rennes, 1935, p. 36.
5-Ibid. p. 33.

٦- میشیل عفلق، فی سبیل البعث، ل، ٥٥.
٧- هـ.، س.، ل، ٥٥.
٨- ل، ٥٥.
٩- ل، ٥٥.
١٠- ل، ٥٦.
١١- ل، ٥٦.
١٢- ل، ٨١.

13- Adolf Hitler, Mein Kampf, Nouvelles editions latines, Paris, p. 402, p. 403.
14-Ibid. p. 224.

١٥- میشیل عفلق، هـ.، س.، ل، ٦١.
١٦- ل، ٦١
١٧- ل، ٩٧.
١٨- ل، ٩٨.
١٩- ل، ٩٨.

٢٠- ل، ٩٩.

٢١- ل، ٨٣.

٢٢- ل، ١٠٠.

٢٣ - ل، ١٠٠.

٢٤- ل، ١٠١. بڕوانە هەروەها، ل، ١٠٢.

٢٥- ل، ١٠٣.

٢٦- ل، ١٠٢.

27- Adolf Hitler, Ibid., p.285.
28- Ibid., 286.
29- Ibid., 295.

٣٠- بڕوانە ئۆکسیمۆرۆنی بەعسی لە بەشی دوەم.

31- Kamel S. Abu Jaber, The Arab Bath Socialist Party, History and Organization, Syrcuse Universiry Press, 1966, p. 15.

٣٢-میشیل عفلق، فی سبیل البعث، ل، ١٠٣.

٣٣- میشیل عفلق، ل، ١٠٣-١٠٤.

34- Adolf Hitler, op. cit., p. 291.

٣٥- میشیل عفلق، ل، ٦١.

٣٦- هـ.، س.، ل، ٥٦.

٣٧- هـ.، س.، ل، ٥٥-٥٦.

٣٨- مادەی سێ لە دەستوری حیزبی بەعس.

٣٩- میشیل عفلق، ل، ٥٥.

40- Adolf Hitler, op.cit., p. 289.
41- Edmond Vermeil, Doctrinaires de la revolution allemande ( 1918-1938), Fernand Sarlot, Paris, 1939, p. 237.
42- Adolf Hitler, Ibid., p. 289.
43- Ibid., p. 289.
44- Ibid. p. 397.
45-Ibid., p. 396.

٤٦- میشیل عفلق، ل، ٤١.

٤٧- ل، ٤١.

٤٨- ل، ٤١.

49- Gustave Le Bon, Psychologie des foules, puf, Paris, 1963, p. 17.
50- Ibid. p. 17.
51- William Montgomery MacGovern, From Luther to Hitler, The Histoty of Fascist-Nazi Political Philosophy, Cambridge, Massachusett, 1941, p. 427.
52- Michel Aflak, in, Jean-Pierre Viennot, op. cit., p. 162.

٥٣- میشیل عفلق، فی سبیل البعث، ل، ٨١.

٥٤- میشیل عفلق، ل، ٨١-

٥٥- میشیل عفلق، ل، ٨١.

56-Adolf Hitler, op cit., p. 394.
57- Ibid. p. 395.
58- Ibid. p. 390.

٥٩- میشیل عفلق، ل،٩٠.

٦٠-میشیل عفلق، ل، ٩٠.

٦١- میشیل عفلق، ل، ٩١.

٦٢- میشیل عفلق، ل، ٩١.

٦٣- بڕوانە، میشیل عفلق، ل، ٥٦.

64- Gustave Le Bon, op. cit., p. 56.

٦٥- الوقائع، ٢٠،العدد ٣٧، ایلول ١٩٧٧، ل،٢٠٨.

66- Hanna Batatu, op.cit., p. 734.

٦٧- بڕوانە:

Emanuel Kant, Fondements de la metaphysique des moeurs, Ed. Delagrave, Paris, 1982, pp. 111-179.
68- Hanna Batatu, op. cit., n. 48, p. 735.
69- Jean Jacques Chevalier, Les grandes oeuvres politiaues, de Macchiavel a nos jours, Librairie Armand Colin, Pqris, 1966, 360.
70- Adolf Hitler, Mein Kampf, op. cit., p. 442.
71- Ibid., p. 445.
72- Ibid., p. 506.
73- Benito Mussolini, Fascismo, in, Enciclopedia italiana di scienze e arti, edizioni istituto G. Treccani, vol. Xiv, 1966, p. 849.
74- Adolf Hitler, op. cit., pp. 397-398.

٧٥- سەدام حسێن لەناو :

Samir al-Khalil, op. cit., p. 189

76- Adolf Hotler,Ibid., p. 398.
77- Jean- Jacques Chevalier, op. cit., p. 53.
78- Thomas Hobbes, Le Leviatan, traite de la matiere, de la forme et du pouvoir de la republique ecclesiastique et civile, Ed. Sirey, 1971, pp. 5-6.
79- Ibid. p. 124.
80- Ibid p. 126.
81- Ibid p. 129.
82- Ibid. pp. 177-178.
83- Ibid. p. 174.

٨٤- بۆ ئەم مەبەستە، بڕوانە:

Jules Monnerot, Sociologie de la revolution, Mythologies politiques du Xxe siecle, Marxistes- Leninistes et Fascistes, La nouvelle strategie revolutionnaire, 1969, pp. 532-547, pp. 498-499.
85- Samir al-Khalil, op. cit., p. 115.

٨٦- سەدام حسێن لەناو :

Ibid., p. 192.
87- Michel Aflak, in, Ibid., p. 252.
88- Ibid., p. 252-253.
89- Thomas Hobbes, op. cit., p. 175.
90- Ibid. p.175.
91- Ibid. p. 184.

٩٢- میشیل عفلق، فی سبیل البعث، ل، ١٥٦.

93- Edmond Vermeil, op. cit., p. 256.

٩٤- لە روانگەی بەعسەوە، نەتەوە نەك دەوڵەت.

95- Benito Musolini, Fascismo, op. cit., p. 848.
96- Ibid., p. 849.
97- Ibid., p. 848.
98- Marcel Prelot et Jean Boulois, Institutions politiques et droit constitutionnel, Dalloz, Paris, p. 638.
99- Thomas Hobbes, op. cit., p. 362.
100- Ibid., p. 184.
101- Jean-Jaques Chevalier, op. cit., p. 21.
102- Nicolo Macchiavel, Le prince( De principatus), Librairie generale francaise, 1962, ch. Vi, pp. 46-47.

١٠٣- میشیل عفلق، فی سبیل البعپ، ل، ٦٤.

104- Samir al-Khalil, op. cit., p. 267.

105- Nicolo Macchiavel, op. cit., p. 66.

106- Ibid., p. 117.

107- Ibid., p. 118.

١٠٨- ئاماژە بە تیۆرانینی کارل مانهایم سەبارەت بە پێناسە کردنی ئایدیۆلۆژیا. بە لای مانهایمەوە ئایدیۆلۆژیا بریتیە لە کۆمەڵێك بیرو بۆچوون کە دەیانەوێ تەجاوزی دۆخی حازر بکەن، بەڵام لەراستیدا هەرگیز ناتوانن ناوەرۆکەکانیان بە دی بێنن، واتا یوتۆپین. بڕوانە:

Karl Mannheim, Ideologie et utopie, Librairie Riviere et Cie, Paris, 1956,

109- Jaseph Peter Stern, Hitler, le Fuhrer et le peuple, Flammarion, Paris, 1985, p. 92.

110- Edmond Vermeil, Hitler et le christanisme, Gallimard, Paris, 1939, p. 82.

111- Samir al-Khalil, op. cit., pp. 155-156.

112- Q.H. Ottinger, Culte de la personnalite et parti en Irak,in, Swiss Review of World Affaires, juin 1984, p.12.

ئەم نوسەرە دەڵێ کە لە کاتژمێرێك لە پەخشی سیاسی رادیۆ، ناوی سەدام لە نێوان ٣٠ بۆ ٤٠ جار دوبارە دەکرایەوە.

113- Samir al-Khalil, op. cit., p. 156.

114- Ibid., p. 157.

115- Charles Saint-Prot, Saddan Hussein, un “gaullisme” arabe, Ed. Albin Michel, Paris, 1987, p. 43.

116- Louis Cavare, La notion d’Etat dans le regime hitlerien, travaux juridiques et economeques de l’Universite de Rennes, Tome xiv, Rennes, 1935, p. 34.

117- Charles Saint-Prot, op. cit., p. 16.

١١٨- فرانسوا بایل بە شێوەیەکی رێك و پێك کۆمەڵێك لە ووتارەکانی هیتلەری کۆکردۆتەوە کە خۆی دەپیرۆزێنێ. بڕوانە:

Francois Bayle, Psychologie et ethique du national socialisme, etudes anthropologiques des dirigeants SS, Puf, Paris, 1952,pp. 380-392.

119- Hannah Arendt, Du mensonge a la violence, Essai de politique contemporaine, Calman-Levy, 1972,p. 142.

١٢٠- میشیل عفلق، فی سبیل البعث، ل، ١١١.

١٢١- میشیل عفلق، ل، ٣٦.

122- Raoul Girardet, Le nationalisme francais( Onthologie 1871-1914), Ed. Du Seuil, 1983, p. 198.
123- Ibid., p. 201.

١٢٤- هیتلەر دەیویست ئەم "میکانیزمە بێ رۆحە" کە دەوڵەتە، بکات بە "ئۆرگانیزمێکی ژیار" کە زامنی تواندنەوەی تاکی دەکرد مە ناو نەتەوەدا. بەم شێوەیە نەتەوەی دەکرد بە "یەك کیانی خوڵقێنەر" یان بە "کەسایەتی کۆیی" یاە بە "بلیمەتی کۆیی". هەروەها بە لای رۆزێنبێرگەوە، میللەت بریتی بوو لە ئۆرگانیومێکی ژیاو کە لە رێگەیەوە خوێنی تاکەکان لە ناو لەشیاندا دەسوڕایەوە. بڕوانە:

Alfred Rosenberg, Le myth du vigntieme siecle, Doctrinaire de la revolution allemande(1918-1938), op. cit., p. 250.

بڕوانە هەروەها:

Adolf Hitler, Mein Kampf, op. cit., p. 396.

١٢٥- میشیل عفلق، فی سبیل البعث، ل، ١٣١.

بڕوانە هەروەها:

Hanna Batatu, op. cit., p. 732.
126- Ibid. p. 732.
127- Ibid. p. 732.

١٢٨- میشیل عفلق، هـ.، س.، ل، ٣٦.

١٢٩- میشیل عفلق، هـ.، س.، ل، ٣٦.

130- Edmond Vermeil, Hitler et le christianisme, op. cit., p. 72.
131- Edmond Ver;eil, Doctrinnaires de la revolution allemande, op. cit., p. 336.
132- Alfredo Rocco, La dottrina del fascismo e il suo posto nella storia, Roma, 1925, p. 115.

١٣٣- میشیل عفلق، فی سببل البعث، ل، ١١٥.

١٣٤- هـ.، س.، ل، ١٥٠.

١٣٥- هـ، س.، ل، ١٥٠.

١٣٦- هـ، س.، ل، ٦٤.

١٣٧- ئەریستۆتالیس دەڵێ کە " هاووڵاتی ناتەواو" ئەو تاکەیە کە پێناسە ناکرێ وەك هـــاووڵاتی کە ئەرکی بریتیە لە جێ بە جێ کردنی وەزیفەی گشتی. بڕوانە:

Aristote, La Politique, Librairie philosophique J. Vrin, Paris, 1989, p. 171(iii,2), p. 189(iii,5).

138- Francesco Luigi Ferrari, Il regime fascista italiano, Edizioni di storia e letteratura, Roma, 1983, p. 94.

139- J. T. Delos, La nation, le nationalisme et l'ordre de droite, Editions de l'arbre, vol.ii, Montreale, 1944, p. 112.

140- Adolf Hitler, op. cit., p. 568.

141- Samir al-Khalil, op cit., p. 49.

# بەشی پێنجەم
# بیروڕای عەفلەق و نەسیۆنالیزمی ئەوروپی و سەردەمی فاشیست

## بیروڕای عەفلەق و سەردەمی فاشیست:

کاتێك حەننا بەتاتو باس لەئەسلی بیری ناسیۆنالیستی دامەزرێنەری حیزبی بەعس دەکات، ئاماژە بەوە دەدات کە لەسەردەمی ژیانیدا لەپاریس، میشێل عەفلەق بەبایەخ و پەرۆشەوە مارکس و نیتچەو ئەندرێ جیدو دۆستۆیێفسکی و تۆلستۆی و رۆلاند رۆمان و بێرگسن و ئەنەتۆل فرانسی خوێندبوەوە[1]. لەشوێنێکی دیکەدا بەتاتو جەخت دەخاتە سەر ئەوەی کە کاتێك دەویسترێ بیرۆکەی میشێل عەفلەق شیبکرێتەوە، بەرەنگاری چەند گرفتێکی لۆژیکی دەبینەوە کەسەرچاوە دەگرن لەئێکلێکتیزمێکی eclectism(* بێ پەیڕەو.

لەڕوانگەی بەتاتوەوە، بیرۆکەی عەفلەق لەتێکەڵیی ئەم چوارچێوە ئایدیۆلۆژیانەی خوارەوە پێکهاتوە: ناسیۆنالیزمی مرۆیی، هەندێ لایەنی تاکگەریی ( فەردانیەتی) تەنویریەکان، دیموکراتیزمی یەعقوبیەکان، ئیدیالیزە کردنی گەنج لەڕوانگەی مەتزینیەوە، مارکسیزم، ئێلیتیزمی لینین لەگەڵ بەشێکی زۆر لەڕۆحیانەتی دیانیی و تەماشایەکی ناسیۆنالیستانە بۆ ئیسلام[2].

زۆر لەنوسەران کاتێك بیرۆکەی عەفلەق و بەعس شیدەکەنەوە ڕەنگە نەیانەوێ وەڵامی پرسیارێکی زۆر گرنگ بدەنەوە: میشیل عەفلەق بۆ ماوەی چوار ساڵ لەفەرەنسا ژیاو خوێندنی مێژووی لەزانکۆ تەواو کردو گەڕایەوە بۆ سوریاو

---

* واتا هەڵبژاردنی چەند ئێلیمێنتێك لەجۆرەها سیستێمی بیری جیاواز.

بەهاوبەشی لەگەڵ هەندێ لەناسیۆنالیستە عەرەبەکان پارتی بەعسیان دامەزراند لەسەردەمێکدا کەمێژووی جیهان بەقۆناغێکی ئاڵۆزو دژواردا تێدەپەڕی.

کاریگەریی ئەم سەردەمە بۆ سەر بیری عەفلەق‌و جیهانبینی ئایدیۆلۆژیای بەعس چی بوو ؟ چی بوو کاریگەریی بیرو ڕای فاشیزم لەسەردەمێکدا کەبیری فاشیزم وەك لەکەی ڕۆن بەخێرایی بلاّو دەبوەوە؟ عەفلەق ناسیۆنالیستێکی بەجۆش‌و بەهەڵپە بوو، سروشتی خوێندنەکانی پتر لەهەموو کەسێك شیاوتر بوو بۆ کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی بیروڕای فاشیزم‌و ئەو بیرو ڕایانەی کە لەسەر گۆڕەپانی ئەورووپی دەناسران. لەسەردەمێکدا کەفاشیزم لە ساڵی ١٩٢٦ ەوە لەسەر حوکم بوو و ناسیۆنال سۆسیالیزم بەرەو سەرکەوتن دەڕۆی، ئایدلۆژیاکانی "ڕاستیی ڕەها"(ناسیۆنالیزم) دەیانویست یان خواستیان ئەوە بوو ببن بە بەجێهێنەری مەزنی ویستی نەتەوە. " موسۆلینی دەیگوت : سەدەی بیستەم ، سەدەی کۆی نەتەوایەتیە ، سەدەی فاشیزمە"[٣]. هەر لەکۆتایی ساڵانی ١٩٢٠ زۆر حزبی فاشیست ڕووی دەکردە ئیتالیا بۆ ئەوەی چارەیەك بۆ کێشەو نەخۆشیەکانی "نەتەوەی پوخت" یان "ڕەگەزی پوخت" بدۆزێتەوە. ئیتالیای موسۆلینی بوو بوو بەیەکەم بەدیهێنانی سیاسی عەقیدەی ناسیۆنالیزم، بوو بوو بە یەکەم بەرهەمی پراکتیکی بیری ناسیۆنالیزم. بیری ساری فاشیزم بلاّو دەبوەوەو وردە وردە دەگەیشتە ناو سنوورە سیاسیەکانی نەتەوەکان. لەهۆڵەندا ناسیۆنال سۆسیالیزمی بێویگونگی national-socialistische Bewegung موسریێت Musseret ، لە ئینگلستان یەکێتی فاشیزمی ئوزڤالد موسلی Oswald Moseley ، لەڕۆمانیا حەرەسی ئاسنینی کۆرنێلیو کودرێنو Corneliu Codreano ، لەبەلچیکا بزووتنەوی پادشایەتی (ڕێکسیزمی) لیێۆن دیگرێل Leon Degrelle... هتد، ئەمانە هەموویان بەشوێن ئامۆژگاریەکانی فاشیزم لەئیتالیا دەگەڕان. لەفەرەنسا کە عەفلەق چوار ساڵ تیایا مایەوە "ناسیۆنالیزمی ئینتێگراڵ"(تێکڕا)ی شارل مۆرراس Charles Maurrasوردە وردە زیاتر هوشیار دەبوەوە سەبارەت بەبوونی "خۆی نەتەوایەتی"و گوێ ڕایەڵ بوو بۆ ئەو شتەی کە لەودیو سنور ڕووی دەدا[٤]. لەهەموو شوێنێك

سروودی ژیاننەوەی نەتەوەو بەخەبەربوونی نەتەوەو یەکێتی نەتەوە بەدەنگی بەرز دووبارە دەکرایەوە. پەرستنی نیشتمانی نەتەوەیی لەهەموو شوێنێکدا بانگەشەی بۆ خولقاندنی پیاوی فاشیست دەکرد. " قەوارەی گەردوونیی ناسیۆنال"(٥) هاواری دەکرد بۆ پیاچوونەوە بەسەر رابوردوودا، بەسەر مێژوودا، داوای لەپیاوی فاشیست، لەمرۆڤی فاشیست دەکرد کەئاوڕ لەڕابوردوو بداتەوە و بەجۆش و چاوێکی ئاگرینەوە تەماشای مێژوو بکات.

پاشان، شۆڕشی ناسیۆنال سۆسیالیزم بوو بەتەواوکەری ئایدیۆلۆژیای ئینتەرنەسیۆنالی فاشیست. ئەڵمانیای نازی وورده وورده دەستی دەکرد بەپەیداکردنی سەنگێکی ئایدیۆلۆژی گەورەتر لەناو جیهانی عەرەبیدا. لەکاتێکدا کەئەوروپا بەدڵ گرانیەوە تەماشای ڕوخاندنی دیموکراسی دەکرد، تەماشای هەرەسهێنانی دیموکراسی دەکرد، هەندێ دەوڵەتی عەرەبی تەماشای هیتلەرو موسۆلینی و ئایدیۆلۆژیای فاشیستیان دەکرد وەك مۆدێلێکی ئیدیالی "دیموکراسیەتی کۆمەڵایەتی". پڕوپاگەندەی ناسیۆنال سۆسیالیزم و فاشیزم کارێکی زۆری کردە سەر بەتایبەتی گەنجی عەرەب کەڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر ویستی خۆی بۆ ناسیۆنالیزم و رق و کینەی بۆ ڕۆژئاوا دژ بەکۆلۆنیالیزم (فەرەنسا وئینگلستان) دەردەبڕی(٦). لەسوریاو عیراق، لەفەلەستین و میسر چەندین ڕێکخراوو دیدەوانی وەرزشی و سەربازی دروست بوو بوون کەئەندامەکانیان کراسی تایبەتیان لەبەر دەکرد لەسەر وێنەی کراسە ڕەشەکانی هیتلەری. لەلوبنان فەلەنجی لوبنانی دروست بوو بوون(٧)، لەمیسر کراسە سەوزەکان کە لەژێر سێبەری دکتور مصطفى الوكيل کەیەکێك بوو لەنوێنەرە راستەوخۆکانی نازیەت خرۆشیان تێ کەوتبو(٨). لەسوریا کوتلەی ناسیۆنالیست چەند دیدەوانێکی دروست کردبوو لەپێناوی ڕێکخستنی هێزەکانی نەتەوەی عەرەب. لەبارەگای هەموو پارتەکان گروپی گەنج سەریان هەڵداو بەدیسیپلینەوە مەشقی سەربازی خۆیان دەکرد. گەنجە ناسیۆنالیستەکان لەسەر بناغەی هونەری وەرزشی و سەربازی مەشقیان دەکرد و پرینسیپیان بریتی بوو لە سێ فاقەی "ملکەچی، دیسیپلین، خۆبەخت کردن"(٩).

ڕۆشنبیرو تازە دەرچوانی خوێندگەو پەیمانگاکان سەرقاڵی هوشیار کردنەوەی ڕۆحی‌و ڕۆشنبیری‌و فکری دیدەوانی گەنجان (کراسی ئاسنی)بوون. هەر لەمانگەکانی یەکەمی ساڵی ١٩٣٧ واتا کەمتر لەساڵێك پاش دامەزراندنی، ئەم بزوتنەوەیە پێکهاتبوو لەپتر لە ١٠٠٠٠٠ سەد هەزار ئەندام کە سەرجەم توێژە کۆمەلایەتیەکانی دادەپۆشی[١٠].

تایبەتمەندی گەنجی ناسیۆنالیست بریتی بوو لەبەرز کردنە**وەو ڕاوەشاندنی مەشخەلێکی داگیرساو کەواتای گەیاندنی پەیامی گەنجیەتی دەبەخشی کەپێکهاتبو لەئازادی ، ماف، هێز[١١]. لە عیراق بە تایبەتی، ڕێکخراوە نەسیۆنالیستەکان لەژێر کاریگەریی نەسیۆنال سۆسیالیزم‌و فاشیزم کاریان دەکرد بۆ بەدیهێنانی یەکیەتی عەرەب: نادی المثنی، التجمع الطلابی القومی، جمعیة الجوال العربی، نظام الفتوه، کتلة الظباط القومیین .. هتد. بە تایبەتی الفتوە بزوتنەوەیەك بوو کە ئامۆژگاریەکانی لەئەڵمانیای هیتلەری‌و ئیتالیای فاشی وەردەگرت. هەروەها جمعیة الجوال العربی هەڵدەسا بەمەشق پێ کردنی ئەندامەکانی بە بەکارهێنانی چەك‌و سواری ئەسپ‌و هەڵدەسا بە فێرکردنیان بۆ ملکەچ بوون‌و زەبتی سەربازی‌و پەیڕەو..هتد*.

لەو سەردەمەدا بوو کەمیشیل عەفلەق بنچینەی عەقیدەی بەعسی دادەناو چوارچێوەی ئایدیۆلۆژی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بەرەو دروست بوون دەچوو. لەو سەردەمەدا نەك تەنها ناسیۆنال سۆسیالیزم‌و فاشیزم وەك فۆرمی حکومەت سەرنج‌وویستی خەڵکی ڕاکێشا بوو، بەڵکو تیۆری ناسیۆنالیزم بەتایبەتی ناسیۆنالیزمی فەرەنسی‌و ئەڵمانی کارێکی تایبەتی کردبوە سەر زۆر پیاوی سیاسی‌و ڕۆشنبیر کەدەیانویست دیسانەوە چاو بەسەر مێژوودا بخشێننەوەو بیخوێننەوەو تەماشای بکەن لەسەر بناغەی بیروڕاو نوسینەکانی تیۆری ناسانی کیانی کۆیی‌و توندوتیژی. بەم بۆنەیەوە دەبێ بوترێ کەمۆسۆلینی بەردی بناغەی عەقیدەی فاشیزمی لە سەر بناغەی بیرو بۆچونەکانی سۆرێل ( Sorel ) وپێگوی ( Peguy ) و دلەگەردێل (De

Gardelle )و بەتایبەتی لەڕێگەی بەعەقلاّنی کردنی تیۆری دوەڵەت بەلای هێگلــەوە دانابوو. ئەوەش زانراوە کەپەرێتۆ ( Pareto )و مۆسکە (Mosca) و رێنــان (Renan) بەردی بناغەی تیّڕوانینی ئەرسیتۆکراسیو دژ بەدیموکراسی موسۆلینیان پێکدەهێنــا. مۆسۆلینی زۆر بەجۆشەوە "پێشنیازە رۆشنکەرەوەکانی پێش فاشیزمی" رێنانی بــەرز دەنرخاندو بەزمانی رێنانەوە دەیگوت: " ئەقڵو زانست(. . .) بەرهەمی مرۆڤایــەتین. بەلاّم ئەوە خەوێکە ئەگەر ڕاستەوخۆ داوابکرێت کەئــەقل بــۆ میللــەتو لەمیللەتــەوە سەرچاوە بگرێ(. . .). دەترسم کە دوا ووشەی ئەو دیموکراسیەتەی کەباسی لــێ دەکــرێ دۆخێکی کۆمەلاّیەتی وا پێکبێنێ کە لەناویدا جەماوەرێکی نــەخۆش بــەبێ هیــچ دوو دڵیەك بەشوێن تێرکردنی حەزو ئارەزوە چەپەڵەکانی پیاوی نزمدا بگەڕێ "[(١٢)].

تێڕوانینی ئەریستۆکراسی، دژ بەیەکسانیو دژ بەدیموکراســیەتو ڕەگــەز پەرستــی هیتلەر ســەرچاوەی لــەبیروڕای گۆبینــۆ و Gobineau هۆســتن ســتیوارتو Hoston Stewart شــەمبێرلینەوە Chamberlin . . .هتــد. وەردەگــرت. بێگومـــان، لــێرەدا مەبەست نییە لەئەسلی سیاسیو فەلسەفی ناسیۆنال سۆسیالیزم یان فاشیزمی ئیتالی بدوێین چونکە ئەوە لەسنوری بابەتەکەمان دەردەچێ، بەلاّم دەمانەوێ دەری بخــەین کــە لەسەردەمێکدا کەپەیوەندیەکی پێچەوانەیی لەنێوان توندوتیــژیو ئــازادیدا هــەبوو، لەسەردەمێکدا کەناسیۆنالیزم وەك تەنها نوێنەری جەوهەری کۆمەڵو دەوڵەت تەماشــا دەکرا، لەو سەردەمــەدا پیاوانی سیاسیو بیروەرو رۆشنبیران دەچونو بەشــوێن پێناســەی ئامــانجی دەوڵــەتو پــەیوەندی نێــوان تــاكو کۆمـــەڵ لەبــەر ڕۆشــنایی تیۆریــە کلاسیکیەکانی ناسیۆنالیزم دەگەڕان.

لەم سەردەمــەدا بوو کەمیشێل عەفلــەق ڕێگــەی ژیــانی سیاســی گرتبــو و بنــەمای ئایدیۆلۆژیای بەعسی دادەناو، پارتی بەعسی عــەرەبی سۆسیالیســتیش بــەڕۆحی ئــەو سەردەمــەوە بوو کەبەرنامەی سیاسیو فەلسەفیو ئایدیۆلۆژی دروست دەبوو و خــەباتی خۆی بەرەو پێشەوە دەبرد بۆ هاتنە سەر حوکمو جێبەجێکردنی تیوریەکانی دەوڵــەتو کۆمەڵگەی نەتەوەیی.

ئایا تەریبی لەگەڵ فاشیزمی مێژویی وامان لێ ناکات بڵێین کەبیرو ڕای عەفلەق و بەعس هیچ ڕەسەنایەتیەکیان تێدا نییە؟ چونکە زۆر لایەنی ئەم بیرو رایە لە ناو سیستمی جیهانبینی نەسیۆنالیزمی خۆرئاوایی دەدۆزرێنەوە. ئایا دەتوانین بڵێین کەمیشێل عەفلەق دوبارەو لاسایی لۆژیکێك دەکات کە نە لە سەر ئاستی کولتووری و نە لەسەر ئاستی سۆسیۆلۆژی و نە لەسەر ئاستی مێژوویی و نە لەسەر ئاستی سیاسی هیچ تەریبیەکی لەگەڵدا نییە؟ ئایا دەتوانین بڵێین کەمیشێل عەفلەق ئەم لۆژیك و جیهانبینیە لەگەڵ پێداویستەکانی سیستێمی کۆمەڵی عەرەبی دەگونجێنێ؟ لەوە دەکات کە عەفلەق هەوڵ بدات سینتەزەیەکی synthesis لۆژیکی نەسیۆنالیزمی خۆرئاوایی بکات. ترانسپۆزەکردنی transposition ناوەرۆکی تیۆریە ناسیۆنالیستەکانی ئەوروپی بۆ لۆژیکی عەرەبی، وا دەکات کە ئەو پاساوانە بهێنرێنە پێشەوە کەبەرگری لەو ئایدلۆژیایە بکەن کەبەرامبەر هەموو دۆخێك"، دژ دۆخێك" بدۆزنەوە. دەتوانرێ ئەوەی کە ژول مۆنرۆ Jules Monnerot سەبارەت بە نەسیۆنال سۆسیالیزم وفاشیزمی ئیتالی دەیڵێ، سەبارەت بە بەعسیش هەمان شت بوترێ: "کەهەڵسوکەوت دەکات لەگەڵ بیروڕادا وەك چۆن زیندەوەرێك هەڵسوکەوت لەگەڵ ژینگەی خۆی دەکات کاتێك کەخۆراك و گشت ئەورێگایانەی بۆ پەیداکردنی تەواو دەبن. ئەو زیندەوەرە لەوژینگەیە ئەوە وەردەگرێ ( بخوێنەرەوە دەخوات) تەنها ئەوەی کەپێویستیەتی و ئەوی تر بەجێ دێڵێ"[١٣]. دەمانەوێ بڵێین لەکاتێکدا عەفلەق (هەروەها سەرجەم نەسیۆنالیستە عەرەبەکان هەر لەسامی شەوکەت و ساطع الحصری‌یەوە تا دەگاتە زکی الارسوزی) باوەش بەناسیۆنالیزمدا دەکات و ئالاکەی بەرز دەکاتەوە وەك تەنها گوزارشت بۆ ویستی کۆمەڵ، ناوەڕۆکی ئەم نەسیۆنالیزمە وەرناگرێ لەواقیعی سۆسیۆلۆژی و کولتوری و مێژووی میللەتی عەرەب، چونکە وەك تێبینی دەکەین گشت ئەو ناوەڕۆکە زۆر نزیکترە لەدەربڕینەکانی ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاوایی و ئەوەی کەنەسیۆنال سۆسیالیزم و فاشیزمی ئیتالی لەسالانی نێوان دوو جەنگدا دەیان ووت و باوەڕیان پێی هەبو و لە پراکیکدا خستیانە کار. جگە لەوەی کە تا ئێستا

هێڵمان بەژێردا هێنا، دەمانەوێ بەم بۆنەیەوە هەندێ تێڕامانی (تەأملاتی) contemplation ئایدیۆلۆژی عەفلەقی شیبکەینەوە بۆ ئەوەی باشتر لە "مەتەڵی" بەعسی عیراق تێ بگەین.

## عەفلەق و ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاوایی

لەبیرو دیدی گشتی عەفلەقدا تێبینی دەکەین کە بەشێوەیەکی سیستیماتیکو زۆر دووبارەکراو، عەفلەق هێرش دەباتە سەر دۆخی ڕوخاندنو خۆپەرستیو خەمساردیو هەرەسهێنان کەهەڕشە لەمانەوەی کیانی نەتەوەی عەرەب دەکەن. لەهەموو بۆنەیەکدا عەفلەق میللەتی عەرەب سەبارەت بەهەڕەشەی لەناو چوون ( تهدد العرب بالانقراض) ئاگادرا دەکاتەوە. هەروەها دەبێ تێبینی بکرێ کەکاتێك ڕەخنە دەگرێ لەبۆگەن کردنی کیانی نەتەوەی عەرەب، چونکە لەبنچینەدا ڕەخنە دەگرێ لەفەوتانو بۆگەن کردنی ئەو ڕۆحەی، ئەو هێزە دروستکەرەی، ئەو ووزەو گورجو گۆڵیە شاراوەیەی کەجاران عەرەب خاوەنی بوون کە شانازیەك بوو بۆ مەزنیی رابوردوو. دەبێ بوترێ کە بەڕاستی زۆر سەرنج ڕاکیشە کە ئەم تێرمنیۆلۆژیە terminology ، جەوهەری بیری زۆر لەناسیۆنالیستە ڕۆژئاواییەکان بەتایبەتی فیختەو Fichte مۆراس Maurras و ڕینان Renanو بەرێس Barres وەبیر دێنێتەوە. لەنێوان ئەم ناسیۆنالیستانە زۆر لەیەکچوونو ئەنالۆژی Analogy ( لەیەکچوون لە نێوان چەند دیدێك کە لەڕەسەندا زۆر جیاوازن) تێبینی دەکرێنو ئەمانەش بە راستی سەرچاوەی ئیلهامی بیری فاشیزمی مێژویی بوون. ئەگەر هەر یەکەو لەم نووسەرە ناسیۆنالیستانە وەربگرین، دەبینین هەموویان (بە جیاوازی بیروڕاو ژینگەی کولتوریو بارودۆخی مێژوویی) دژی بێگانە دەوەستنەوەو بە زێدرەویەوە شانازی بەرابووردووەوە دەکەنو بەتوندوتیژیەوە ڕەخنە لەدۆخی حازر دەگرنو وێنەی کارەساتێکی تراژیدی دەهێننە پێشەوە. ئەمانە پێکهاتەی سەرەکی هەموو ناسیۆنالیزمێکن کە لەژێر کاریگەریی تایبەتیدا ڕۆمانتیزە دەکرێنو

دەبن بەپاڵپشتێك بۆ فۆرمی حوكمی گشتگر. با لەنزیكترەوە ئەم ئەنالۆژیە دەستەواژەییانە شیبكەینەوە.

لەڕوانگەی میشیل عەفلەقەوە ناسیۆنالیزم لەپشت ئەو هێزەی كە خۆراك دەبەخشێ بەبەها پۆزیتیڤەكان ( هێزی دروستكەر، ووزەی ژیاو، توندو تۆڵی شاراوە، ڕۆحی عەرەب، نەفسی عەرەب، عەرەبی نەمر، پەیامی نەمر..هتد.) دەوەستێتەوە.

میشیل عەفلەق دەیەوێ لەسەر وێنەی رابوردوو هێزی پاڵپێوەنەر بژیێنێتەوەو وەلاّم بۆ دۆخی نێگەتیڤ لەناو ناسیۆنالیزمدا دەدۆزێتەوە، ناسیۆنالیزمێك كە توانای ئەوەی هەبێت كۆتایی بەتێكچوونو هەڵوەشاندنەوەی بەها نەتەواییەكان بهێنێ، ناسیۆنالیزمێكی سەرەتاییو بەووزە كەبتوانێ سەرشۆڕیو نزمبوونەوەی مرۆڤی عەرەبی بچڕاو و دوور لەڕۆحی نەتەوەییو بێ بەشكراو لەكۆمەڵگەی نەتەوایەتی بەرپەرچ بداتەوە، ناسیۆنالیزم تەنها ڕێگەی ڕزگار بوون لەفەوتان. ئەم "بەرامبەریەكدانانە" دەستەواژەییە ( ناسیۆنالیزم) - وەك بەر پەرچدانەوە دژی فەوتان، لەبیری زۆر نووسەری ناسیۆنالیستی رۆژئاوایی تێبینی دەكرێ: بەرێس Barres، مۆراس Maurras، تەین Taine ، دریومۆن Drumont ، فیختە Fichte..هتد. بەلاّم تیۆرانینو تیۆریزە كردنی "قەوارەی هەرەسهێنانیی" عەفلەق نزیكترە لەوەی بەرێسو رێنان لەلایەكەوەو لەوەی فیختە لەلایەكی دیكەوە. بەلاّم دەبێ ئەوە وەبیر بخرێتەوە كەنابێ ناسیۆنالیزمی عەفلەقی كەمبكرێتەوەو لەناو قەوارە دایكۆتۆمیەكەیدا تەماشابكرێ، واتا ناسیۆنالیزم وەك بەرپەرچ دانەوە بۆ هەرەسهێنان. ئەگەر بەم شێوەیە بیر بكەینەوە، واتا ئەگەر ناسیۆنالیزمی عەفلەقی بخەینە سەر ئاستی سیلۆژیزمێكی سۆفیستیك sophistic syllogism : بەرێس، رێنان، فیختە بیری ناسیۆنالیستی دەوەستێنین بەرامبەر (دژ) هەرەسهێنانو فەوتانی ژیاویی نەتەوە ــ عەفلەق ناسیۆنالیزم بەرەنگاری پێدەكات دژی هەرەسهێنان، كەواتە عەفلەق لاسایی بەریسو رێنانو فیختە دەكاتەوە. ئەگەر وا بكەین، هیچ جیاوازیەك لەنێوانیان ناهێڵینو نرخ بۆ رەوتی مێژوویيو سیاسیو كولتوری..هتد دانانێین كە ئەم دیدە

دینێته کایەوە. هەرچۆنێك بێت، دەتوانین بڵێین کە پێکهاتەکانی تیۆری ناسیۆنالیزمی عەفلەقی لەو لایەنانەی کە تا ئێستا باسمان لێوەکردوە خاڵی هاوبەشیان لەنێوان یەکتریدا هەیە. ئەو خاڵە هاوبەشانەی نێوان ناسیۆنالیزمی بەعسی عەفلەقیو ناسیۆنالیزمی ئەوروپی چین؟ دەتوانرێت بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکرێنەوە: (١) هێرش بردنە سەر مەسەلەی خۆپەرستیو خراپ بوونی بارو دۆخی ژیانی نەتەوە،(٢) بانگەشە کردن بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ ئەم بارودۆخە نێگەتیڤە،(٣) بنچینەی سەرەکی ئەم چارەسەرکردنە بە زێدڕەویەوە سەرچاوە لە شانازی کردن بەباوو باپیرانەوە دەگرێ،(٤) جەوهەری سۆزو پەرستنی باوو باپیر بریتیە لەناسیۆنالیزم. بەشێوە گشتیەکەی، لەم سکێمە عەقلیە، عەفلەقو ناسیۆنالیستەکانی دیکە پێناسەی پەیوەندی نێوان تاكو کۆی نەتەوایەتی دەکەن. بالەنزیکەوە ئەم خاڵانە ڕوون بکەینەوە.

مۆریس بەرێس Maurice Barres ( کەیەکێك بوو لەنوێنەرە هەرە سەرەکیەکانی دژی جوولەکەو یەکەم دانەری بنچینەکانی فاشیزم) بانگەشە بۆ ناسیۆنالیزمێك دەکات کە توانای ڕەت دانەوەی نزم بوونو کەم بوونەوەی میللەتی هەبێتو دژی هەڕەشەی فەوتاندنی نەتەوەی فەرەنسی پاش بەزاندنەکەی ساڵی ١٨٧١ بوەستێ. سەرجەم تێڕوانینە مۆڕاڵیەکەی بەرێس پێکهاتوە لەبانگەواز بۆ گەورەییو بەرزیی نەتەوایەتی کەنوێنەرایەتی سەرکەوتنەکانی ڕابووردوو دەکەن. زاراوەی "ووزەی دروستکەر" لەراستیدا گوزارشت لەئەڤینو خۆشەویستی بۆ گەورەییو مەزنیی ڕابوردوو دەکات. بەم شێوەیە ڕەخنە گرتن لەبارو دۆخی هەرەسهێنانی فەرەنسا بەلای بەرێسەوە (هەر وەکو بەلای عەفلەقەوە سەبارەت بەهەرەسهێنانی نەتەوەی عەرەب، "بەشێوەیەکی سەرەکی لە ئەنجامی ڕەخنە گرتنە لەبۆگەن کردنی ووزەی دروستکەری نەتەوە"[١٤]. لەم تێڕوانینەوە بەرێس سکاڵای خۆی بەرامبەر وون بوونی کەسایەتی هاووڵاتی فەرەنسی دەردەبڕێ: " هەستدەکەم کەهاووڵاتیگەری فەرەنسی نزم بۆتەوە، فەوتاوە، واتا ئەو پاك وپوختیەی نەماوە کەپشت گیریمان لێ دەکات"، " ئەوەی کە تووشی بوین ئەوەیە کەبناغەی (پێگەی) ژیانمان، ڕاستی واقیعەکەمان، ووزەمان

نەماوە"[١٥]. بەرامبەر کۆی ناسیۆنال کە" هەڵوەشاوەتەوەو بەتاڵ کراوەتەوە"[١٦]، بەرێس بۆ ئەوەی چارەسەرێك بۆ ئەم نوقسانیو نەخۆشیانە بدۆزێتەوە، پەنا دەباتەبەر گورو پاڵەوانیەتیو چالاکی هێزی جاران وهی ڕابوردوو. "ووزەی دروستکەر"و هەموو ئەو بەهایانەی کە پابەندن پێوەیەوە، هەمویان چارەسەرێکن بۆ لاواز بوونو دواکەوتنی نەتەوەو ڕێگەیەکن بۆ گەڕانەوە بۆسەرچاوە خۆییەکانی "منی نەتەوایەتی" کە مەزنیی "هێزی ڕابوردوو" نوێنەرایەتیان دەکات. کەڵکی سکالا دەربڕین لەهەڵوەشاندنەوەی "ووزەی دروستکەر" ئەوەیە کەڕێگەیەك نیشان دەدات بۆ لابردنی پەرستنی" منی" تاکەکەسو هێنانەوە کایەی "منی" نەتەوایەتی. ئەم "بەرامبەریەکەگەریە"، سەرجەم " هێزەکانی هەست" دەلەرێنێتەوە لەبەرژەوەندی نەتەوە. بێگومان، ئەو نەتەوەیەی کە وەك ڕاستیەکی پراکتیکی دێتە کایەوە، نەك نەتەوە بەواتا دادوەریەکەی یان وەك سیستێمێك لەبیروباوەڕ[١٧]. نەتەوەی فەرەنسی، بەرێس دەڵێ، کە دابەشبوەو توشی مەینەتی بوە، لەچەند تاکێکی تەنها (منعزل) پێکهاتوە کە توانای پێشخستنی بەرژەوەندی گشتیان نەماوە. "منی" تاکەکەسی کە بە"شێوەیەکی زۆر خراپ"[١٨] لە ناوچوە، دەبێ ڕەسەنیی خۆی لەبەردەوامبوونی نەوەکانی پێشودا بدۆزێتەوە. " ئێمە نەوەی باوو باپیرمانین(...). ئەوان لەناو دڵماندا بیرەکەنەوەو قسەدەکەن. گشت زنجیرەی میراتگرەکانمان یەك رەچەڵەك پێکدێنن(. . .). تاك لەناو گێژە لۆکەیەك نوقم بوەو بەشوێن ئەوەدا دەگەڕێ کە خۆی لەناو خێزان، لەناو ڕەگەز، لە ناو نەتەوەدا بدۆزێتەوە"[١٩]. پێشینەیی لەپرینسیپی بنەڕەتی سەرچاوە دەگرێ کەبەرێس پشتی پێوەدەبەستێو "داهاتویی" دەبێ بەگۆڕەپانی کردەوەی پراکتیکی کیانێکی یەك پارچەیی کەرابوردوو و ئێستاو داهاتوو پێکەوە دەبەستێو دەیپارێزێ. "ئەوانەی ناگەنە ناو ئەم گەنجینە شاراوانەو ئەوانەی بەرێزەوەو بەخۆشەویستیو ترسەوە خۆیان ناناسنەوە وەك بەردەوامبوونی باوو باپیریان، چۆن دەتوانن ئاراستەکانی خۆیان بدۆزنەوە؟"[٢٠].

هەموو زانینێکی یەکسەریی ( زوو بە زوویی) و چالاکی سایکۆلۆژی مرۆڤو تێڕوانینی بەرامبەر ژیان دەبێ بەدەوری رەچەڵەکدا (نسل) بسوڕێتەوە. هوشیاری

خێزانیی (واتا ئەوەی کە پابەندە بە باوو باپیرانەوە) دەبێ لەناو پەیوەندیـەکانی بنەچـە خۆی بدۆزێتەوە. "تـێڕوانینی تێکـڕای مـن، خـۆی لـەدەوری ئاکسـێکدا دەدۆزێتـەوە کەپێکهاتوە لەڕەچەڵەك (نسل)". بەم شێوەیە بەرێس "خاڵی چەسپو شوێنی جێپـێ" لە ناو "ڕابووردوو و داهاتودا" دەدۆزێتەوە"(٢١).

بەڵاَم ئەوەی کـەنزیکترە لـەبیری میشـیل عەفلـەق و کـارێکی زۆری کردۆتـە سـەر، بیروبۆچوونەکانی فریدریك فیختەیە. ناسیۆنالیزمی عەفلـەق جێگایـەکی پـانو پـۆڕ دەهێڵێتەوە بۆ تەوژمی بیری فیختە. دەبێ هێڵ بـەژێر ئـەوەدا بێنـین کـە ئەگـەر چـی کێشەی پەروەردە سەنتەری ئامۆژگاریەکانی فیختە پێکدێنێ، سکالاَ دەربڕین بەرامبەر خۆپەرستـیو تێکچونـی مـۆرالو کۆیلایـەتیو لاوازیو گـەندەڵی(٢٢) نەتـەوە بـەردی بناغـەی ناسـیۆنالیزمە زمـانیو ڕەگـەز پەرسـتیەکەی پێکدێنـێ. سـەبارەت بەئامۆژگاریەکانی بۆ نەتەوەی ئەڵمان فیختە دەڵێ:" خۆپەرستی گەیشـتۆتە لوتکـەی پایە. جگە لەحاڵەتی دەگمەن، خۆپەرستی تووشی گشـت حوکمکـراوانو حوکمکـەران بوەو بوە بەتەنها جولێنەری بوونیان"(٢٣). نەتەوەی ئەڵمان کە دوچاری بێگانە بۆتـەوە، گشـت شـانازی بەیـەکێتی نەتەوایـەتی خـۆی وون کـردوە. کـاتی ئـەوە هـاتوە کـە سەردەمێکی نوێ دوا بە دوای خۆپەرستیو داگیرکردنی بێگانە بێتە ئاراوە. کاتی ئـەوە هاتوە کە نەتەوەی ئەڵمان یەکێتیو پەیوەندی نەتەوایـەتی خـۆی بدۆزێتـە. لـەپێناوی ئەوەی کە نەتەوە بەتەواوی نەڕوخێ، زۆر پێویستە کە بەزووترین کات نەتەوەی ئـەڵمان یەکێتی خۆی بژێنێتەوە(٢٤). پێویستە نەتەوەی ئەڵمان " غیرەتی پیاوانـەی" هـەبێتو بەوورديەوە تەماشای کلۆلی خۆی بکات(٢٥). نەتەوەیەك کەبـەم شـێوەیە نـزم بۆتـەوە، ناتوانێ "خۆی بەدیبێنێ" و یەکێتی مسۆگەر بکات ئەگەر بانگەشە بۆ چارەسـەرێکی ڕەها نەکات کە بریتیە لەخولقاندنی پەیرەوێکی نوێی تـەواو(٢٦). پێویسـتە نەتـەوەی ئەڵمان بتوانێ ببێ بەکەسایەتیەکی یـەکگرتو، ئەگـەر بیـەوێ "لـە نزمـی ڕزگـاری بێتوجارێکی دیکـە بژێتـەوەو هەسـتێکی بـەرز بـۆ خـۆی بخولقێنـێ(٢٧). لـەدۆخی هەرەسهێناندا تەنها چارەسـەرێك بـۆ نەتـەوەی ئـەڵمان ماوەتـەوە: ڕووهـەڵماڵین لـەو

پەیوەندیەی کە "بەرژەوەندی تاکە کەس دیسانەوە دەبەستێتەوە بەکۆی ناسیۆنال"[٢٨].
ئەم پەیوەندیە لەچی پێك هاتوە؟ بێ گومان لەناسیۆنالیزم. ناسیۆنالیزمی فیختەیی کە پابەندە بەئیدیالیزمی فەلسەفیەوە، سەروەریی‌و شانازی بەرۆحی ئەڵمانی دادەنێ بەرامبەر بە "رۆح بەتاڵی"، دۆخی ئێستاو ژیاننەوەی رۆح بەرامبەر بەهەرەسهێنان‌و ویستی پوخت‌و ئەخلاقیەتی پوخت‌و بیری هەمیشەیی‌و جەرمانیەت دژ بەحاڵەتی دابەشبوون‌و گەندەڵی‌و خۆپەرستی، بەوشەیەك ناسیۆنالیزمی سەرەتایی دژ بەهەڵوەشاندن‌و تواندنەوەی پەیوەندی نەسیۆنال. بەلای فیختەوە، ناسیۆنالیزم " گەشاندنەوەیەکی پوختترو تەواوترو گونجاوتر بەدی دێنێ لەناو پێشکەوتنێکی بەردەوامی پرینسیپی نەمرو خودایی لەجیهاندا"[٢٩]. بەم شێوەیە، ناسیۆنالیزمی "راستەقینەو تێکرا" دەبێ نەهێڵێ نەتەوە کرنووش بێنێ بۆ حاڵەتی شێواندن‌و هەپرون بە هەپرون بوونی ویست‌و ئارەزوی بەنرختر لەداگیرکەری بێگانە. ئەی ناسیۆنالیزم لەچیەوەو چۆن سەرچاوەی هێزی خۆی لەرابووردوو دەدۆزێتەوە؟. ئەو مرۆڤەی کە خاوەنی هەستی خانەدانیە دەبێ "خۆی بژێنێتەوەو بوونی خۆی دووبارە بکاتەوە لەناو گیانی منداڵانی خۆی بۆ ئەوەی پاش مردنی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەردەوامی بەبوونی خۆی لەسەر زەوی‌و بەژیانی میراتگرەکانی بەشێوەیەکی چاك‌و خانەدانانە بدات "[٣٠]. مرۆڤی ئەڵمان دەبێ لەرابووردوودا رۆحی راستەقینەی خۆی بدۆزێتەوەو لەسەر بنچینەی رابووردوو دەبێ بەبێ وەستان هاوبەشی بکات "لە چاککردنی رەگەزەکەی ". نەمریی لەبەردەوامبوونی رابوردودایە. تەنها بەم شێوەیە، ئادەمیزادی ئەڵمان دەتوانێ لەدایك بێتەوەو "خۆی کە نەمرەو دەتوانێ کارەکانی نەمر بن"[٣١]. باوەرهێنان بەنەمری واتاکەی لە" میللەتدایە کەرەسەنی خۆی تیادا دەدۆزێتەوەو لەباوەشیدا گەورە بووە"[٣٢]. نەمریی ئەنجامی ئەو یاسا تایبەتیەی سروشتی رۆحی میللەتێکە کە لەناو دڵێ " ئەو پیاوانەیە کە لەکۆمەڵدا دەژین‌و بەبێ وچان لەسەر ئاستی رۆحی‌و سروشتی بەرهەم بەیەکتری دێنن"[٣٣]. ئەو پیاوانەی ملکەچی ناکەن بۆ یاساکانی نەتەوەی نەمر، شیاوی ئەوە نین ناوی میللەتی خۆیان

هەڵگرن چونکە باوەڕ بەو ئێلێمێنتە سەرەتاییانە نـاهێنن کـە ناوەڕۆکیـان پێکدێـنێ. کەسایەتی بەشێوەیەکی گشتگیر بریتیە لەگەشە پێدانی ئەو ئێلێمێنتە سـەرەتاییانەی کەپرینسیپی نەمری ئەبەدی تاکێك پێکدێنن‌و وا لەتاك دەکـەن بـاوەڕ بەئەبەدیـەتی خۆی بهێنێ.

بائێستا دەست بکـەین بەهەڵسـەنگاندنی بیری میشـێل عەفلـەق سـەبارەت بەناسیۆنالیزم. لەڕوانگـەی عەفلەقـەوە ناسیۆنالیزم وەکـو نـاوی کەسـێك وایـە: "ناسیۆنالیزم وەك ناوێك وایە کە لەساتی لەدایکبوونمانەوە لەگەڵماندایەو وەك شـێوەی دەم وچاو وایە کەقەدەر بۆی نوسیوین تەنانەت پێش لەدایك بونمان کە لەباوو باپیرمـان بۆمان ماوەتەوە"[٣٤]. بەهۆی ناسیۆنالیزمەوە پیاوی عـەرەب ڕوو لەکەسایەتی خـۆی هەڵدەماڵێ‌و ئەگەر مرۆڤی عەرەب بەرامبەر ئەم نازناوە هوشیار بێت، ئـەوا دەتوانـێ لەژیانی پڕ لەڕواڵەت دەربچێت‌و بچێتـە نـاو بازنەیـەك کەگـەرمی‌و هـێز ببەخشـێ بەژیانی‌و وەك ئەنجامێك، ئاراستەی ژیـان‌و سیمای پیـاوەتی لـێ بنیشـێ[٣٥].بـەلای میشیل عەفلەقەوە، هـەر وەك بـەلای فیختەشـەوە، نەسیۆنالیزم هـێزێکی مێژوویـی سیاسیە کە مۆرکی خۆی بەشێوەیەکی چەسپیوو لەسەر زنجیرەی ڕوودراوەکـان دادەنـێ. پیاوی عەرەب کە باوەڕ بەم قەدەرە دێنێ کە ناتوانێ لێـی دورکەوێتـەوە دەبـێ لەسـەر شانۆی ژیان کردەوەکانی بەگوێرەی ئەم قەدەرە پڕبێـت لەپاڵـەوانێتی[٣٦]. لەبـەر ئـەوە شـتێکی بێکـەڵك دەبێـت ئەگـەر مـرۆڤ هـەوڵ بـدات بێبـاك بێـت بەرامبـەر ئـەو پەیوەندیانەی کەچـەند سـەدەیەك ئـەویان بەنەتەوەکەیـەوە بەسـتۆتەوە "[٣٧]. پیـاوی عەرەب دەبێ ڕەسـەنی خـۆی لـەڕابوردوودا بدۆزێتـەوە چونکـە ژیـانی حـازری تەنـها نائومێدیـەکی پوخـت دەنوێنـێ. دەتوانـرێ بەڕاسـتی بوتـرێ کەناسـیۆنالیزمی "باووباپیرەیی" میشیل عەفلـەق هێشـتا زۆر قوڵـترە لـەوەی بـەرێس یـاخود فیختـە. لەهەموو نوسین‌و بۆنەیەکدا، عەفلەق بێ دڵـێ ناکـات لـەدووبارە کردنـەوەی ئـەوەی کەتاك هیچ شتێك نییە ئەگەر ژیانی بباتە سەر بەبێ ئـەوەی بزانـێ کـە لقێکـە لـەو ڕوەکەی کە لەناو جەرگەی رابوردودا ڕەگی داکوتاوە: تاکەکەس "تەمەنی خـۆی دەژی‌و

نازانێ کە ئەو لقێکە لە روەکێك کە ریشەی بە ناو رابــوردودا رۆچـوەو پەلـەکانی بـە درێژایی چاخەکان درێژ دەبنەوەو نازانێ کە ئەو یەکێکە لە ملوێنان کەس کە بـە دوای یەکدا لە سەدەکانو نەوەکانەوە هاتونو زەویان کێــڵاوەو شارستـانیەتیان بنیـاد نـاوەو هزریان دروست کردوەو گیانان بەخت کردوەو جەنگاونو لەمـەیدانی جـەنگدا لـە نـاو چوون. هەموو ئەمانــەش بـۆ تۆمـارکردنی مێـژوی نەتەوەکـەیان بـوە دێـر بـە دێـر، بنیاتەکەی بەرد بە بەرد بخەنە سەر یـەكو بلیمـەتی خۆیـان دەربخـەنو پەیامەکـەیان بەردەوام بێت"[٣٨]. ئەندامانی نەتەوە لەماوەی چەند سەدەیەك پارێزگاری خۆیان کـردو خەباتیان کردو بەرگریان لەبارودۆخی دژواری پڕ لەکەندو کۆسپ کرد لەپێناوی ئـەوەی لەتاریکی نەبوون دەربچنو روناکی ژیان ببینن[٣٩]. هەوڵو تەقەللای سەدەها نەوە ئەوە بوو کە شەرەفی بەرپرسیتی ڕابـوردو بـدەن بەئـەندامانی[٤٠]. بـەڵام "لـە سـەردەمی لاوازیی و زەلیلیی و داکەوتنو پەرتبوون" ئەم بەرپرسیتیە ئەوەندە ئاســان نـابێت[٤١] و هەرچەندە ئەم بەرپرسیتیە سەختو پڕ لەناخۆشیە بەڵام حەکـەمێکی ڕەوایـە چونکـە پاڵەوانیەتی بەئەندازەی ژیانی سەخت دەپێورێ و( دەبێ بە ڕێگەیەك) بۆ ڕزگـار بـوون لەئیمپریالیزمی بێگانەو بەرهەڵستی بەرامبەر مەترسی دابەشبوون[٤٢].

وەکو تێبینی دەکەین، ناسیۆنالیزمی عەفلەقی بریتییــە لەبەرپـەرچ دانەوەیـەك بـۆ دۆخی قەیرانی سیاسیی و بوونیی (وجودیی).

لەدۆخێکی ڕێگەلێتێکچونی کۆیی، ناسیۆنالیزم ئومێدی دڵنیایی ڕزگـاربوون دەدات چونکە دەتوانێ هێزی "پاشماوەیی" ڕۆحی عەرەبی بهێڵێتەوەو واتایەك بەژیانی عــەرەب ببەخشێ. وەك ڕوون کرایەوە بنچینەی ئەم ناسیۆنالیزمە بریتیە لەپەرستنی باوو باپـیر. عەرەب دەبێ لەناو هەستو سۆزی باووباپیر بژین. دەبێ پشـت بکەنـە ئێسـتا (دۆخـی حـازرو) و لەســەر وێنــەی هوشـیاریی رابـوردوو پاشـەڕۆژ ببینـن. مێتێمپسـیکۆزی* ناسیۆنالیست، "بەخێزان کردنی" نەتەوە دەکات بەمەرجێك.

---

* ئەو عەقیدەیەی کە هێما دەکات بۆ ئەوەی کە هەمان گیان دەچێتە لەشی زیاتر لەمرۆڤێك یاخود ئاژەڵێك.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم لەیەکچونە دەستەواژەییە لەبیرو بۆچونی سەرجەم ئەو ناسیۆنالیستانە تێبینی دەکرێت کەئاماژەمان پێکردن. خۆی لەخۆیدا ئەم جۆرە ناسیۆنالیزمە دەبێ بە شتێکی سامناک کاتێك کە "دەسیاسەتێنرێ" یان "رۆمانتیزە دەکرێ". قەوارەی "باوو باپیرەیی" شتێکی سروشیتە ئەگەر تەنها پەیوەندی تێزێکی مێژوویی تەرح بکات، بەڵام کاتێك دەبەسرێتەوە بەکێشەی دەسەڵاتو خۆسەپاندن، ئاراستەیەکی دیکە وەردەگرێ. بەرێسیش دەیەوێ لەرێگەی ناسیۆنالیزمەوە چارەیەك بۆ تێکشکاندنی نەتەوە بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی هێزی هەستوسۆز بتوانێ ببێ بەشتێکی پراکتیك، پێویستە کەتاك رێگەی هەمیشەیی بگرێت لەسەر بناغەی هۆشیاری باوو باپیرەوە. بەم شێوەیە نەتەوە دەبێت بەیەك خێزان. هەروەها فیختەش "وەعدی ژیانێکی هەمیشەیی" لە ناو " گڕی قوتدەری نیشتمانیگەری مەزن" دەبینێ[٤٣]. بەڵام ئەم "هێزەی خاك" خۆی لەرێگەی "مەتێریالیزە کردنی" هۆشیاری ئەو باوو باپیرانە دووبارە دەکاتەوە کە لەرابوردودا رەگیان داکوتیوە. رێنانیش هەروەها لەناو "بیرەوەریدا" (ذاکرة) پەیوەندی نێوان ئێستاو رابوردوو دەدۆزێتەوە. "پەرستنی باوو باپیر رەواترین شتە.. باوو باپیرانمان وایان کرد کە ئێمە وابین"[٤٤]. بەم بۆنەیەوە میشیل عەفلەقیش هەمان شت دەڵێ، هەمان بیرۆکە دووبارە دەکاتەوە: "ناسیۆنالیزم بیرەوەریەکە (تذکر)، بریتییە لەبیرەوەریەکی ژیاو"[٤٥]. ناسیۆنالیزم " هەمان ئەو سۆزە پێکدێنێ کەتاك دەبەستێ بەخێزانەکەی چونکە نیشتیمان ماڵێکی گەورەیەو نەتەوەش خێزانێکی فراوانە"[٤٦].

ناسیۆنالیزمی جۆرج ڤاشەر لەپووژ Georges Vacher Lapouge و رەگەز پەرستیە بایۆلۆژیەکەیو تیۆرانیە "هەڵبژاردەییەکەی" بۆ مێژوو و چەمکی " هەڵبژاردنی هاوئاراستەکەی" لەئەنجامی "جیهانبینیەکی بنەرەتیی نەتەوەوە دێت"و وەك بەردەوامبوونێکی باوو باپیرانە سەرچاوە دەگرێ"[٤٧]. ناسیۆنالیزمی بایۆسیاسی bio-political لەپووژ لەناو چەمکی "نەتەوە ـــ خێزان" رەگی داکوتاوە کە لەناو نەوەکانی رابوردوودا خۆی دەدۆزێتەوە. بەم بۆنەیەوە لەپووژ دەڵێ "نەتەوە(. . .)

خێزانێکی گەورەیە کەسنوری خۆی هەیە. زیندەوەرەکان هاوکارن لەگەڵ مردوەکان‌و لەگەڵ ئەوانەی کە لەپاشەڕۆژدا دێن". " نەتەوە پێکهاتوە لەخێزان، بەتەواوەتی پێکهاتوە لەچەند خێزانێکی هاوپەیمان، نەتەوە بریتییە لەکۆیەکی بایۆلۆژی، لەشتێکی مەتێریال، نەك لە "خۆگێلکردنێکی" دادوەری"(٤٨).

لەپووژ هەوڵ دەدات " کەراکتەری ڕاستەقینەی نەتەوە" لەناو "واقعێکی بایۆلۆژی" پیشان بدات (٤٩). نەتەوە وەکو کۆمەڵگەیەکی خوێن لەسەر مۆدێلی خێزانێکی گەورە پێشکەش دەکرێت‌و کۆی ئەو کەسانەی کە لەڕەگەزی جیاواز جیاوازەوە دێن‌و یەکتریان گرتوە لەرێگەی پەیوەندیە ئالۆزەکانی خێزانەوە لەلایەن باووباپیرەوە دەبێ کاریان تێ بکرێ. لەبەر ئەوە نەتەوە زیندەوەری ئەمڕۆو مردووی دوێنێ‌و ئەوەی پاشەڕۆژی کۆتایی سەدەکان دەگرێتەوە چونکە نەتەوە ویستی "هەمیشەیی‌و گەردونیی" هەیە، واتا تەنها ئەوەی کە توانای مانەوەی هەیە بۆ بەرەوامی پێدانی باوو باپیران"(٥٠). بەلای لەپووژەوە "بۆگەنکردنی" نەتەوە وەك کۆمەڵگەیەکی با یۆ مێژوویی لەئەنجامی تێکەڵبوون‌و بەیەکداچوونی نێوان ڕەگەزەکانەوە پەیدا دەبێت. "خۆکوشتن"و خوڵەناوبردنی نەتەوە لەئەنجامی "زاووزێبونی" بێگانەکانەوە دێت کە تێکەڵ بەدانیشتوانی ئۆتۆکتۆن(دانیشتوانی ڕەسەنی خاك) دەبن‌و وەك ئەنجام دەبنە هۆی" تەشەنەسەندنی ئێلیمێنتی دیسژێنیك dysgenic (یان کاکۆژێنیك cacogenic) لەناو دانیشتوانی خاوەن ڕەگەزی ڕەسەن"(٥١). لەم تێڕوانینە ڕەگەز پەرستیەوە، لەپووژ دەگاتە ئەوەی پێناسەی تاك بکات: "لە ڕێگەی بڕیاری سیاسیەوە مرۆڤ نابێ بەئەندامی خێزانێك یاخود نەتەوەیەك(. . .). تاك لەلایەن ڕەگەزەوە پاڵ پشتی لێدەکرێ. خۆی بەتەنها هیچ نرخێکی نییە. ڕەگەزو نەتەوە هەموو شتێکن". نەتەوە تەنها ڕاستی کۆمەڵایەتیەو تاك هیچ نییەو تەنها شتێکی ئەبستراکتە abstract ، تەنها "خۆگێلکردنە"(٥٢). نەتەوە سنوور بۆ ڕەسەنیی پەیوەندیەکانی نێوان تاکەکان دادەنێ، نەتەوە وێنەی ڕاستەقینەی تاك پێکدێنێ.

لەساڵی ١٩٤٠ میشێل عەفلەق ڕەخنە لەهەموو پێناسەیەکی تیـۆری ناسـیۆنالیزم دەگرێو هێرش دەباتە سەر ئەوانـەی هـەوڵدەدەن ناسـیۆنالیزم "بەڕۆشـنبیری" بکـەن. لەهـەوڵ دانیـدا بـۆ وەڵامدانـەوەی هـەموو دەستپێشـخەریەك بـۆ پێناسـەکردنێکی ڕۆشنبیریانەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی میشێل عەفلەق دەڵـێ: "دەترسـم ناسـیۆنالیزم لای ئێمە هێندە کەم بکرێتەوە بۆ زانیاریـەکی ئـاوەزی (ڕۆشـنبیری) و لێکۆڵینـەوەی ووشەیی‌و بەم شێوەیە هێزی دەمارو وگەرمایی سـۆز وون بکـات(. . .). لـەوە دەکـات (گـەنج‌و خوێندکـار) باوەڕیـان بەبەسـتنەوە بەناسـیۆنالیزمەوە لەڕێگـەی ڕادەی پێناسەکردنیان بۆ ڕاستی یان هێزی ئەم پێناسەکرنەوە بێت هەرچەندە باوەڕ دەبێ پێش هەموو زانیاریەك بێت‌و گاڵتە بەهـەموو پێناسـەکردنێك بکـات. بـەڵام ئـەوە ( واتـا ناسیۆنالیزمـە ) کە ڕێگە ڕوونـاك دەکاتـەوە بـۆ زانیـاری(. . .). ئـەو ناسـیۆنالیزمەی کەبانگەشەی بۆ دەکەین پێش هەموو شتێك بریتیە لەخۆشەویستی، بریتییە لەهەمان سۆز کەتاك بەخێزانەکەیەوە دەبەستێتەوە (. . .). هەر چۆن کەخۆشەویستی بوونی نییە ئەگەر نەبەسترێتەوە بەخۆبەخت کردن، بەم شێوەیەش ناسیۆنالیزم (بوونی نییە ئەگـەر نەبەسترێتەوە بە خۆ بەخت کردن). . . ئەوەی کەشتێکی خۆش دەوێ گوێ ناداتـە هـۆی خۆشەویستیەکەی‌و ئەگەر پرسیاریش بکـات ( سـەبارەت بـەم خۆشەویسـتیە ) ، هیـچ هۆیەکی ڕوون نادۆزێتەوە. ئەوەی کەتوانای خۆشەویستی نییە بەبێ هۆیـەکی ئاشـکرا، واتای ئەوەیە کەخۆشەویستیەکەی نەماوەو تەواوبوەو مردوە"[٥٣].

ئەم دیـدو بۆچونانـەش زۆر نزیکـن لەوانـەی فیختـە سـەبارەت بەناسـیۆنالیزم. زۆر بەدڵنیایی فیختە ئەو کەسە بوو کەکاتێك خۆشەویستی بۆ ناسیۆنالیزم پێناسە کـرد وەك ڕێگەیەك بۆ هاندانی ئەڵمانیەکان بۆ خەبات دژی بێگانە، گۆڕەپـانی فەلسـەفەی بەجێ هێشت لەپێناوی چونەناو شانۆی سیاسی پوختەوە. بەلای فیختـەوە ناسـیۆنالیزم تەنها ڕێگە بوو بۆ ژیاننەوەی یەکێتی پاش چەند سـەدەیەك لەناخۆشـی‌و ئەشـکەنجەو پارچە پارچە بوونی سیاسی. لەپێناوی دروستکردنی "ویستێکی چاك‌وچەسـپاو و بـە بەرهەم" و مسۆگەر کردنی "بـەردەوامیی نەتـەوەی ئـەڵمان" لـەناو ئەڵمانیـەکاندا،

فیختە ئەوەی پێشنیاز دەکرد کەخۆپەرستی ناسیۆنال‌و خۆشەویستی ناسیۆنال جێی خۆپەرستی‌و خۆشەویستی تاك بگرنەوە. "پێوسیتە کە دڵی هەموو ئەوانەی کە هاوبەشن لەرەگەزی ئێمە، خۆشەویستیەکی دیکە کە ڕاستەوخۆ بەسراوەتەوە بەباشیەوە جێی ئەو خۆپەرستیە بێ کەڵکە بگرێتەوە"(٥٤). بۆ ئەوەی ئەم خۆشەویستیە بتوانێ خانە ناوەکیەکانی تاکی ئەڵمانی بلەرزێنێتەوەو زاووزێ بکات تابگاتە ناو "ناخی بوونیەوە"، دەبێ هەموو هێزەکانی بشەکێنەوە. نیشتمانپەروەری بریتیە لەخۆشەویستی تاك بۆ نەتەوەی خۆی(٥٥). تاك خۆی لەخۆیدا دەبێ بەنەتەوەو کەسایەتیە ئەبەدیەکەی دەرجەکەوێ کاتێك " ئەو پەیوەندیە بە شێوەیەکی تەواو لە گەڵ نەتەوەدا دەچەسپێ ". نەمری نەتەوە لەپراکتیکدا لەئەنجامی خودایی ئەم پەیوەندیە سۆزدارەوە دێت. هەر خۆشەویستی نیشتمانە کە تاك دەکات بەئەندامێکی "چالاك‌و کاریگەر" کە توانای خۆبەخت کردنی لەپێناوی گەلەکەی هەبێت "(٥٦). بۆ ئەوەی نەتەوەکەی ڕزگار بکات، تاکی ئەڵمانی دەبێ ئامادەیی خۆی دەربڕێ بۆ مردن لەپێناوی ئەوەی کە نەتەوەکەی بژی‌و خۆشی بەردەوامی بدات بەو بوونەی کەتەنها ئاواتی بووە(٥٧). ئەگەر نا، چ شتێك پاڵ بەئەڵمانیەوە دەنێ خەباتی بێهاوتا بکات‌و سەرکەوێت بەسەر "هێزی بەرگریکردن"؟ وەڵام: باوەڕهێنان بەو"ئێلێمێنتە ئەبەدیە" کەبریتییە لەنیشتمانپەروەری. باوەڕ (ایمان)، لە مێژووی میللەتی ئەڵماندا، ئەو شتە گرنگە بوو کە توانی بچێتە "ناو ناخی گیانی" ئەڵمانیەکانەوەو بوە "تەنها بنچینەی ئومێدیان بۆ بەدیهێنانی کامەرانیەکی ئەبەدی"(٥٨).

## ناسیۆنالیزم و "چارەسەری چوار کوچکەیی" عەفلەقی

ناسیۆنالیزم باوەرهێنان‌و خۆشەویستیە پێش هەموو شتێك. لەپشت ئەم تێڕوانینەوە دەتوانرێ تێبینی چ شتێك بکرێ ؟ کە دەوترێ ناسیۆنالیزم باوەرهێنانە، واتای ئەوەیە کە ناسیۆنالیزم بەرز دەکەینەوە بۆ سەر ئاستی ئاین‌و دوایی دایدەنێین بەپرینسیپێکی مەزن کە پێویستە کۆمەڵگەی نەتەوایەتی متمانەیەکی تەواو بێ مەرج‌و بێ هاوتای

پێ هەبێت. بۆچی؟ چونکە باوەڕهێنان لەجەوهەریدا فۆرمێکە لەزانیاری کە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ لەڕێگەی کۆنترۆلی ئەزمونیەوە یان لەڕێگەی ئاڕاستەو چوارچێوەی لۆژیکیەوە مسۆگەر بکرێ. باوەڕهێنان کە بێ مەرجانە ملکەچی دەکات بۆ پێشبینیکردنی خۆیی زۆر دوورە لەوەی کەپێناسە بکرێت لەڕێگەی پرینسیپی دەمەتەقێو سەلماندنەوە. لەم بارەیەوە میشێل عەفلەق مامەڵە لەگەڵ باوەڕی ناسیۆنالیستی وەك باوەڕی ئاینی دەکات، واتا باوەڕی ناسیۆنالیستی دەخاتە شوێنی باوەڕی ئاینی. بەلای ئەوەوە، ناسیۆنالیزم هەستێکە کە لەڕێگەی باوەڕەوە نەبێت بەهیچ شتێکی دیکە تەئکیدی لێ ناکرێ. بەهای باوەڕهێنان دەگەڕێتەوە بۆ فۆرمو یاسای هەڵسوکەوت کە لەلایەن هێزی مێتافیزیکەوە پێناسە دەکرێنو سنوریان بۆ دادەنرێتو لەڕێگەی ئەم هێزانەشەوە کۆمەڵگەی نەتەوایەتی بوونی زامن دەکرێ. "تەواویی" و یەکێتی ئەندامان لەلایەن ناسیۆنالیزمو داخوازیو پێشنیازەکانیەوە سنوریان بۆ دادەنرێ، چونکە کاتێك کە باوەڕ ناسیۆنالیزم دەخاتە باوەشی خۆی، بەهای خۆبەستن بەنەتەوەوە زیاد دەکاتو خۆبەخت کردن دەبێ بەئیمپێرەتیڤێکی ئەخلاقی. لێرەوە، پەسەند کردنی بێ مەرجانەی باوەڕی خودایی بەکۆی ناسیۆنال لەڕێگەی نەبونی زانینو حوکمی لۆژیکەوە دەبینرێ. کۆمەڵگەی ناسیۆنال دەبێ خۆی لەسەر بناغەی بۆچونێك ڕێکبخات کەزانینو لێکۆڵینەوەی لۆژیکی نەتوانێ پاساوی بکات. میشێل عەفلەق دەڵێ "بنچینەی نەمری کارەکانمان کەناگۆڕێو هیچ شتێك جێی ناگرێتەوە بریتیە لەباوەڕو گەشبینیش شێوەیەکی ساکارە لەدەرکەوتەکانی باوەڕ"[٥٩].

ئەوەی کە سەرنج ڕاکێشە، سەرجەم ناسیۆنالیزمە تۆتالیتاریەکان لەسەر بناغەی ئەم تێڕوانینە فەلسەفیە خۆیان ڕێکدەخەن. بۆ چی؟ چونکە بەلای ئەوانەوە پیرۆزیی خەبات دەبێ لەباوەڕهێنانەوە هەڵبقوڵێ. چونکە ئەمە پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێ کە بەلێبوردەییەوە کاربکاتو ملکەچی بکات بۆ بیری ناسیۆنال لەچوارچێوەی ئەوەی کەئەوان لەم بارەیەوە دەیانەوێ. میشێل عەفلەق هەر وەکو هیتلەرو مۆسۆلینی دەیەوێ کۆمەڵ بۆ "کۆمەڵگەیەکی سیاسی بنچینەیی باوەڕ" بگۆڕێ. بەم شێوەیە نەتەوە

دەبێت بەکەتێگۆریەکی ئاینیی کە دەیەوێ هاوولاَتی بخاتە سەر هەموو ئیعتبـــاراتێکی تایبەتی لەپێناوی خزمەتی ئیدیێالی ناسیۆنال. بـــۆ نمونـــە، موسـۆلینی بـاوەڕ هێنـــان بەبناغەی کۆمەڵ دادەنێ کەتاك دەتوانێ لەرێگەیەوە گوزارشت لەرەفتارو بیّ هەســـتی بەرامبەر بەئازار بکات. "ئەگەر فاشیزم بریتی نەبێ لەباوەڕ، چۆن دەتوانێ ستۆیسیزم stoicism* و غـیرەت بـدات بەئـەندامانی"(٦٠). بـەلای فاشـیزمەوە، کۆمـــەڵ وەك رێکخراوێکی رۆحی دەبێ لەکۆمەڵگایەکی سۆسیۆسیاسی پێکبێت کـە ئەندامــەکانی لەپەیوەندیەکی تەسکدا بن لەگەڵ یاسای مەزن کە بریتییە لەگوزارشتی کۆمەڵگــەی باوەڕهێنـــان. هیتلـــەریش چـــەمکی "ڤۆلکیـــش" پێناســـە دەکـــات لەرێگـــــەی جیهانبینییێکەوە (weltanschaunng) کە بنچینەکـەی بـاوەڕە. "کۆمــەڵگای کـردەوەو خەبات"، وەکو دەیگوت، دەبوایە رەگی لەناو تـێڕوانینێکی قوڵـی ئـاینیی داکوتایـە. ئیدێیـالی ناسـیۆنالیزم نـەیدەتوانی دەرکـەوێت (بـەدی بێـــت) ئەگـــەر لەرێگـــەی کۆمەڵگەیەکی سیاسی باوەڕهێنان نەبوایە. "باوەڕ یارمـــەتی مـرۆڤ دەدات کـە بـەرز بێتەوە بۆ سەرووی ئاستی ژیانی ئاژەڵیی‌و لەهەمان کاتدا هاوبەشی دەکات لە بـــەهێز کردنی‌و مسۆگەر کردنی بوونی"(٦١). "نەمریی گیانی ئەڵمانی، ژیانی ئەبەدی ، بوونی مرۆڤی مەزن"، ئەمانە هەموی ووشەن‌و هیچ واتایەکی ڕاستەقینە نابەخشن‌و نـاتوانن کــار بکەنــە ســـەر ئـــادەمیزاد ئەگـــەر هـــێزو گـــوڕی خۆیـــان لـــە "بـــاوەڕێکی ئەپۆدیکتیك"(apodicticus ) وەرنەگرن، واتا ئەگـەر هـێزو گـوڕی خۆیـان سـەرچاوە نەگرن لە باوەڕێك کـە پێویسـتی بـە سـەلماندن نییـە چونکـە بـێ مەرجانـە راسـتە. "باوەڕهێنان ئامرازێکە هەموو کەلێنێك پڕ دەکاتەوەو ڕێگە پاك دەکاتەوە بۆ ناســینی چەمکە ئاینیە بنەڕەتیەکان"(٦٢). دەبێ ئامرازی خەبات مسۆگەر بکرێ بۆ کۆمەڵگای نەتەوایەتی بەشێوەیەك کە بتوانێ تاکەکان ڕۆحانیانـــە کۆبکاتـەوە "لـە نـاو هـەمان ئیعتقاد وهەمان ویست"(٦٣). ئەگەر وا نەبێ بەهای پراکتیکی زانست یان زانیاری یان

---

* عەقیدەیەکی کۆنی فەیلەسوفەکانە کە دەڵێ بەختەوەری لەفەزیلەوە هەڵدەقوڵێ. بەلاَم مۆسولینی ئەم ووشەیە بەواتای پاڵەوانێتی بەکاردێنێ.

سیستێمێکی فەلسەفی هیچ کەڵکێکی بۆ ژیانی میللەتێك نییە و دەبێ بەدۆگمێکی بێ کاریگەر. ئەو کێشە سەرەکیەی کە ناسیۆنال سۆسیالیزم دەبێ بەرنگاری بێتەوەو چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە بریتیە لە "گۆڕانی سیستێمێکی فەلسەفی ڕاستەقینە لەسەر ئاستی نمونەیی بۆ کۆمەڵگەیەکی باوەڕو خەبات کە بەتەواوی سنوری بۆ دانرابێ، کە بەشێوەیەکی رەق ڕێکخرابێ، کەجوڵێنەری تەنها یەك ئیعتقاد بێت"[٦٤].

با نەختێکی دیکەش لایەنەکەی تری تێڕوانینو جیهانبینی عەفلەقی شیبکەینەوە. ناسیۆنالیزم خۆشەویستەو هەوڵدان بۆ "بەرۆشنبیری کردنی" ئەوە دەگەیەنێ کە بیکەین بەشتێکی ئەبستراکتو دوایش "دەماری ژیاوی لابەرین"و وای لێ بکەین تینو گوڕی سۆزی نەبێت. ئەمە واتای ئەوە دەگەیێنێ کە ناسیۆنالیزم دەبێ هێزی خۆی لەسۆزو هەستی کوێرانە، لەگوڕێکی ناوخۆیی کەڕەگی داکوتیوە لەناو قولایی نالۆژیکدا وەرگرێت. کەواتە میشیل عەفلەق تیۆری ناسیۆنالیزم لەسەر بنچینەی ئەو هێزو غەریزیە میکانیکیە بنیاد دەنێ کە مرۆڤ دەبزوێنێ تا ناو هەناوی گشت ڕۆحی. هەر وەك ئیمانویل کانت Emanuel Kant دەیگوت، سۆز یان حالەتی عاتیفی قووڵ هەستێکە "ناهێڵێ مرۆڤ بگاتە بیرکردنەوە" و فرێی دەداتە ناو جەرگەی بیرنەکردنەوە[٦٥]. ئەم بۆچونەی ئیمانوێل کانت کە لەبواری فەلسەفەی تێڕاماندا (تأملی) واتای قوڵی خۆی هەیە، لێرەدا پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی نییە بەئامانجی بابەتەکەمان، بەڵام بیری سیاسی عەفلەقمان زیاتر بۆ ڕوون دەکاتەوە. ئەگەر لەم بارەیەوە چاوێك بخشینین بەتێڕوانینی میشێل عەفلەق، دەبینین کە کاتێك ئاگری سۆز خۆشەوە دەکات، عەفلەق دەیەوێ بنچینەی بەکۆمەڵایەتی بوون بگۆڕێو بیکات بەحالەتێکی عاتیفی بەهێزی خاوەن وەزیفەیەکی مۆراڵیی. بەدورخستنەوەی ناسیۆنالیزم لەزانیاری لۆژیکی، عەفلەق هەستو سۆز دەگۆڕێ بۆ ئامرازێکی بەهێزو دوایی دەیکات بەحەزو ئارەزویەکی مەکیەڤێللیانە کە لەکاتی گەیشتنی بۆناخی قەوارەی نالۆژیکدا، جۆشی فەزیلەی پاڵەوانیەتیو شۆڕشگێڕی هێرشبەر لەناو دڵی جەماوەر دەبزوێنێ. لەسەر بناغەی ووزەی جووڵانەوەی بێ سنوور، بەعس دەیەوێ پاڵ

بەتاکەوە بنێ تا کار بکات بۆ دروستکردنی نەخشەی کۆمەڵی نەتەوایەتی. لەرێگـەی ئەم هێزە جوولێنەرەوە عەفلەق دەیـەوێ گیـانی میللـەتی عـەرەب بلەرزێنێتـەوەو بـیر کردنەوەی لۆژیکی تیایدا بکوژێ بۆ ئەوەی فڕێی بداتە نـاو باوەشـی هـێزی کوێرانـەی نالۆژیك. هیتلەریش هەروەها بەردی بناغەی عەقیدەی ناسـیۆنال سۆسـیالیزمی دانـا لەسەر بنچینەی "سۆزو هەستو ئەوینی (نۆستالژیای) بەجۆش نەك لەسـەر بناغـەی پانۆراما رۆشنبیریەکان"[٦٦]. ناسـیۆنالیزمە ڕۆحیەکـەی هیتلـەر دەبوایـە دوور بوایـە لەهەموو "ڕێکخستنێکی تیۆری" بۆ ئەوەی بتوانێ کاربکاتە سەر "فراوانترین هـێزی ڕا کیشان"[٦٧]، ( واتا ئەو هێزەی کە توانای راکێشانی خەڵکی هەیە بۆ ناو ڕێکخراوی ناسیۆنال سۆسیالیزم) و لە ناو قوڵایی مرۆڤدا حەزو ویست بـۆ توندوتیـژی ببزوێنـێ. ناسیۆنالیزمە سۆزدارەکەی نازیەت دەبوایە خزمەتی لەدایك بوونی" ڕۆحی نەتەوایەتی بەتەواوی هاوجۆر(هۆمۆجین)" بکردایە. دەبوایە خزمەتی ئەوەی بکردایـە کـە بەچـەك ئەو ڕۆحە ئامادە بکرایە بۆ بەدیهێانی سەرکەوتنی بـیری رەگەزپەرسـتیو راگـەیاندنی "جەنگ دژی پەیڕەوی چەسپیو"[٦٨]. ئۆتۆ شتراسەر Otto Strasser هێرشی دەبردە سەر مارکسیەکان کە بەڕای ئەو، دەیانویست جەماوەر لەرێگەی دەمەتەقێو باسـی تیـۆری بێ کەڵك لەسەر ئاسـتی پراکتیـك بخلیسـکێننە نـاو باوەشـی خۆیـان. بـەلای ئـەوەوە مارکسیەکان تێ نەدەگەیشتن کە تەنها تـەوژمو هـێزی ڕۆح دەیتوانـی هـەموو شـتێك بجولێنێتەوە. بەم بۆنەیەوە دەیگوت: "ئێوەی مارکسی بە بەردەوامی بانگەشە دەکەن بۆ عەقیدەی کارل مارکس(. . .). ئەی کوا ڕاستی ئـەو ڕووداوانـە کـەپاش هەشـتا سـاڵ لەسەر ئاستی پراکتیك شۆرشی کۆمەڵایەتی دەسـەلمێنن ؟ ئێـوە هەڵەیـەکی بنـەڕەتی دەکەن کاتێك نکوڵی لەگیانو ڕۆح دەکەن، کاتێك ئەوە پشت گوێ دەخـەن واتێناگـەن کە ئەمانەن هەموو شتێك دەبزوێنین"[٦٩].

بەم شێوەیەش ، ناسیۆنالیزمی بەعسی عەفلەقی بانگەشە بۆ تەوژمو هـێزی ڕۆحـی عەرەبی دەکات. بەلای عەفلەقەوە هەژاریی پێش هەموو شـتێك بریتییـە لەهـەژاریی ڕۆح، واتا هەژاریی ڕۆح پێش هەژاری کۆمەڵە. لەبەر ئەوە دەبێ کاربکرێتە سەر هـێزی

سۆز کەلەپشت ڕۆحی نەتەوایــەتی لــەدۆخێکی شــاراوە مــاوەتــەوە. هیــچ قەوارەیــەکی چوارچێوەدانەری ئایدیۆلۆژی دیکە بەو شێوە ڕاستەوخۆیەو بــەو شــێوە گــورج وگولێــە ناتوانێ وەك هێزی سۆزداری ناسـیۆنالیزمی "بــاوو باپــیرەیی ڕۆحــی" بچێتــە نــاخی هوشیاری سیاسیەوە. میشیل عەفلەق زۆر هوشیارەو دەزانــێ کەئایدیۆلۆژیایــەك هیــچ سەرکەوتنێکی بەو شێوەیەی کە بەعسی گشتگر دەیــەوێ بــەدی ناهێنــێ ئەگــەر ڕوو نەکاتە حاڵەتی جۆش‌و هەستی کۆمەڵ. بۆ بەعس‌و عەفلەق ئەوە گرنگە کە بەرنامەی ئامانجەکەی بەدیبێنێ: خولْقاندنی کۆمـەڵی بەعسی. بەناوی ئەم ئامانجەیە کەعەفلەق هــێرش دەباتــە ســەر لێکۆڵینــەوەو ووردبوونــەوەی ڕۆشــنبیری لەســەر ناســیۆنالیزم. هیتلەریش بەهەمان شێوە دەیگوت: " تەکتیکی باش لەبواری سایکۆلۆژی جەماوەردا بریتییە لەدورکەوتنەوە لەهەموو شیکردنەوەیەك کە ئامانجی سەلماندنی ڕاستی شــتێك بێت‌و پێویستە تەنها ئامانجی کۆتایی گەورە بــاس بکــرێ"(٧٠). پــڕ کردنــی مێشــکی جەماوەر بەشیکردنەوەی بابەتیی‌و لەرێگەی ئانالۆژی analogy ( لەیەکچوون لــەنێوان دوو بابەت لەناوەڕۆك جیاواز) دوورودرێژ دەبێتە هۆی نەمانی ئەوەی کەئێمیل دورکــایم Emile Durkheimپێــی دەڵــێ "دۆخــە بــــەهێزەکان‌و دیاریکراوەکــانی هوشــیاری کۆیی"(٧١). لەپێناوی گەیشتنە "ئامــانجی کۆتــایی گــەورە" پێویستە بــیر بکرێتــەوە لەیەکگرتن‌و ئامادەکردنی تەواوی ئەو ووزە پێکهێنەرانەی کــە ڕێگــە خۆشــدەکەن بــۆ بەرزکردنەوەی شەرەفی ڕۆحی عەرەبی( بەلای عەفلەقــەوە)و ڕۆحــی جــەرمانی (بــەلای هیتلەرەوە). بەڵام ئەمە ناکرێ ئەگەر لە ڕێگـــەی ئــەوە نــەبێت کــە پســپۆڕی مێــژوی نازیەت، مارتین برۆزات Martin Broszat پێــی دەڵــێ زیندوکردنــەوەو "بەســەرەتایی کردنی primitivization هوشیاری کۆیی‌و ووزە نەتەوایەتیەکان" (٧٢).

شایستەی وەبیرخستنەوەیە کە بەئاینکردن ( ئایناندن)و خودایی‌کردنی ناسـیۆنالیزم‌و ڕەفز کردنی هەموو جۆرە بیر کردنەوەو بەڕۆشنبیری کردنــی، ناسـیۆنالیزم دەچێتــە نــاو بواری ئەفسانەوە. چونکە ئەگەر بمانــەوێ تێرمینۆلۆژیــەکی ئیفلاتونــی بــەکار بێنــین دەتوانین بڵێین کە ئەفسانە بریتیە لەگێڕانەوەیەك کە پــەیوەندی بەخوداکانــەوە هەیــە،

پەیوەندی بەزیندەوەری خوایی‌و پاڵەوانەکانەوە هەیە. ئەفسانە هیچ پێویست بەسەلماندن یان شیکردنەوەی لۆژیکی ناکات. هەر بەڕاستی لەڕێگەی ئەفسانەوە عەفلەق دەیەوێ واتایەك بەژیانی عەرەب ببەخشێ. "ئەفسانە، جۆرج سۆرێل Georges Sorel ، دەیگوت بەدرۆ ناخرێتەوە، چونکە لەبنەڕەتدا جووتە لەگەڵ بیرو باوەڕی گروپداو گوزارشت لەجولانەوەی ئەم بیرو باوەڕە دەکات. لەبەئەوە شیتەڵ ناکرێتەوەو بەشەکانی یەکەیەك پێکدێنین بەشێوەیەك کەناتوانن بەکار بهێنرێن لەسەر ئاستی گێرانەوەی مێژوویی"[٧٣]. بەلای سۆرێلەوە "خەڵکی کە هاوبەشی دەکەن لەبزووتنەوە کۆمەلایەتیە بایەغدارەکان، کردەوەکانیان بەگوێرەی ئەفسانە دەڕەخسێنن‌و ئەو ئەفسانەیە هاندەرێکە بۆ ئازایەتی‌و پاڵەوانێتیان بۆ مسۆگەر دەکات"[٧٤]. ئەفسانە وەك "چەند وێنایەك (تصور) وایە کە دەجولێتەوەو بەشەکانی بەیەکەوە بەسراونەتەوە" و ڕۆڵی "جولانەوەی خولقێنەر" دەبینێ‌و مرۆڤ دەبزوێنێ[٧٥]. لە بەر ئەوە پێویستە ناسیۆنالیزم وەك ئەفسانەیەك پێشکەش بکرێ. ئەگەر بەهۆی زانیاری ڕۆشنبیری‌و شیتەڵکردنەوەی ووشەیی ناسیۆنالیزم بخنکێنرێ، ئەوسا هێزی ئەفسانەی بەعسی دەفەوتێ. پێویستە پارێزگاری ئەم ئەفسانەیە بکرێ چونکە بەوون بوونی، هێزی ئەو بزووتنەوەیە دەفەوتێ کەخۆراك بەئایدیۆلۆژیای بەعسی عەفلەقی دەبەخشێ. لەڕاستیدا ئەم ئەفسانە ناسیۆنالیستەیە کە بەهایەکی مۆراڵا دەبەخشێ بە شۆڕشی بەعسی‌و هەروەها ئەم ئەفسانە شۆڕشگێڕانە بوو ( توندو تیژی) کە سۆرێل دەیویست بیکات بەجولێنەری "شۆڕشی ڕەها". سۆرێل دەیگوت: "دەتوانین بە بەردەوام باسی ڕاپەڕین بکەین، بەلام ئەگەر ئەفسانەیەك نەبێ کە لەلایەن جەماوەرەوە پەسەند بکرێ، ئەم ڕاپەڕینە نابێتە هۆی بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە"[٧٦]. ئەفسانە "ڕێگە پاك دەکاتەوە بۆ تێگەیشتنی چالاکی‌و هەست‌و بیری جەماوەری گەل‌و خۆی بۆ خەباتێکی بڕیاردەر ئامادە دەکات. ئەفسانە بریتیی نییە لەوەسفکردنی شت، بەڵکو گوزارشت لە ویست دەکات"[٧٧].

ئەو ناسیۆنالیزمە سۆزداریەی کــە میشــێل عەفلــەق پێشــنیازی دەکـات و دەچێتــە سەرووی هەمـوو بۆچونێکی لۆژیکی، سروشتی خۆی دەگۆڕێ و دەبێ بــەجۆرێك لــەئاین: هەموو ڕەخنەیەك، هــەموو بەدرۆخســتنەوەیەك، هــەموو شــیکردنەوەیەکی بابــەتیی، هەموو دەمەتەقێیەکی مەعریفی، بەوشەیەك هەموو زانستێك کەسەرقاڵی باسـکردنی بێت، دەبێ بەکفرێك دژی دۆگمی ئاینی بەعسی. ناسیۆنالیزمی ڕۆحی -باوو باپـیرەیی، بەهۆی ئەم هێزە میستیکیەوە پاساوی ڕەهای زەبرو زەنگ دەکات. سەدام حوسەین دەڵێ "مەرجی بەردەوام" کە شۆڕشگێڕ پێویستە لەکاتی خەباتدا پێوەیەوە پابەند بێ بریتیە لــە "هێرشــبردن و بەرنگاربونــەوە"[78]. ئــا بــەم شــێوەیەیە کــە ناســیۆنالیزم وەك خۆشەویستی دەبێ "جۆشی خــەبات" فــراوان بکاتــەوە بــۆ ئــەوەی ئیدیێــالی بەعســی سەرکەوێت. بەعسیەك دەبێ "سروشتێکی دڕندانەو مردن بەخشــی هــەبێت بەرامبــەر ئەو کەسەی کە هاوبەشی بۆچوونەکانی ناکات. بێ کەڵکە تەنــها خــۆی ببەســتێنەوە بەخەبات دژی بیرو باوەڕی دوژمنەکانی بەبێ ئەوەی گوێ بداتە تاکەکە خــۆی چونکــە ئەو بیرو باوەڕەی کەخەبات دەکرێ دژی هەرلەخۆیەوە نایەتە کایەوە بەڵکو بەرجەســتەی ئەو تاکە دەکات و لەبەرئەوە دەبێ لەناو ببرێ بۆ ئەوەی بیرو باوەڕەکەش نــەمێنێ"[79]. هیتلەریش دەیگوت "کاتێك بیرکردنەوە (ئەقڵ) بێ دەنگ دەبێ، دوا بڕیار دەگەڕێتەوە بــۆ تونــدو تیــژی و هــێرش بــردن باشــترین چەکــە بــۆ بــەرگریکردن لــــەخۆ"[80]. چ لەیەکچوونێکی سەرسوڕ هێنەر! چ باوەڕێکی ڕەها بە خۆ! چ باوەڕێکی ڕەهــا بــە زەبــرو زەنگ!

لەم تێڕوانینەوە، دەبێ ناسیۆنالیزمی هێرشبەرو ناسیۆنالیزمی دژەکــردار( ردفعــل)، بتوانێ مرۆڤ بزوێنێ و بیجولێنێتەوەو ئامادەی بکات کە لەهــەموو کـاتێکدا هــێرش بەرێتە سەر ئەو کەسانەی کەدەبن بە ئاستەنگێك بۆ بەدیهێنانی بەهەشتی ناســیۆنال. کامەیە گەورەترین و بەکایگەرترین هێز کە دەتوانێ جەماوەر سەرخۆش بکات و گێــژی بکات؟ بێ گومان ئەفسانەی ناسیۆنالیزمی سۆزداریی. کەراکتــەری ئیبلیســیی ئــەم ناسیۆنالیزمە ویستێکی ڕەها دێنێتە کایەوە کە لە "خەباتی بێ ووچانیدا"، ئامادەیــە

لەهەموو چرکەیەکدا ئەوی تر لەناو بەریَ هەر لەبەر ئەوەی ئەوی تـرە: "کـێ لەگـەڵ ئێمە نییە دژی ئێمەیە"، "کێ لەگەڵ ئێمەیە، دەبێ باوەڕبێنێ بەو یاسا مەزنـەی کـە هەستی ناسیۆنالیزمی تیا دروست کردوین". ئەم تێڕوانینـە تیۆریـەی عەفلەقـە کـە لەعیراقی بەعسیدا، کە لەعیراقی سەدامدا جێبەجێ کرا: گـوێ بریـن‌و زمـان بڕیـن‌و کوشتن‌و بڕین‌و ئەنفال‌و هەڵەبجەو چەکی کیمیاوی‌و گـۆڕی بەکۆمـەڵ‌و وشـك کردنـی ئەهواری خواروی عێراق. . . هتد، ئەنجامی ئەم بیرو باوەڕەن.

نابێ لەیاد بکرێ کە پەیوەندیەکی دیالێکتیکی هەیە لەنێوان عەقیدەی فەلسـەفی‌و ڕەفتاری مرۆڤ، لەنێوان تیۆری‌و پراکتیکدا. کامیان سنوور دادەنێ بۆ ئـەوی تـر؟ ئایـا تێڕوانینی فەلسەفی سنوور بۆ ڕفتارو هەڵسوکەوت دادەنـێ یـان بەپێچەوانـەوە؟ ئایـا پێشینەییەکی تیۆری هەیـە کـە پاسـاو بدۆزێتـەوە بـۆ کردەوەیـەکی دیـاریکراو وەك ڕۆمانیەکان دەیانگوت: "post hoc, ergo propter hoc؟ ( پـاش ئەمـە، ئـەمجا بـۆ ئەمە، واتا: دوا بە دوا هاتنی هەندێ بارو دۆخ دادەنرێ بەهۆکار بۆ چەند ئەنجامێك؟).

میشێل عەفلەق دەیەوێ تێڕوانینێکی گشتگیر بسەپێنێ بەسەر کۆیەکی مرۆڤایەتی. دەیەوێ مۆدێلێکی ژیانی نەتەوەیی بسەپێنێ لەسـەر بناغـەی بـەرزڕاگرتنی قـەوارەی نالۆژیکی‌و توندو تیژی‌و خەبات‌و خۆبەخت کردن‌و پاڵەوانیەتی میتۆلۆژیەکی هاوچوو لەگەڵ ئەوەی ناسیۆنالیزمەکانی سەردەمی نێوان دوو جەنگ. زیاتر لەمەش، کامەیـە خەسلەتی سەرەکی تـێڕوانینی بـەعس‌و عەفلـەق؟ خـەبات‌و پاڵەوانیـەتی‌و خۆبـەخت کـردن، لـەپراکتیکدا، بەشـێکن نـەك تەنـها لـەتێرمنیۆلۆژی بـەعس‌و فاشـیزمی مێژوویی، بەڵکو پێکەوە هاوبەشیش دەکەن لەسەر ئاستی ئۆنتۆلـۆژی. خـەبات ، بـەو شێوەیەی کەدارێژراوەو داوا دەکرێ کەڕاپەڕێنرێ‌و پراکتیزە بکرێ لەلایـەن فەلسـەفەی بەعس‌و ئایدیۆلۆژیا تۆتالیتاریـەکان، دەبـێ گشـت قـەوارەی مـرۆڤ بگرێتـەوەو ببـێ بەئامرازو ئامانجی هەموو هاوولاتیان کە کۆی نەتەوایەتی دروست دەکەن. "خەبات بـۆ عەرەبێك تەنها ڕێگەیەك (شێوازێك) نییە، بەڵکو خۆی لەخۆیدا ئامانجێکیشـە"[٨١]، چونکە پاراستنی "حیزب و شۆڕش" بە سەروی هەموو شتێکەو لە ناو بردنـی ئـەوەی

رای له گەڵ ئـەو راسـتیه نییـه هاوبەشـه لـه گـەڵ خـودی شـێوازو ویسـتی حـیزبی شۆڕشگێڕ[٨٢]. هیتلەریش هەمان تیڕوانینی هەبوو. هیتلەریش چوارچێـوەی پـەیڕەوی ناسیۆنال سوسیالیزمی دادەنا وەك "ڕێکخراوێك لەخەباتدا". کاتێك کەدەیویست خەوی "ئەڵمانیای ئەبەدی"[٨٣] به دیبینێ، هیتلەر دەیویست سەردەمی " سڕی وبێ جـوڵان" بگۆڕێو بیکات به "سەردەمی خەبات"[٨٤]. "ئەوە بەس نییه قەناعەت بێنین بـەنزمی ئەم بارودۆخە بۆ ئەوەی قەناعەت بچەسپێنین". ئەم قەناعەتە" ڕەگی خۆی داناکوتـێ ئەگەر لەچوار چێوەی خەبات بۆ داهێنانی بـارو دۆخێکـی تـازە نـەبێ، خـەبات وەکـو ئەرکی بەرزی ژیان"[٨٥]. فاشیزمیش ژیانو ئامانجی ژیان وەك خـەبات دەبینـی، " وەك خەباتێکی بەردەوامو هەمیشەیی"[٨٦]، بۆ ئەوەی نەتەوە خۆی بـەدی بـهێنێ پێویسـتە ئەو ئیتلیمێنتانەی کەپێکی دێنێ تجاوزی یـەکتری بکـەن . بـەلام بـۆ گەیشـتنە ئـەم ئامانجە پێویستە هەموو شتێك بخەنە جولانەوە، چونکـە جولانـەوە هـێزی جولێنیـەری مێـژووە. ناسـیۆنالیزم "ژیلـە مـۆی" ئـەم جولانەوەیەیـە. ئەمەیـە واتـای خـەباتو بەرەنگاری کردنو پاڵەوانی لەلای هیتلەرو موسولینیو عەفلەق.

میشێل عەفلەق دەڵێ نەتەوە دەتوانێ خۆی بەدیبهێنێ، دەتوانێ ئاماجی خۆی بپێکێ له ڕێگەی بەرنگاربونەوەوە، بەتایبەتی کـاتێك ئـەم بەرنگاریـە کەراکتـەرێکی جـدی وەردەگرێتو هـەموو چرکەیـەك بەرامبـەر مـەرگ دەوەسـتیتەوە. بەرامبـەر مـەرگ، نائومێدیو ناچالاکی سەدەیی نامێننو جەهالەتو خۆپەرستی دەسڕێنەوە. ئەو پیـاوەی که بەرەنگاری مەرگ دەبێتەوە پیاوێکی ڕاستەقینەیە. ئەو پیاوەی که لەکاتی مردنیداو ئەو پیاوەی که ئامادەیە ژیانی خۆی بەخت بکات، هەست بەبێ کەڵکیی ئـەو هێزانـە دەکات که بـەندیان کـردوە (کـە بەسـتویانەتەوە[٨٧]. ژیـانی بەعسـیەك زۆر زیـاتر دەوڵەمەند دەبێو ویستەکەی بەهێزتر و فراوانتر دەبێ ئەگەر ئامادە بێت تەجاوزی خۆی بکات. مرۆڤی پاڵەوان ئەوکەسەیە کـە ووزەی ژینـداری لـێ دەڕژێـتو خـۆی بـەخت دەکات. بەرنگاری کردنو خەباتو پاڵەوانی، نـاتوانن ڕێگـەبدەن بـە" بـەدی هێنـانی ئامانجە بـەرزەکانو پێشـکەوتنێکی بـەواتا وشۆڕشـێکی بنـەڕەتی" ئەگـەر نرخێکـی

گـەورەیان نـەدرێنێ، واتـا ئەگـەر خۆبـەخت کردنێکـی گـەورەی تێـدا نـەبێ[٨٨].
خۆشەویستی بۆ نەتەوە بەوشێوەیەی کە بەعس‌و عەفلـەق باسـی لـێ دەکـەن، ئـەم خۆبەخت کردنەی دەوێ. ئەی چۆن مرۆڤی عەرەب دەتوانێ بەرنگاری چارەنوسی سەختی خۆی بێت‌و داخوازیە بەرزەکانی پاشەڕۆژ ( داهاتوو ) جێ بەجێ بکات ئەگەر لەپێناوی بەدی هێنانی ئەم ئامانجە مۆراڵیە بـۆ مـردن ئامـادە نـەبێت. موسـولینی دەیویسـت کۆمەڵی فاشیست بنیاد بنـێ، واتـا کۆمــەڵی فاشیسـت وەك کۆمەڵگەیـەکی ڕۆحـی لەسەر بناغەی خۆبەخت کردن." ژیانی مرۆڤێك بە نکـران زات‌و خـۆ بـەخت کردنـی بەرژەوەندی تایبەتی‌و هەروەها بەمردن، بوونێکی ڕۆحی تـەواو بـەدی دێـنێ‌و بـەهای پیاوی پێ دەبەخشرێ"[٨٩]. پێشەکەوتنی کۆمەڵ‌و گەشەپێدانی، نەی دەتوانی ئاشـتی‌و پێکـەوەژیانی ئاشـتیانەی میللـەتان‌و پـەیوەندی مەدەنیانـەو هاونیشـــتمانیانە بـــۆ کۆمـەڵگای نەتەوایەتی مسۆگەر بکات. ئەکتیڤیزم(activism )وخۆبەخت کـردن ئـەو گەرەنتییـەیان دەدا. هیتلـەریش کـاتێك دەیویسـت " ئـەڵمانیای گـەورە" بخولقێنـێ، مەرامی ئەوە بوو کە لە دڵی ئەم ئەڵمانیایە تـۆوی "یـەکێتی نـاوخۆیی ناسـیۆنالیزم بچێنێ چونکە، لەڕوانگەی ئەوەوە، تەنـها هـێز بـوو کـە دەی توانـی ئـادەمیزاد پـاڵ پێوەبنێ بۆ ئەوەی کۆتایی بەخۆی بێنێ." کێ میللەتی خۆی خۆش بوێ، بەوخۆبـەخت کردنـە نـەبێت کـە ئامادەیـە فـەرزی بکـات بەسـەر خۆیـدا، نـاتوانێ ئیسـپاتی خۆشەویستیتەکەی خۆی بکات"[٩٠] هیتلەر عەقیدەی ناسیۆنال سۆسیالیزمی لەسـەر بنچینەی خۆبەخت کردن‌و بەرەنگار بون و پاڵەوانی پێناسەدەکردو دەیگوت "ناسـیۆنال سۆسیالیزم عەقیدەی بەختەوەری‌و شانسی باش نییە، بەڵکو عەقیدەی ئیش‌و خەباتەو هەروەها عەقیدەی خۆبـەخت کردنـە"[٩١]." ئەفسـانەی پاڵـەوانێتی" کـەپێك هـاتبو لەخستنەکاری سیاسەتێکی دڕندانە، دەنگی لەناو ئەو بۆچونـە دەدایـەوە کـە جۆزێـف پیتــەر ســتێرن Joseph Peter Stern پێـی دەڵـی کۆنیشانــەی خۆبـــەخت کـردن"(sacrifice syndrom)(٩٢). بـاوەڕ هێنـان، خـەبات( بـەرنگاری کـــردن)، پاڵەوانی، خۆبەخت کردن: ئەمانــەن پێکهاتـەکانی ئـەو تێترافارمـەکۆزەی( عیلاجـی

چوارفاقه tetrapharmakos ) كـه ناسـيۆنال سۆسـياليزم‌و فاشـيزم‌و بـه‌عس داواى ده‌كه‌ن: هه‌موو ئه‌ندامانى كۆمه‌ڵگاى نه‌ته‌وايه‌تى ده‌بێ پشت گيريان بكه‌ن بـۆ ئـه‌وه‌ى بتوانن پسێكۆزى psychosis په‌يامى ناسيۆناليست بكه‌ن به‌پرينسيپى ئه‌به‌دى ژيـانى كۆمه‌ڵ. به‌و شێوه‌يه ئه‌ندامانى كۆمه‌ڵيان له سه‌ر بنچينه‌ى بينينـى حـيزبى گشـتگر وه‌ك ئاينێكى سياسى، له سه‌ر بنچينـه‌ى په‌رسـتنى حـيزبى گشـتگر پـه‌روه‌رده كـرد. به‌عسـيه‌كان ده‌يـانگوت: "بـاوه‌ڕم بـه بـه‌عس هێنـا وه‌ك خوايـه‌كى بـێ شـه‌ريك و عه‌ره‌بايـه‌تى (العروبـه) وه‌ك ئـاينێكى بـێ هاوتـا"، يـاخود " بـه‌عس ئاينمـه‌و عه‌ره‌بايه‌تيش ئاينزام"(٩٣).

